


# خولانەوە لە ناو بازنەدا

## دیوی ناوەوەی روداوەکانی کوردستانی عیراق ۱۹۸٤ ـ ۱۹۸۸

نەوشیروان مستەفا ئەمین

۱۹۹۹

## ناوه رۆک

### ی باسه کان



گفتوگۆی یه کێتی و به عس ... ٥ - ٨٤

٢. دیسانه وه شه ڕ ... ٨٥ - ١٠٠

٣. پێکهاتنی یه کێتی له گه ڵ ئێران ... ١٠١ - ١١٤

٤. ئاشتبونه وه ی یه کێتی و لایه نه کانی جود ... ١١٦ - ١١٨

٥. گه شتی ئه وروپا ... ١١٩ - ١٢٨

٦. ئه نفال : کۆتایی قۆناغێک ... ١٢٩ - ١٥٣

### پیرستی به لگه کان

١. دابه ش بونی ڕه گه زیی دانیشتوانی کرکوک
له ئاماده کردنی کاربه ده ستانی بریتانیا( ١٩٢٠ ) ... ١٥٥ - ١٥٦

٢. لیسته ی خاوه نیتی زه وی و زاری کرکوک
له ئاماده کردنی حنا بطاطو ... ١٥٧ - ١٥٨

٣. فه رمانی صه ددام حسێن ده رباره ی گفتوگۆی
یه کێتی و به عس ... ١٥٩

٤. وه لامنامه یه کی طارق عزیز ... ١٦٠

٥. پرۆژه کانی یه کێتی نیشتمانی بۆ گفتوگۆ
له گه ڵ به عس ... ١٦١ - ١٧٦

٦. تێبینیه کانی یه کێتی له سه ر په یمانی جوقت ... ١٧٧ - ١٨٢

٧. دوو وه لامنامه ی عیزه ت دوری ... ١٨٣ - ٢٠٠

٨. ڕێکه وتنامه ی جه لال تاله بانی و
ئیدریس بارزانی ... ٢٠١ - ٢٠٤

٩. دانانی علی حه سه ن مه جید به حاکمی کوردستان ... ٢٠٥ - ٢٠٦

١٠. دوو بریاری عه لی حه سه ن مه جید ده رباره ی
ره فتار له گه ڵ ناوچه کانی ده ره وه ی ده سه لاتی به عس ... ٢٠٧ - ٢١٠

١١. به یانی سه رکردایه تی هێزی چه کداره کانی
عیراق ده رباره ی ئه نجامدانی ئه نفالی ١ و ٢ ... ٢١١ - ٢١٣

١٢. چه ند به لگه و بریارێکی به عس ده رباره ی
هه لوێستیان له کوردستان ... ٢١٤ - ٢٢٨

بسەپێنێ.

پەندێکی کۆنی پێشینان کە لە چارەسەرکردنی ناکۆکی دا بە کاری ئەهێنن ئەڵێ: «سوار و پیادە کە ئەگەن بە یەک، ئەگەر بیانەوێ دەسمۆچێن بکەن، ئەبێ سوارەکە ئەختێ خۆی دانەوێنێ و پیادەکەش کەمێ خۆی هەڵبڕێ». پەندێکی تریش ئەڵێ: «نە شیش بسوتێ و، نە کەباب». ئەمانە نمونەن بۆ دۆزینەوەی چاری ناونجی.

لە کوردستانی عیراق چەندین جار و بە جۆری جیاواز گفتوگۆ کراوە:

1- گفتوگۆکانی شێخ مەحمود و نوێنەرەکانی لە گەڵ ئینگلیز، لە گەڵ تورکیای کەمالی، لە گەڵ حکومەتی تازە دامەزراوی عیراق.

2- گفتوگۆکانی ساڵی ١٩٣٠ ی سەرانی کورد لە گەڵ ئەمیر غازی وەلیعەهد و، دواتر لە گەڵ نوێنەری مەندوبی سامی بەریتانی و جێگری سەروەزیرانی عیراق، جەعفەر عەسکەری.

3- گفتوگۆکانی مەلا مستەفای بارزانی و نوێنەرەکانی لە گەڵ عیراق، بەریتانیا، ئێران، یەکێتی سۆڤیێت، ئیسرائیل، ئەمەریکا، میصر..

4- گفتوگۆکانی (پالی م س) لە گەڵ عیراق، ئێران، یەکێتی سۆڤیێت.

5- گفتوگۆکانی یەکێتی لە گەڵ بەعس، ئێران، سوریا، لیبیا..

بێگومان ئەمانە بە سەر یەکەوە تەجروبەیەکی زۆر و دەوڵەمەندە و، هەر کام لەم گفتوگۆیانە بگری گرنگی تایبەتی خۆی هەبوە و، کەم یا زۆر کاری لە ژیانی سیاسی کورد کردوە. بەڵام لە سەر هیچ کامێکیان لێکۆڵینەوە، یا باسی تایبەتی، تەنانەت بیرەوەری شەخسیی، ئەنوسراوە. بۆ یەکێ ئەگەر بیەوێ شتێ لە سەر ئەمانە بزانێ ئەبێ ناو دەیان کتێب، بە زمانی جیا جیا بگەڕێ، ئینجا شتێکی کەم و کورت و ناتەواوی لێ هەڵئەکرێنێ.

گفتوگۆ ئەگونجێ ڕاستەوخۆ لە نێوان لایەنە ناکۆکەکان دا، یا بە هۆی لایەنێکی سێیەمەوە دەس پێ بکا.

ئەگونجێ ڕاستەوخۆ بێ یا ناڕاستەوخۆ، ئاشکرا بێ یا نهێنیی، ڕو بە ڕو بێ یان بە ئاڵوگۆڕی قسە یا نامە بێ، کۆبونەوەکان لای لایەکی ناکۆکیەکە بکرێ یان لە شوێنێکی بێ لایەن..

گفتوگۆ ئەگونجێ چەند ڕۆژ، یا چەند مانگ، تەنانەت چەند ساڵ بخایەنێ، هەروەکو لەوانەیە بە چەند دانیشتنێ هەمو کێشەکان یەکلایی بکرێنەوە و، بگەنە لە یەک گەیشتن و ڕێککەوتن.

زۆر کات گفتوگۆی درێژ خایەن نهێنی لایەنی شۆڕشگێڕ
[illegible]
[illegible]
[illegible]

گفتوگۆی یەکێتی - بەعس لە ڕێگەی لایەنی سێیەم: (حدکا، بە تایبەتی د. قاسملو) دەستی پێ کرد. سەرەتا د. قاسملو ڕاسپاردە و قسەکانی سەرکردایەتی عیراقی و یەکێتی نەهێنا و نەبرد. ئینجا عیراق دو جار نوێنەری خۆی نارد: جاری یەکەم کۆبونەوە لە گۆڕەشێر لە لای حدکا بە ئامادە بونی لایەنی سێیەم کرا و، جاری دوەم کۆبونەوە لە ناوزەنگ لە بارەگای سەرکردایەتی یەکێتی، بێ ئامادە بونی لایەنی سێیەم، کرا.

دوای ئەمە بە ماوەیەک چەند نامەیەک ئالوگۆڕ کرا. نامەکان باسی گشتی و دیاری نەکراو بون. ئینجا فەرەیدون عەبدولقادر بۆ تاقی کردنەوەی دەمودوانی سەرکردایەتی بەعس چوە بەغداد. بەرزان تکریتی، کە ئەوسا سەرۆکی جیهازی موخابەرات و، طاریق عەزیز، کە ئەوسا وەزیری دەرەوەی عیراق بو، بینی.

مانگی تشرینی دوەمی ١٩٨٣ بڕیار درا گفتوگۆ دەس پێ بکرێ. لە بەر ئەوەی یەکێتی خۆی هیچ کەناڵێکی ڕاستەوخۆی پەیوەندی لە گەڵ عیراق نەبو، ئەم بڕیارە دیسان لە ڕێگەی لایەنی سێیەم (حدکا) بە عیراق ڕاگەیەنرا و، داوا لە د. قاسملو کرا ڕێوشوێنی چونی دەستەی نوێنەرایەتی یەکێتی بۆ بەغداد دابین بکا.

هەڕەشەکانی طاریق عەزیز

لەو کاتەوە کە جولانەوەکە دەستی پێ کردبوەوە، بەعس هیچ پرۆژەیەکی سیاسی نەبو بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد لە گەڵ یەکێتی یا هیچ لایەکی تر، بەڵکو ئەیویست بە ڕێگای زەبروزەنگ و سەرکوتکردن کۆتایی پێ بهێنێ. سەرکردایەتی بەعس لە سەرەتای هەشتاکانەوە بڕیاری دابو بۆ ئەوەی جولانەوەی کورد لە ناو ببات هەمو دێهاتەکانی کوردستان ویران بکات. دانیشتوانی لادێ ڕاگوێزێ بۆ ئۆردوگای کۆنترۆڵکراو. بەمەش پێشمەرگە لە خەلک دابڕێ و سەرچاوەی ژیانی جولانەوەکە وشک بکا. گەرم بونی مەیدانەکانی جەنگی ئێران مۆڵەتی نە ئەدان ئەم پلانە بە تەواوی جێبەجێ بکەن. بەلام لە هەر دێیەک دا شەڕ ببوایە. جەیش ئەو دێیەی ویران ئەکرد.

پێش ئەوەی شەڕ لە نێوان هێزەکانی یەکێتی و بەعس دا ڕابگیرێ و، گفتوگۆ دەس پێ بکا، فەرەیدون بە هۆی حدکاوە بۆ (استطلاع) ی بیروڕای کاربەدەستانی بەعس، چو بۆ بەغداد. لەوێ بەرزان تکریتی و طاریق عەزیزی دی بو. لە میانەی قسەکانی دا طاریق عەزیز وت بوی:

«ئێمە ناڕوخێین چونکە دنیا لە بەرامبەر ئێران دا پشتیوانیمان لێ ئەکا. ڕۆژێکیش دێ ئەم شەڕە تەواو ببێ. ئەگەر ئیستا بێن و لە گەلمان پێک بێن

چاکەیەکی گەورەمان لە گەڵ نەکەن هەرگیز لە بیرمان ناچێتەوە، خۆ ئەگەر شەڕ درێژە پێ بدەن، دوای تەواو بونی شەڕی ئێران ئەو جەیشە زەبەللاحەی بۆ شەڕی ئەوانمان دروست کردوە ئەیهێنینە سەر ئێوە، ساڵێک وەخت و سەد هەزار کوژراوتان بۆ تەرخان ئەکەین، بەڵام خاکتان بە تورەکە ئەبێژین و تەفروتوناتان ئەکەین!»

فەرەیدون لە وەڵام دا وت بوی: «ئەم هەڕەشانە ئێمە ناترسێنێ. کە دەستمان کردەوە بە خەباتی چەکدار ژمارەمان ئەوەندەی پەنجەکانی دەس بو. سەرەڕای ئەو هەمو توندوتیژیەی لە چەند ساڵی ڕابوردودا دژی ئێمە بە کارتان هێناوە بوین بە هەزاران و ئەوەتا ناچار بون لە سەر مێزی گفتوگۆ لە گەڵمان دابنیشن!»

ئەگەرچی فەرەیدون لە شوێنی خۆی دا وەڵامی پێویستی دابوەوە، بەڵام ئەبو ئێمە هەڕەشەکانی طاریق عەزیز کە بە زمانی حکومەت و حیزبی بەعسەوە کرد بوی بە جیددی وەربگرین. لەو کاتەدا خاوەنی گەورەترین عەماری چەک و هێزی چەکدار بون.

*

لە دوای چۆڵکردنی ناوزەنگ بارەگاکانی سەرکردایەتی بڵاوەیان لێ کرد. کاتێ گفتوگۆ دەستی پێ کرد مەکتەبی سیاسی و سەرکردایەتی یەکێتی بارەگای یەکگرتوی نەبو. مامجەلال لە بۆتێ بو لە دۆڵەڕەقە. من لە ناوەژێ بوم لە بەری مەرگە. دەزگای ڕاگەیاندن لە بەرگەڵو بو. هەندێ لە ئەندامەکانی تری لە خۆشناوەتی بون.

بۆ ڕاوێژ و پرسوڕا دەربارەی گفتوگۆ وا پێویستی ئەکرد هەمومان لە یەک شوێن کۆ ببینەوە. یا هیچ نەبێ لە نزیک یەکتری بین. مامجەلال لە بۆتێ ی دۆڵەڕەقەوە هاتە خۆشناوەتی، لە جێگایەک دامەزرا ناوی زیخان بو. زیخان کوێرەدێ بو، تەنیا خانویەک و هۆڵێکی گەورەی لێ بو، بەڵام کەوت بوە سەر جادەی گشتی. منیش چوم بۆ ئەوێ. لە ماوەی چەند ڕۆژێک دا هەمومان لەوێ کۆ بوینەوە.

د. قاسملو لە ئەوروپا گەڕا بوەوە بەغداد. کاربەدەستانی بەعسی بینی بو. هاتە زیخان بۆ بینینی ئێمە. داوای کرد لە گەڵ ئەندامانی م س کۆ ببێتەوە. لە گەڵی دانیشتین. کەوتە گێڕانەوەی ئەنجامی پێوەندیەکانی خۆی لە بەغداد. ئینجا کەوتە هەندێ پرسیار لە ئێمە. لە ناو پرسیارەکانی دا دوانی بۆ من مایەی تێ ڕامان بو. یەکێکیان پرسی: «ئایا ئێوە ئەزانن چیتان ئەوێ؟» ئەوی تریان ئەوە بو: «ئایا ئێوە ئەزانن لە گەڵ کێ تەرەفن؟»

دوای ئەم دانیشتنە قاسملو گەڕایەوە بەغداد بۆ ڕێکخستنی سەفەری

دەستەی نوێنەرایەتی یەکێتی بۆ بەغداد.

راگرتنی شەڕ

سەرەتای کانونی یەکەمی ١٩٨٣ بە بروسکە هەمو مەڵبەندەکان، تیپەکانی پێشمەرگە، ڕێکخراوەکانی کۆمەڵە و لقەکانی شۆڕشگێڕان، لە ڕاگرتنی شەڕ ئاگادار کران. دوای ئەم بڕیارەی یەکێتی، صەددامیش فەرمانی بە هێزە چەکدارەکانی عیراق دا (عملیاتی عسکری) دژی چەکدارەکانی یەکێتی ڕابگرن.

دەستەی نوێنەرایەتی ئەبو پێک بێ لە: مامجەلال، فەرەیدون، مەلازم عومەر، د. خدر مەعسوم، دواتر مەلا بەختیار و عومەر عەزیزیشی بۆ زیاد کرا.

*

لەو کاتەوە کە پێوەندی نێوان یەکێتی و بەعس دەستی پێ کرد بو، مەرجی پێشەکی بۆ دەسکردن بە گفتوگۆ ئەوە بو کە ئەبێ مامجەلال خۆی بچێ بۆ بەغداد بۆ گفتوگۆ و بینینی صەددام. نوێنەرەکانی حکومەت هەمو جار پێیان لە سەر ئەوە دائەگرت کە بە یەک جار دانیشتنی مامجەلال لە گەڵ صەددام، لەوانەیە گیروگرفتی کورد یەکلایی بکرێتەوە و، هەمو کێشەکان بە لادا بخرێن. ئێمە سەرگەرمی کۆبونەوە بوین. خەریکی باسی بابەتەکانی گفتوگۆ و لایەنی زۆر و کەمی خواستەکان بوین. هەواڵی چونی مامجەلال بۆ بەغداد لە ناو خەڵک دا بڵاو بوەوە. کۆمەڵێ لە پیاو ماقوڵەکانی خۆشناوەتی هات بون بۆ زیخان داوای بینینی مامجەلالیان کرد بو. پێیان وت بون مامجەلال مەشغوڵی کۆبونەوەیە. بەڵام ئەوان پێیان داگرت بو: کە هەتا مامجەلال نەبینن ناڕۆن. من چومە دەرەوە قسەیان لە گەڵ بکەم. دوای چاکوچۆنی لێم پرسین چ کارێکیان بە مامجەلال هەیە لە باتی ئەو بۆیان بکەم. وتیان: «بیستومانە مامجەلال ئەچێ بۆ بەغداد، ئەمانەوێ پێش ئەوەی بڕوا هەندێ قسەی لە گەڵ بکەین!» چومەوە بۆ لای مامجەلال و پێشنیارم بۆ کرد بە سەر پێوە بیانبینێ. مامجەلال هاتە لایان.

لێیان پرسی: «ڕاستە ئەچی بۆ بەغداد؟»

وتی: «بەڵێ ڕاستە!»

وتیان: «ضەمان چیە بە سەلامەتی بگەڕێیتەوە؟»

وتی: «هیچ!»

وتیان: «چی لە صەددام چاوەڕێ ئەکەیت؟»

وتی: «لەوانەیە دەمانچەکەی دەر بهێنێ گوللەیەک بنێ بە سەرمەوە، یان دەمانچەکەی خۆیم بە دیاری پێشکەش بکا. هەردو کاری لێ ئەوەشێتەوە.»

وتیان: «کەواتە بۆ نەچیت؟»

وتی: «من لە شاخم داوای مافی کورد نەکەم، ئەیشچم بۆ بەغداد بۆ داوای مافی کورد، لێرە بکوژرێم یان لە بەغداد، لە هەردو حاڵەت دا لە سەر مافی کوردە.»

سەرەتای کانونی یەکەمی ۸۳ دو هالیکۆپتەر لە زیخان نیشتنەوە. جگە لە د. قاسملو، نوێنەرێکی حکومەتیشیان لە گەڵ هات بو ناوی (ئەبو سەرحان) بو، کە یەکێ لە گەورە کاربەدەستانی (موخابەرات) بو.

ئەو رۆژە دیمەنێکی سەیری هەبو. هەمو ئەو پێشمەرگانەی لە بەرزایی شاخەکان بۆ پارێزگاری ناوچەکە لە روداوی چاوەڕێ نەکراو دامان نابون، بە پێچەوانەی ئەو فەرمانەی پێیان درا بو، دابەزی بون. بە قەمسەڵەی بەڵەکی، کە لە عەسکەر و جاش گیرا بون، وەکو نەدی و بدی لە دەوری کۆپتەرەکان وروکا بون. نمونەیەکی خراپی بێ دیسیپلینی و، نیشانەیەکی ئاشکرای ماندۆیەتی پێشمەرگە بو.

دەستەی نوێنەرایەتی یەکێتی لە گەڵ قاسملو و ئەبو سەرحان سواری کۆپتەر بون، لەمەش دا چەند کەسێ خۆیان فرێ دایە ناو کۆپتەرەکان، کە نە ئەندامی وەفدەکە و، نە راوێژکار و نە پێشمەرگەی پارێزگاری بون. ئەمەش دیسان نیشانەیەکی تری بێ دیسیپلینی بو.

*

کاروباری پەیوەندی و هێنان و بردنی دەستەی نوێنەرایەتی و ئامادەکردنی جێگا و رێگا بە «جیهازی موخابەرات» سپێردرا بو. تازە هیشام صەباح فەخری لە جێی بەرزان تکریتی دانرا بو بە سەرۆکی جیهازەکە. ئەو زەمانە هیشام بە گەورەترین قارەمانی جەیشی عیراق دائەنرا. وەفدی حکومەت: عیززەت دوری، طاریق عەزیز، هیشام صەباح فەخری، سەعدی مەهدی صالح، د. فاضیل بەراک.. لە گەڵ وەفدی یەکێتی: مامجەلال، فەرەیدون عەبدولقادر، عومەر عەبدوڵلا، مەلا بەختیار، د. خدر مەعصوم، عومەر عەزیز لە بەغداد دەستی پێ کرد. سەرکردایەتی یەکێتی دەسەڵاتی دا بەم وەفدە کە ئەگەر لە گەڵ وەفدی حکومەت گەیشتنە رێککەوتن، بێ ئەوەی پێویست بە گەڕانەوەیان بکات بۆ کۆبونەوەی سەرکردایەتی رێککەوتنەکە ئیمزا بکەن. بەلام پێش ئەوەی بچن بۆ بەغداد لە کۆبونەوەی سەرکردایەتی دا کە داوام لە مام جەلال کرد ئەگەر لە سەر چوارچێوەی گشتی مەسەلەکان پێک هاتن، ناوی خوای لێ بهێنن و رێککەوتنەکە ئیمزا بکەن. مام جەلال وتی: «ئەگەر

دەستیشم لە بنا ببڕنەوە ڕێککەوتن ئیمزا ناکەم!» منیش وتم: «ئەی کەواتە بۆ نەچی؟» لە وەڵام دا وتی: «ئێوە بە زۆر ئەمنێرن!»

باسەکانی گفتوگۆ

لەم خولەی گفتوگۆدا هەمو کێشە بنەڕەتییەکان بە درێژی باس کرا بون، بابەتە گرنگەکانی ئەمانە بون:

١. دەسەڵاتی داوودەزگاکانی حوکمی زاتی و دەسەلاتی حوکمی مەرکەزی.

٢. سنوری جوگرافی ناوچەی حوکمی زاتی.

٣. ناسایبکردنەوەی هەلومەرجی کوردستان، بە تایبەتی ناوچە تەعریب کراوەکانی کەرکوک، خانەقین، سنجار.. و، دێهاتی ڕاگوێزراو.

٤. بەشی کورد لە دەزگا ناوەندیەکانی بڕیاردان دا.

ئەم خولەی گفتوگۆ، ئەگەرچی هەندێ دەمەقاڵێ لە نێوان مام جەلال و طاریق عەزیز دا ڕوبو، بەلام بە گشتی باش ڕۆیشت بو. لە سەر زۆری مەسەلەکان تێگەیشتنی سەرەتایی هاوبەشیان دروست کرد بو. ئیتر کاتی ئەوە دێ بچنە سەردانی صەددام.

لەو کۆبونەوەیەدا صەددام ستایشی هەڵوێستی مامجەلالی کرد بو. وت بوی: «تۆ بەم کارە لەم کاتەدا دو چاکەت لە گەل کردوین چاکەیەک لە گەڵ عیراق و چاکەیەک لە گەڵ حیزب... شتێکتان ئەدەمێ تۆ لە بەردەمی هەمو کوردا سەربەرز و، گەلی کوردمان لە هەمو شوێنێک بیکا بە شایی و زەماوەن...»

هەروەها وت بوی: «من سەیری مەحزەری هەمو گفتوگۆکانم کردوە. گفتوگۆکانتان جیددی بوە و بە نیازی ڕێککەتنن، تەنانەت توڕەبونەکانیشتان نیشانەی جیددی بونە. من لە سەر هەمو باسەکان موافیقم جگە لە مەسەلەی کەرکوک. نالێم کەرکوک شارێکی کوردی نیە و، نالێم کەرکوک شارێکی عەرەبیە. تەنانەت دوای ئیستیفتاش ئەگەر دەرکەوت زۆرایەتی دانیشتوانی کوردە، ئەوساکەش من هەر سور ئەبم لە سەر ئەوەی شارێکی عیراقی بێ، هەمو خەلکی عیراق کەلک لە سامانەکانی وەربگرن، چونکە کورد بۆ ئەوەی کەرکوکی لە کیس نەچێ ئیتر بیر لە جیابونەوە ناکاتەوە، عەرەبیش بۆ ئەوەی کورد ڕازی بکا دژی سەلماندنی مافەکانی ناوەستێ...»

ئینجا وت بوی: «ئێوە ئەبن بە بەشێ لە ئێمە، ئێمەش ئەبین بە بەشێ لە ئێوە، هەردولامان پێکەوە حالەتی عیراقی یەکگرتو پێک ئەهێنین. پێکەوە حوکم ئەکەین، پێکەوە ئەژین، پێکەوە ئەمرین»

ئەم قسەیە ڕاستی مەبەستی بەعسی دەرئەخست، ئێمە نەمانئەویست ببین بە بەشێ لەوان و، ژیان و مردنی خۆمان بەوانەوە ببەستین. ئەم قسەیە مامجەلالی سڵەماند بوەوە. لە هەمان دانیشتن دا کە صەددام داوای کرد بو، ئەو پێکهاتنە و ئەو دانیشتنە بە ڕادیۆ و تەلەفزیۆن بڵاو بکرێتەوە. مامجەلال بە وەڵامێکی دیپلۆماسی خۆی لێ لادا بو، وت بوی: «ڕاستە من سکرتێری گشتی یەکێتیم، بەڵام دەسەڵاتی من هەر ئەوەندەیە ئەندامانی کۆمیتەی سەرکردایەتی بانگ بکەم بۆ کۆبونەوە، لە کاتی دەنگ دان دا لە سەر بڕیارێ ئەگەر دەنگەکانی هەردولا بە قەدەر یەکتری بون، دەنگی من لە گەڵ هەر لایەکیان بێ، ئەو بڕیارە ئەدرێ.. ئەگینا من دەسەڵاتی ئیمزاکردنم نیە، ئەبێ بچمەوە پرس بە هاوڕێکانم بکەم». صەددام چونکە لە حیزب و دەوڵەت دا هەمو بڕیارێ لە دەس خۆی دا بو، باوەڕی بەم قسەیە نەکرد بو.

*

دەربارەی کەرکوک

لە کۆتایی سەدەی ڕابوردوەوە لە کەرکوک نەوت دۆزراوەتەوە، بەڵام دەرهێنانی دواکەوتوە بۆ دوا ساڵەکانی ۱۹۲۰. لە سەردەمی عوسمانی دا ماوەی چەند سەدەیەک ناوەندی ولایەتی شارەزور بوە و، پاشان کراوە بە موتەصەڕڕیفیەت و خراوەتە سەر ولایەتی موسڵ. ولایەتی موسڵ لە ڕێککەوتنە نهێنیەکانی سایکس - پیکۆ دا بەر فەرەنسا کەوت بو. دوای تەواوبونی شەڕ، سەرەوەزیرانی بەریتانیا، لوید جۆرج فێڵی لە سەرەوەزیرانی فەرەنسا، کلیمانسۆ، کرد. ولایەتەکانی شام و موسڵیان گۆڕییەوە. موسڵ درا بە بەریتانیا. بەریتانیا ئەم فێڵەی لە فەرەنسا کرد چونکە ئەیزانی نەوتی زۆری تێدایە. فەرەنسا کاتێ بەوەی زانی، سەوداکە کرا بو. یەکێ لە هۆکرنگەکانی دروستکردنی دەوڵەتی عیراق و، نوساندنی ولایەتی موسڵ بە عیراقەوە نەوتی کەرکوک بو.

کەرکوک بە درێژایی مێژو ناوچەیەکی کوردنشین بوە. بەڵام بۆ پاراستنی ئەو شاڕێیەی لە دیاربەکرەوە چوە بۆ کرماشان، لە سەردەمی قەرە قۆینلو و ئاق قۆینلووەوە و، دواتر لە سەردەمی عوسمانی دا بە درێژایی ڕێگاکە تورکومانیان تێ دا نیشتەجێ کردوە. هەر لە بەر ئەوە خەتێکی باریکی نیشتی جیاواز لە کورد و عەرەب، لە ناوچەکانی تەلەعفەرەوە لە سەر سنوری سوریا بە لای ڕۆژهەڵاتی موسڵ و، خواروی هەولێر، کەرکوک دا بەرەو توزخورماتو، کفری، قەرە تەپە، تا خانەقین لە سەر سنوری ئێران درێژ ئەبێتەوە.

ئەم خەتە ئیتنیە بە درێژایی زەمان جێگیر بون و، لە کاتی لەشکرکێشیەکانی صەفەوی یش دا بە هێزتر کراون و، دەوڵەتی عوسمانی یش دوای ئەوەی بە یەکجاری دەستی بە سەر ناوچەکەدا گرت، بە ناردنی موچەخۆری تورک پشتیوانی کردون. لە گەڵ ئەمەش دا تورکومان هەمیشە کەمایەتیەکی پچوک بون، لە ناو دەریایەکی گەورەی ئێلاتی کوردا.

عەرەب وەکو زۆرایەتی یا کەمایەتی نەتەوەیی لە کەرکوک نەبون. هەندێ موچەخۆری تێ دا بوە، بەڵام قورسیی دیمۆگرافییان نەبوە. تا دەوڵەتی عیراق دامەزرا، ئەوسا ئیتر ژمارەی موچەخۆری عەرەب و، دواتر عەشائیری عەرەب، ڕوی لە زیاد بون کرد. لەم ڕووەوە لێرەدا دو بەڵگە لە بارەی دابەش بونی ئیشتنی دانیشتوانی ناوچەکە و، دەربارەی خاوەنێتی زەویوزاری کەرکوک بە نمونە ئەهێنمەوە، کە هیچیان کورد نەیکردون و، دەستی لە نوسینیان دا نەبوە.

یەکەمیان بەڵگەیەکی بەریتانیە. کۆرنوالیس موستەشاری وەزارەتی ناوخۆ سالی ۱۹۳۰ ئامادەی کردوە و مەندوبی سامی لە بەغداد ناردویەتی بۆ وەزارەتی کاروباری دەرەوەی حکومەتەکەی.

دوەمیان هەڵسەنگاندنی عەرەبێکی ئەمەریکاییە. نوسەری ئەمەریکایی بە ڕەچەڵەک مەسیحی فەلەستینی (حنا بطاطو) دەربارەی خاوەنێتی ئەرز لە عیراقی سەردەمی پاشایەتی دا لیستێکی ڕێک خستوە، لەو لیستەدا زەویوزاری کەرکوک بە تاپۆ مولکی چەند بنەماڵەیەکی ناسراوی کورد، لەوانە: بەگزادەکانی جاف، بابان، ساداتی کاکەیی، شێخانی تاڵەبانی، سەیید ئەحمەدی خانەقا بوە. هیچ بنەماڵەیەکی تورکومان یا عەرەب خاوەن مولکی گەورە نەبون لە کەرکوک.

بەعس، بۆ کاروباری جەنگی، جاسوسی، حیزبیی خۆی، کەرکوکی کرد بو بە ناوەندی بەشی سەروی عیراق. (مکتب تنظیم الشمال) کە سەرپەرشتی هەمو ڕێکخراوەکانی بەعس و، (فەیلەقی یەک) کە هەمو فیرقەکانی جەیشی عیراقی لە کوردستان دا پێوە بەسترا بو و، دەزگا سەرکوتکەر و جاسوسیەکانی (موخابەرات) و (منظومەی استخبارات المنطقە الشمالیە) و دواتر (الشرقیە) بارەگاکانیان لە کەرکوک بو. کەچی قوبوڵی نەئەکرد، لە باتی هەولێر، ببێتە ناوەندی بەڕێوەبەرایەتی و ئابوری و ڕۆشنبیری ناوچەکە، یا هیچ نەبێ لە ڕوی بەڕێوەبەرایەتی و ڕۆشنبیری و پەروەردەوە بخرێتە سەر حوکمی زاتی.

صەددام حسێن کە خۆی بە سەرۆکی هەمو عیراق دائەنێ و، لە وەرگرتنی حوکم دا خۆی نە بە قەرزاری عەرەب و نە بە هی کورد ئەزانێ، بۆ ئەو چ فەرقێکی

ئەگەر کەرکوک ناوەندی حوکمی زاتی کوردستان بوایە ؟ کام عەرەب ئەیتوانی بەرهەڵستی بکا و بەوە چی لە دەسەلات و شان و شکۆی کەم ئەبووە؟ یان صەددام چ قازانجێکی لە دەرکردنی کورد و هێنانی عەرەب بۆ کەرکوک کرد؟

بێدەنگییەکی ترسناک

که وەفدەکەمان ڕۆیشت بۆ بەغداد وا ڕێک کەوتین هەمو ڕۆژێ لە هەواڵی خۆیان ئاگادارمان بکەن. چەند ڕۆژێ هیچ هەواڵێکیان نەبو. من زۆر ترسام شتێکیان لێ بە سەر هات بێ. بۆ ئەوەی هەواڵێکیان بزانم، بە هۆی بنکەکەی دیموکراتەوە لە بەغداد بروسکەیەکم بۆ ناردن. وەلامیان دامەوە کە ڕەوتی ڕوداوەکان باش ئەڕوات. تومەز هۆی بێدەنگییەکەیان ئەوە بو بە خۆشی دا کەوت بون، نەک شتی تر. هەر شەوەی یەکێ لە کاربەدەستە زلەکان میوانداری کرد بون. گەورە کاربەدەستانی بەعس لە میوانداریی دا لاسایی ئەریتە خێڵەکییە کۆنەکانی: (ضیافە) و (کرم) ی عەرەبی ئەکەنەوە.

*

لەو چەند ڕۆژەدا مامجەلال زۆری سەرانی بەعس و وەزیرە گرنگەکان و کاربەدەستانی دی بو.

مامجەلال گەڕایەوە کوردستان. وەکو لە بەغداد پێک هات بون دەزگایەک بە ناوی (لجنە التنسیق) دامەزرێنرا. بارەگای لیژنە سەرەکیەکە لە کەرکوک و، لە هەر مەڵبەندەش لیژنەیەکی فەرعی دانرا. ئەم لیژنانە تێکەلاو بون لە نوێنەرێکی یەکێتی و، نوێنەرانی حیزبی بەعس، ئیستیخبارات، ئەمن، موخابەرات.

کارەکانی لجنەی تنسیق بریتی بو لە: چاودێریکردنی ڕاگرتنی شەڕ، ڕێکخستنی پێوەندیەکانی یەکێتی و حکومەت و، پێشمەرگە و هێزە چەکدارەکانی بەعس و، چارەسەرکردنی ئەو کێشانەی دروست ئەبن. نوێنەری یەکێتی لە لوجنە مەرکەزیەکەدا: عومەر عەزیز و عەلی حسێن حەسەن (شوان، داوییتر شەهید بو) کە ئەندازیارێکی کەرکوکی و یەکێ لە کادرە هەرە چاکەکانی یەکێتی بو، هی بەعس: سەعدی مەهدی صالح و، هی ئیستیخبارات: عەقید ڕوکن صالح محێسن بو. سەعدی ئەندامی قیادەی قوطری و مەسئولی (مکتب تنظیم الشمال) بو.

*

هەواڵی گفتوگۆ بە خێرایی بلاو بووەوە و، بە جۆری جیاواز دەنگی دایەوە. زۆرایەتی گەلی کورد لە عیراق دا، جگە لەوانەی جاش و بەعسی بون، بە خۆشییەکی بێ ئەندازەوە پێشوازی لێ کرد.

جوقد، کە یەکێتی لایەنێکی سەرەکی بو، یەکیتی تاوانبار کرد بە خیانەت و، لە جوقد دەری کرد لە بەیانێک دا ڕۆژی ٢٥ / ١٢ / ٨٣ لە ژێر ناوی: «حول المفاوضات المذله التی اقدم علیها الاتحاد الوطنی الکردستانی مع النظام الفاشی العمیل فی العراق».

لایەنەکانی جود زۆر بە توندی چون بە گژی دا، یەکێتیان تاوانبار کرد بە خیانەت و جاشایەتی بەعس. لە بەیانێک دا ڕۆژی ٤ / ١ / ٨٤ لە ژێر ناوی: «لتقبر اتفاقیه صدام - الطالبانی المذله».

دەوڵەتانی ناوچەکە:

ئێران دژی ڕاوەستا و، ڕەفسنجانی لە خوطبەی نوێژی جومعەدا بە ئاشکرا هێرشی کردە سەری.

سوریا بە ئاشکرا لە دژی نەدوا بەڵام زۆری پێ ناڕەحەت بون، بە تایبەتی وایان دائەنا کە غافڵگیر کراون، چونکە پێشتر ئاگادار نەکراون و، ئەوانیش لە دەزگاکانی ڕاگەیاندنەوە بیستویانە. ئەمەش سوچی نوێنەرەکانی یەکێتی بو لە سوریا. چەند مانگ پێش دەس پێکردنی گفتوگۆ، ئاگاداری نوێنەرەکانی خۆمان کرد بو کە بە کاربەدەستانی سوری بڵێن: ئێمە گوشارێکی زۆرمان لە سەرە، لە لایەکەوە لە شەڕداین لە گەڵ عیراق و، لە لایەکی ترەوە لە شەڕداین لە گەڵ جود و ئێران. ئەگەر ئەوان ئەتوانن وا لە جود بکەن شەڕمان لە گەڵ ڕابگرێ و ئێران گوشارمان لە سەر لا ببات، ئەوا درێژە بە شەڕی عیراق ئەدەین، ئەگینا بۆ پاراستنی یەکێتی و گەلەکەمان لە مەترسی ناچارین شەڕ لە گەڵ عیراق ڕابگرین. نوێنەرەکانی یەکێتی لە سوریا، لە بەر هەر هۆیەک بێ، ئەو بەشەیان پێ ڕانەگەیاند بون کە پەیوەندی بە ڕاگرتنی شەڕەوە هەبو لە گەڵ عیراق.

تورکیاش دژی هەمو دەسکەوتێک بو کورد بە دەستی بهێنێ.

لە ناو یەکێتی یش دا زۆری ئەوانەی لە دەرەوە بون لە سوریا، ئەورروپا و ئەمەریکا، دژی گفتوگۆ ڕاوەستان. هەندێکیان بە یەکجاری لە یەکێتی تەکینەوە و، کەوتنە پەلامار دانی. بەیان و بڵاوکراوەیان دەرئەکرد تاوانباریان ئەکردین بە (خۆ بە دەستەوەدان).

*

کارێکی وەها کە هەر لە سەرەتاوە ئەو هەمو دوژمنەی هەبێ و، هەوڵی تێکدانی بدەن، دیارە سەرناگرێ و سەرکەوتن بە دەس ناهێنێ، بە تایبەتی لە گەڵ کەسێکی دیکتاتۆری وەکو صەددام و، دەسەڵاتێکی تۆتالیتاری وەکو بەعس.

*

بۆ ڕونکردنەوەی هەلومەرجی کوردستان و بیروڕای ئێمە لە سەر ڕەوتی گفتوگۆ و باس و بابەتەکانی، فەرەیدون عەبدولقادر چو بۆ پاریس بۆ ئەوەی لە گەڵ بەرپرسەکانی یەکێتی لە دەرەوە کۆ ببێتەوە. فەرەیدون نەیتوانی بو بە بیانوەکانی ئێمە قانعیان بکا. لە ڕاستی دا نەیان ویست بو قانیع بن. لەو کاتەدا زۆری ئەو کوردانەی لە دەرەوە بون (پەنابەر) بون، ئەترسان ڕێککەوتنی یەکێتی - بەعس ببێ بە هۆی لە دەس دانی مافی پەنابەری و نەمانی بیانوی مانەوەیان لەو ولاتانەدا.
هەر لە پاریسەوە فەرەیدون یادداشتێکی بە ناوی سەرکردایەتی یەکێتیەوە بۆ سەرکردایەتی جوقد نوسی و، هۆیەکانی ئەم هەنگاوەی یەکێتی بۆ ڕون کرد بونەوە و، دڵنیای کرد بون کە یەکێتی کارێ ناکا زەرەر لە موعارەزە بدا.
داوامان لەو ئەندامانەی سەرکردایەتی کرد کە لە دەرەوە بون بگەڕێنەوە کوردستان. هەندێکیان گەڕانەوە، بەڵام هەندێکیان ئامادە نەبون بگەڕێنەوە کوردستان، تەنانەت یەکێکیان وت بوی: «من جاشایەتی-ناکەم!» کە ئەم قسەیەیان بۆ گێڕاینەوە، یەکێ لە هەڤاڵەکان هەڵی دایە وتی: «ئەو پێشمەرگایەتی پێ نەکراوە، جاشایەتی هەر پێ ناکرێ، جاشایەتی ئێستا لە پێشمەرگایەتی زەحمەتترە!» ئەو کاتە جاشەکانیان ئەبرد بۆ شەڕی ئێران و، لە کوردستانیش لە هەندێ ڕەبیەی مەترسیدار دا دایان ئەنان.
مەلا بەختیاریش دوای ماوەیەکی تر بۆ هەمان مەبەست گەشتێکی کرد بۆ ئەوروپا و، چەند ولاتێ گەڕا و، کۆبونەوەی بە ڕێکخراوەکانی دەرەوە کرد. گەشتەکەی ئەمیش هیچ لە دوژمنایەتی توندوتیژی دوژمنانی گفتوگۆ کەم نەکردەوە.

*

هەوڵێکی سەرنەگرتو بۆ ئاشتبونەوە لە گەڵ جود
ئەو ماوەیە دەیان هەزار کەس هاتن بۆ سەردانی مامجەلال و ئەندامانی تری سەرکردایەتی. لە ناو ئەوانەدا بە سەدان ڕۆشنبیر و شارەزایان تیدا بو، بیروڕا و پێشنیاری باش و بە کەڵکیان پێشکەش ئەکرد.
ڕۆژی ٢١ / ١٢ / ٨٣ فەرەیدون دارتاش، کامیل ئەحمەد، خالید سەرکار، کە هەر سێکیان لە یەکێتی هونەرمەندانی کوردستان بون، هات بون بۆ زیخان. بە ڕێکەوت شێرکۆ بێکەس و سەعید ناکامیش لەوێ بون. هونەرمەندەکان، کە فەریدون لە باتی ئەوان قسەی ئەکرد، پێشنیاریان کرد، یەکێتی بۆ ئاشتبونەوە لە گەڵ لایەنەکانی جود دەسپێشکەری بکات، بە تایبەتی کە یەکێتی لە هەڵوێستێکی

بە هێزدایە. ئامادەیی خۆیان دەربڕی بۆ ناوبژی و هاتوچۆی نێوان هەردولا.
ئەم پێشنیارەمان خستە بەردەم کۆبونەوەی م س. هەمویان پێیان باش بو.
ڕۆژی ٢٥ / ١٢ / ٨٣ م س ـ ی ن ک نامەیەکی بۆ م س حشع نوسی و، هەواڵی بۆ فەرەیدون نارد کە بێن بۆ بردن و گەیاندنی. یەکێتی ئەیویست لە ڕێگەی حشعەوە گفتوگۆ لە گەڵ لایەنەکانی جود دابمەزرێنێ، لە هەڵبژاردنی حشع دا دو مەسەلە ڕەچاو کرا بو: یەکەمیان، بارەگاکانی ئەوان لە ناو خاکی عیراق دا بو، نوێنەر و نامەبەرەکانی ئێمە ئەیان توانی بێ ئەوەی توشی گرتن و گێچەڵی ئێران بێن بیانگەنێ، ئەوانی تر بارەگاکانیان لە ناو ئێران دا بو، بە تایبەتی هی پارتی لە گوندێکی نزیک ورمێ بو، کەسی دۆستی ئێمە نەیئەتوانی بە ئاسانی بیگاتێ. دوەمیان، حشع لە چاو لایەنەکانی تری جودا کەمتر لە ژێر باری گوشار و ئیبتیزازی ئێران دا بو. سێیەمیان، حشع لە چاو لایەنەکانی جودا لە هەمویان زیاتر پێویستی بەوە هەبو دەرەتانی گەڕانەوەی کوردستانی عیراقی لێ بکرێتەوە.
فەرەیدون دارتاش و هاوڕێکانی لە ناو شار لە گەڵ زۆر کەس لە هونەرمەند، ئەدیب، نوسەرەکانی سلێمانی، هەولێر، بەغداد قسەیان کرد بو. هەمویان بە خۆشییەکی زۆرەوە هەواڵەکەیان وەرگرت بو، بەڵێنیان دابو، هەر کەس لە ئاستی خۆیەوە چی پێ ئەکرێ دریخی نەکات. لە ناو خۆیان دا وا پێک هات بون، بە نوێنەرایەتی یەکێتی هونەرمەندانی کوردستان فەرەیدون دارتاش و، بە نوێنەرایەتی یەکێتی نوسەرانی کوردستان محەممەدی حەمە باقی و محەممەد موکری ئەرکی ناوبژی و هێنان و بردنی نامەکانی نێوان هەردولا بگرنە ئەستۆ.
بارەگای سەرکردایەتی و لێپرسراوەکانی هەمو لایەنەکانی جود لە ناو خاکی ئێران دا بو. لە نێوان پارتی و ئێران و لە نێوان حسک و ئێران دا بە ڕەسمیی پێوەندی هەبو. هەردو حیزب لە شارە سنوریەکانی بۆ ڕاپەڕاندنی کارەکانیان، کە یەکێکیان هاتوچۆی کادر و هێزەکانیان بو، نوێنەریان هەبو. حشع خۆی نوێنەری نەبو، ئێران ڕێگەی ئەئەدان بە ناوی حیزبی شیوعیەوە هاتوچۆ بکەن. بەڵام پارتی و حسکیان ڕاسپارد بو، کە بە ناوی کادر و پێشمەرگەی خۆیانەوە پسوڵەی هاتوچۆیان بۆ بکەن و، ئێران چاوپۆشی لێ ئەکرد و، جاروباریش بۆ ئەوەی سوکایەتییان پێ بکا ئەیگرتن و گێچەڵی پێ ئەکردن.
حیزبی تودەی ئێران هەر لە سەرەتاوە زۆر بە گەرمی پشتیوانییان لە ئیمام خومەینی و جوڵانەوەکەی کرد، بە تایبەتی لە بەر ئەوەی دژی ئەمەریکا بو. حیزبی تودە لە تاران و زۆر جێگەی تر بە ئاشکرا بارەگای دانا بو، کاری سیاسی ئەکرد و،

ڕۆژنامەی مەردوم لە تاران بە ئاشکرا دەرنەچو. لەو زەمانەوە حشع هەوڵێکی زۆری دا، چ بە هۆی حیزبی تودەوە و، چ بە هۆی فەلەستینیەکان و، چ بە هۆی پارتی و حسک و، چ خۆیان بە جیا، بۆ ئەوەی حکومەتی ئێرانی بە ڕەسمیی پێوەندییان لە گەڵ دابمەزرێنێ. عادل حبە، کە سەردەمێکی درێژ لە سەردەمی شادا لە ئێران زیندانی بوبو، لە زیندان دا بە باشی فارسی فێر بوبو، لە هەمان کات دا شیعە بو، ئەو کاتە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی حشع بو، ناردیان بۆ تاران بۆ ئەوەی وەکو نوێنەری حشع ئەو پێوەندیە دروست بکا، بەڵام ئێران گرتی و دیسان لە زیندانی توند کرد و، پاش ماوەیەکی درێژ لە ئەنجامی هەوڵدانی سوری دا بەر درا و تەسفیر کرا بۆ سوریا. ئێران شیوعیەکانی بە کافر و، لە هەمان کات دا بە جاسوسی یەکێتی سۆڤیێت دائەنا، لە بەر ئەوە ئامادە نەبون، پێوەندی ڕەسمییان لە گەڵ دابمەزرێنن. سەرەنجام سەرانی حیزبی تودەیشیان گرت و، بە تاوانی جاسوسی دایانن بە دادگا و، هەندێکیشیان هاتنە سەر تەلەفزیۆن، بە درۆ یان بە ڕاست، دانیان بەم توهمەیەدا نا.

ئێران ڕێگەی حشعی نەئەدا لە ناو خاکی ئێران دا بارەگا دابنێن، لە بەر ئەوە ناچار بون، لە هەندێ ناوچەی سنوری چەپەک و دابڕاودا بارەگای پچوکیان دانا بو. یەکێکیان بارەگایەکی پچوک بو لە شاخی سورێن.

فەرەیدون دارتاش، حەمەی حەمە باقی، محەمەد موکری نامەکەی م س یەکێتییان لە ١٥ / ١ / ٨٤ برد بۆ کەرەژاڵ. کەرەژاڵ بە قەد شاخی سورێنەوەیە لە سەر سنوری ئێران. بنکەیەکی پچوکی حشعی لێ بو، مەلا ئەحمەدی بانیخێلانی بەرپرسی بو. کە گەیشتبونە ئەوێ مەلا ئەحمەد و جەلال دەباغ لە گەڵیان دائەنیشن و نامەکەیان لێ وەرئەگرن و ئاگاداری م س خۆیان ئەکەن. مەلا ئەحمەد ئاگاداری کرد بون، کە بڕیاردان لەو مەسەلەیەدا لە دەس م س دایە، بەڵام حشع بە مەرجێ لە گەڵ یەکێتی ئاشت ئەبێتەوە، کە یەکێتی دان بەوەدا بنێ بە پیلانی حکومەتی بەعس لە پشتاشان تاوانی گەورەیان بەرامبەر حشع و هێزە نیشتمانیەکان کردوە، ئەبێ دان بە تاوانەکانیان دا بنێن و، داوای لێبوردن بکەن و، پێوەندی لە گەڵ حکومەت ببڕن، ئینجا ئەوسا حشع بیر لە ئاشتبونەوە ئەکاتەوە!

وەفدەکە بە دڵی ئاشادەوە هەڵئەسن بگەڕێنەوە. جەلال دەباغ ئەیانباتە لاوە، سوپاسی هەوڵەکەیان ئەکا و، داوایان لێ ئەکا بەردەوام بن و، ئەڵێ ئەوە ڕەئی ئەبو سەرباز خۆیەتی وا توندوتیژە، ئەگینا زۆری کادرەکانی حیزب، ئاشتبونەوەیان پێ خۆشە.

دوای گەڕانەوەیان لە کەرمژاڵ، لە ٢١ / ١ / ٨٤ دا، فەرەیدون دارتاش و محەممەدی حەمە باقی چون بۆ بارزان، کە گۆیا بارەگای مەکتەبی سیاسی حشعی لێ بو، چەند بەرپرسێکی حشعیان بینی بو، کەسیان ئەندامی م س نەبون، ئەوانیش وەکو مەلا ئەحمەد قسەیان کرد بو.

لەو کاتەدا حشع لە ناو خۆیان دا توشی تەنگوچەڵەمەی ڕێکخراوەیی، ئایدیۆلۆجی، سیاسی بوبون. ناکۆکی لە نێوان پیرەکانیان و گەنجەکانیان و، لە نێوان کادرە عەرەبیەکانیان و کادرە کوردیەکانیان و، لە نێوان لایەنگرانی خەباتی شاخ و خەباتی شار، تەقی بوەوە. هەندێ لە کادرە عەرەبەکان، کە لە ژیانی شاخ و کاری چەکدار بێزار بوبون، ئەیانەویست بێهودەیی، بەڵکو زەرەربەخشیی مانەوەیان لەو شاخ و داخە دابڕاوانە و تێوەگلانیان لە شەڕی ناوخۆی هێزە کوردیەکانەوە، بکەن بە بیانو بۆ خۆ دەربازکردن لە پێشمەرگایەتی و ڕۆیشتن بۆ سوریا و، وڵاتانی دەرەوە.

بنکەی ناوزەنگ

بۆ ئەوەی لە یەکتری نزیک بین، هەمومان لە ناوزەنگ کۆ بوینەوە. من ماڵەکەی خۆمم بۆ مامجەلال چۆڵ کرد. هەر لەو ماوەیەدا د. فوئاد مەعصوم گەڕایەوە کوردستان. تا لە دەرەوە بو ئەمیش دژی گفتوگۆ بو، بەڵێنی بە سوریەکان و لایەنەکانی جوقد و هەڤاڵەکانی دا بو بگەڕێتەوە کوردستان بۆ ئەوەی سەرکردایەتی یەکێتی لە گفتوگۆ پەشیمان بکاتەوە. بەڵام کە گەڕایەوە و، هەلومەرجی کوردستانی بە چاوی خۆی بینی، ئەمیش بیروڕای خۆی گۆڕی. بو بە ئەندامێکی چالاکی وەفدی یەکێتی لە هەمو خولەکانی گفتوگۆدا و، لە گرنگترین خولی گفتوگۆدا کە هەندێ لە ڕێککەوتنەکانی تێ دا ئیمزا کرا ئەم سەرۆکی وەفدی یەکێتی و، بەڵگەکانی لە باتی یەکێتی ئیمزا کرد.

*

بەعس ئەو هەڵچونەی پێ خۆش نەبو. خەڵک بوژانەوە. ورەیان بەرز بوەوە. لە داوودەزگا سەرکوتکەرەکان نەئەسڵەمینەوە. بە پێچەوانەوە، پیاوەکانی بەعس ورەیان بەر دابو، لە چارەنوسی خۆیان ئەترسان. بەعس بۆ ئەوەی جڵەوی دەسەڵاتی لە دەس دەرنەچێ زۆر زو بە خۆ کەوت. بەرپرسەکانی بەعس بۆ ئەوەی ورەی نۆکەرەکانی خۆیان و جاشەکان بەرز کەنەوە و دڵنیایان بکەن لەوەی دەستیان لێ هەڵناگرن، دەستیان کرد بە (ندوە) هەندێ لەم قسەکەرانە هەوڵیان ئەدا لە نرخی گفتوگۆ کەم بکەنەوە. وەکو دواتر دەرکەوت، ئەمە بە فەرمانی صەددام خۆی کرا بو. لە سەر ئەوە مام جەلال نامەی نارەزایی بۆ طاریق عەزیز نوسی و، ئەویش وەڵامی

دایەوە. ئەمەیش نمونەیەک بو لە (نیفاق) ی بەعس بەرامبەر کورد.

*

دوای گەڕانەوەی مامجەلال بە هۆی ئەو (ندوە)انە و، بە هۆی هەندێ وردە شەڕی نێوان جاش و پێشمەرگە، ساردی کەوت بوە ڕەوتی گفتوگۆکەوە. وەکو دوایی بیستمانەوە، هەر لەو دانیشتنەوە کە صەددام داوای لە مامجەلال کرد بو (اتفاق) ئیعلان بکرێ و، مامجەلال داوای کرد بو تەئجیل بکرێ تا ئەگەڕێتەوە بۆ کوردستان و موافەقەتی هاوڕێکانی وەرنەگرێ، گومانی لە جیددییەتی مامجەلال و یەکێتی پەیدا کرد بو، بە تایبەتی کە پێ ی ڕاگەیاند بون کە نە خۆی و نە من هیچ کارێکی حکومەتی وەرناگرین. ئەم هەڵوێستەیان وەها لێک دابوەوە کە یەکێتی کات ئەکوژێ، چونکە چاوەڕوانی ئەوەیە: ئێران هێرش بکا و عیراق بشکێ.

*

زۆر جار لە گەڵ مام جەلال و، لە گەڵ هاوڕێکانی ترم دا ئەوەم باس کرد بو کە گرنگترین بەڵگەی قانونی بە دەس کوردەوە لە عیراق دا بەیانی ۱۱ ی ئازاری ۱۹۷۰ یە. ئەو بەیانەش هەرگیز بە تەواوی و بە ڕێکوپێکی جێ بە جێ نەبوە. بۆچی مام جەلال و سەرکردایەتی یەکێتی یش ئەگەر هەلێکی لەو بابەتەی بۆ هەڵ بکەوێ، دەسکەوتێکی سیاسی وەکو ئەوە بە دی بهێنێ، تەنانەت ئەگەر جێبەجێش نەکرێ، نەبێ بۆچی نەیقۆزێتەوە؟ بە تایبەتی کە ئەبێتە بەڵگەیەکی قانونی و ڕەسمی بە دەس کوردەوە.

من لەم خولەی گفوگۆ دا بەشدار نەبوم، بەڵام وەکو بەشدارەکان بۆیان گێڕامەوە و، د. قاسملوش تەئکیدی ئەکرد: لەو خولەی گفتوگۆدا ئەکرا بەیانێکی سیاسی لەو بابەتە لە سەر گفتوگۆ و ئەو مەسەلانەی لە سەری ڕێک کەوت بون بڵاو بکرێتەوە. بێگومان ئەمەش ئەبو بە سەرکەوتنێکی گەورە بۆ مام جەلال خۆی و بەیانی ئازاری ئەکرد بە ژێرەوە. بەڵام وەکو بەشدارەکانی گفتوگۆ ئەیانوت مام جەلال خۆی ئەم هەلەی لە دەس خۆی دا بو.

*

ڕۆژی ۱٦ ی کانونی دوەمی ۸٤ کۆبونەوەی کۆمیتەی سەرکردایەتی یەکێتی لە سەرگەڵو کرا. بەعس داوای کرد بو بۆ درێژە پێ دانی گفتوگۆ، یەکێتی وەفدی خۆی بنێرێ بۆ بەغداد. لەم کۆبونەوەیەدا بڕیار درا وەفدەکە پێک بێ لە: د. فوئاد، فەرەیدون، عومەر عەبدوڵلا، عومەر عەزیز، مەلا بەختیار و، من.

تا ئەو کاتە هیچ پرۆژەیەکی نوسراومان ئامادە نەکرد بو بیکەین بە بنچینەی

گفتوگۆ. من هەندێ شتی پچڕپچڕم ئامادە کرد بو. لە گەڵ د. فوئاد دانیشتین بە عەرەبی دامان ڕشتەوە و ڕێکمان خست و ئامادەمان کرد. پیشانی مامجەلال و ئەندامانی سەرکردایەتی و هەندێ لە قانونی و ڕۆشنبیر و شارەزامان دا. دوای ڕەچاو کردنی تێبینییەکان و داڕشتنەوەی چاپ کرا.

*

مەرقەدی شێخ عەبدولقادر

ئاگاداری حکومەت کرا کە وەفدی ئێمە ئامادەیە. ڕۆژی ٢٤ ی کانونی دوەم وەکو ڕێک کەوت بوین چوینە دوکان. عقید احسان محمد الدیری، بەڕێوەبەری دەزگای (موخابەرات) لە کەرکوک، بە هالیکۆپتەر هات بو بە دوامان دا. بە کۆپتەر بە ڕێ کەوتین بۆ کەرکوک. بۆ نانی نیوەڕۆ لامان دایە بنکەی جیهازی موخابەرات. بەڕێوەبەری (منظومە استخبارات المنطقە الشمالیە) بۆ بە خێر هاتن، هات بو بۆ لامان. پێشتر جارێکی تر لە زیخان دی بوم. خۆی بە ناسیاو دائەنا. بە کۆمەڵ دەمەتەقێمان نەکرد. کە نزیک کەوتینەوە لە ڕۆیشتن، لە میواندارەکەمانم پرسی: «لە بەغداد لە کوێ دامان ئەبەزێنن؟» من حەزم ئەکرد لە ئوتێلێکی گشتی دامانبەزێنن بۆ ئەوەی هەلی بینینی هەندێ کەسمان بۆ هەڵبکەوێ.

کابرای ئیستیخبارات هەڵی دایە، وتی: «کاکە بەغداد ئێستا کۆشک و سەرا و ئوتێلی ئەوەندە -فخم- ی لێیە، شوێنی وا خۆشتان نەدیوە. کوێتان پێ خۆش بێ لەوێ داتان ئەبەزێنین.» هەرچەندە ئەو مەبەستی موجامەلە بو، بەڵام من قسەکە سەر و دڵی گرتم. وا تێگەیشتم بە نەدی و بدیان تێ ئەگات. پێم وت: «من دەیان وڵاتی ئەورووپاییم بینیوە، لە خۆشترین ئوتێل دابەزیوم، لە خانوی خوێندکاران و خانوی لاوان دا ژیاوم، هەروەها لە ئەشکەوت و لە هۆڵە مەڕیش دا نوستوم. گرنگ بە لای منەوە ئەوەیە مافی گەلەکەمان بسەلمێنن، خوای نەکرد ئەتان بردین لە مەرقەدی شێخ عەبدولقادری گەیلانی لە گەڵ هندی و پاکستانییەکان ئەتان خەواندین..»

فراوینمان لە بارەگای موخابەرات خوارد. بە ئۆتۆمۆبیل بە ڕێ کەوتین بەرەو بەغداد. لەوێ لە یەکێ لە کۆشکەکانی موخابەرات دایان بەزاندین.

*

لەو ماوەیەدا هەندێ ئاڵوگۆڕ لە سەرانی دەزگا سەرکوتکەرەکان دا کرا بو. عەلی حەسەن مەجید کرا بو بە بەڕێوەبەری (ئەمنی عام)، د. فاضیل بەڕاک کە چەند ساڵ بو بەڕێوەبەری (ئەمنی عام) بو لە جێگای هیشام صەباح فەخری کرا بو

به بەڕێوەبەری (جیهازی موخابەرات)، لیوا ڕوکن مەحمود شوکر شاهین کرا بو بە بەڕێوەبەری (ئیستیخباراتی عەسکەری) و، هەر ٣ دەزگا بەسترا بون بە سەرۆکایەتی کۆمار، واتە بە صەددام حسێنەوە.

بۆ شەو د. فاضیل بەڕڕاک هاتە لامان. ئێمە میوانی دەزگاکەی ئەو: جیهازی موخابەرات، بوین. مەبەستی لە هاتنەکەی جگە لە موجامەلە، (استطلاع) بو، ئەیویست ئێمە بناسێ و، عەقڵ و، تێگەیشتنی ئێمە بخوێنێتەوە و، بزانێ ئێمە چیمان لە گەڵ خۆمان بردوە.

د. فاضیل خەڵکی گوندی (عوجە) هەمان گوندی صەددام بو. دەرچوی (کلیەی عسکری) و، ئەندامی حیزبی بەعس بو. دوای ئەوەی بەعس هاتە سەر کار ماوەیەک (مورافیق) ی ئەحمەد حەسەن بەکر بو، پاشان کرایە یاریدەدەری (مولحەقی عەسکەری) لە سەفارەتی عیراقی لە مۆسکۆ. ئەو کاتەی لە مۆسکۆ بوە باسێکی دەربارەی جولانەوەکەی سالی ١٩٤١ ی ڕەشید عالی گەیلانی نوسیوە و پێشکەشی کردوە بە یەکێ لە زانکۆکانی مۆسکۆ. لە سەر ئەم باسە پلەی (دکتۆرا) ی وەرگرت بو. ئەم باسەی، دوای دەسکاری کردنی، بە عەرەبی لە عیراق بلاو کردۆتەوە. چەند کتێبێکی تریشی نوسیوە دەربارەی: «تهدیدات الامن الوطنی»، «المدارس الیهودیه والایرانیه فی العراق»، «البارزانی بین الاسطوره والواقع»، ئەو شەش بەرگەش کە لە سەر مێژوی حشع دەرچوە ئەڵێن هەر ئەم نوسیونی.

د. فاضیل زۆرتر لەوەی خۆی بە سەرۆکی دەزگایەکی سەرکوتکەر دابنێ، خۆی بە مێژونوس و زانا دائەنا. کتێبەکانی نرخی زانستییان کەمە، بەڵام هەندێ بەڵگەی بە کەڵکیان تێدایە کە لە ئارشیفەکانی ئەمن دەری هێناون. نوسینەکانی ڕەگەزپەرستییان پێوە دیارە و، بە زۆری بۆ ڕازیکردنی صەددام نوسراون.

د. فاضیل بەڕڕاک، ڕەنگە دوای صەددام و عەلی حەسەن مەجید، گەورەترین جەللادی مێژوی عیراق بێ. لە سەردەمی ئەم دا بە هەزاران کەس لە ئەندام و لایەنگرانی هەمو حیزب و جولانەوە سیاسیەکان لە زیندانەکانی (ئەمن) دا بە ئەشکەنجە کوژران، یا هەڵواسران. سەرەنجام صەددام ئەمیشی کوشت بۆ ئەوەی بە یەکجاری بێدەنگی بکات و نهێنییەکانیشی لە گەڵ بنێژێ.

*

ڕۆژی ٢٥ ی کانونی دوەمی ١٩٨٤ لە یەکێ لە هۆڵەکانی بارەگای موخابەرات دا یەکەم دانیشتنمان دەستی پێ کرد.

لە لایەنی حکومەتەوە د. فاضیل بەڕڕاک و، هەندێ لە گەورە کاربەدەستانی

موخابەرات و ئیستیخبارات بەشدار بون. د. فاضیل وتی: «ئەم دانیشتنە (ودی) ە، دانیشتنی رەسمیی سبەی لە گەڵ طاریق عەزیز ئەبێ.» راستیەکەی ئەم دانیشتنەش هەر بۆ استطلاع و هەڵسەنگاندنی ئێمە بو. ئەو زەمانە دەزگا جاسوسیەکانی عیراق زۆر کەم شتیان لە سەر ئێمە ئەزانی و ئەو شتانەی ئەیانزانی زۆری ناراست بو. تەنانەت کە فەرەیدون چو بو بۆ بەغداد، ناوەکەیان بە هەڵە نوسی بو، بروسکەیەکیان بۆ دەزگا جاسوسیەکانی پارێزگاکانی کوردستان نارد بو، داوایان کرد بو کە زانیارییان لە سەر (فەرەیدون عەلی قادر) بۆ بنێرن. لە کاتێک دا دا فەرەیدن چەند ساڵێ لە زیندانی ئەبو غرێب بەند بو.

پرۆژەکانی خۆمان دانێ. هەندێ مشتومر کرا. فاضیل لە توندەکان بو. حەزی بە رێککەوتن نەئەکرد. هەمیشە باسەکانی بەرەو ئەوە ئەبرد لە یەکتری دور بکەوینەوە. لای ئێمە خۆی وا دەرئەخست هەرچی ئەو ئەیڵێ نواندنەوەی بیروراکانی صەددامە.

رۆژی ٢٦ ی کانونی دوەم دانیشتینەوە. لەم کۆبونەوەیەدا جگە لە فاضیل بەرراک، طاریق عەزیز، لیوا روکن مەحمود شوکر شاهین، چەند کەسێ لە کاربەدەستەکانی دەزگاکانی موخابەرات و ئیستیخبارات بەشدار بون. هەردولامان قسەمان کرد. طاریق عەزیز زۆربڵێیە، درێژدادڕی زۆر ئەکا، بە وردی مەبەست نادا بە دەستەوە.

طاریق عەزیز وتی: «من ئەبێ بەیانی بچم بۆ بەشداری لە کۆنگرەی وەزیرانی دەرەوەی وڵاتانی ئیسلامی، لە بەر ئەوە من ناتوانم بەشداری کۆبونەوەکان بم. سەرکردایەتی فایلی گفتوگۆی بە من سپاردوە، حەز ئەکەم هەر لە دەس خۆما بمێنێتەوە. ئەگەر ئەتانەوێ داوا لە سەرکردایەتی ئەکەم لە جێگای من یەکێکی کە دابنێ، یان تا من دێمەوە کەڵک لەو هەلە وەربگرن بۆ سەردانی شوێنە تازەکانی بەغداد، یاخود ئەگەر کارتان هەیە و ناتانەوێ لێرە بن، بگەرێنەوە بۆ لای خۆتان تا من ئەگەرێمەوە.»

لە ناو خۆمان دا وا رێک کەوتین پێی بڵێین مادام پێت خۆشە فایلی گفتوگۆ لە دەس تۆ دا بمێنێتەوە، ئێمە ئەرۆینەوە بۆ لای خۆمان، چاوەرێ ئەکەین تا تۆ ئەگەرێیتەوە. کۆبونەوەکەمان کۆتایی هات. راستیەکەی ئەوە بو: بەعسیەکان منیان لە هەرە توندڕەوەکان دانا بو، ئەیان ئەویست لە گەڵ من گفتوگۆ دابمەزرێنن. هەر ئەو دەمەی کە لجنەی تنسیق بە عقید احسان محمد الديري يان وت بو: «وەفدی یەکێتی ئامادەیە». ئیحسان پرسی بوی: «وەفدی ئەمجارە کێیە؟» کە وت بویان فلان کەسە،

یەکسەر وت بو: "یا ستار! گفتوگۆیەکی سەخت نەبێ!"

*

ئەم خولەی گفتوگۆ بەوەندە تەواو بو. بەلام پێش ئەوەی بگەڕێینەوە بۆ کوردستان، داوایان لێ کردین بۆ یەکتر ناسین سەردانی هەندێ لە کاربەدەستان بکەین.

پێش نیوەڕۆی ٢٩ ی کانونی دوەم سەردانی نەعیم حەددادمان کرد، نەعیم سەرۆکی (المجلس الوطنی) بو. پاش نیوەڕۆکەی سەردانی طەها جەزراویمان کرد. طەها فەرمانەدەی گشتی (جەیشی شەعبی) بو. طەها بە ڕێچەلەک کوردی تورکیایە. دایک و باوکی فێری عەرەبی نەبون. ئەمەی لێ بو بو بە (گرێ)، ئەیویست خۆی وا دەر بخا ئەم لە عەرەبەکان عەرەبترە و، لە بەعسیەکان بەعسیترە. طەها لە پێشەوە باسی کەم بارانیی ئەو ساڵەی کرد، ئینجا وتی: «(اخ جلال) گلەیی لە من کردوە گوایە من دژی گفتوگۆم. ئەوە ڕاست نیە، چونکە من (عنصر) ێکی (اساسی) م لە قیادەی حیزب و دەوڵەت دا. من دژی گفتوگۆ نەبوم، ئەگەر من دژی گفتوگۆ بومایە نەئەبو. من سەیری لیستەی هەمو ئەوانەم کرد کە لە سەرەتای دەسپێکردنی حیوارەوە مقابلەیان کردوم یەک کوردیان تیا نەبو. ئەوەی ئەو هەواڵەی بۆ بردوە هەقە سەد نیشانەی پرسیاری لە سەر دابنێ.» بە خەیاڵی خۆی هەر کورد جێگەی گومانە هەواڵ بە سەرکردایەتی یەکێتی ئەگەیەنێ.

ئینجا لێ ی پرسین کە ئاخۆ چوین بۆ گەڕانێ ناو شاری بەغداد، وتمان: «هەندێکیمان بینی» وتی: «وەکو بینیتان بەغداد زۆر پێشکەوتوە، گۆڕانی زۆری تێ دا بوە، ئەو مەعلوماتانەی ئێوە لە ڕادیۆکەی خۆتانەوە بلاوتان ئەکردەوە ڕاست نەبو!» منیش وتم: «ئێمە هەرگیز باسی دواکەوتنی بەغدادمان نەکردوە، باسی نەبونی ئازادیمان کردوە. بینای بەرز و جادەی فراوان نابنە بەڵگەی بەختیاری و خۆشیی ژیانی خەڵک.» لە ناو هەمو ئەوانەدا کە دیمان طەها جەزراوی لە هەمویان کەمتر موجامیل بو، ئێستاش لام وایە بۆ ئەوە بو ئیسپاتی بکا: حەزی لە چارەی کورد نیە.

پێش نیوەڕۆی ٣٠ ی کانونی دوەم سەردانی سەعدون شاکیرمان کرد، سەعدون وەزیری کاروباری ناوخۆ بو. پاش نیوەڕۆکەی بردینیان بۆ سەیری (نصب الشهید) و (الجندی المجهول) کە دو دامەزراوی تازە دروستکراو بون. بە ڕێگاوە بوین بەرەو (نصب الشهید) لە ترافیک لایتی چوارڕێیانێک دا وەستا بوین. مورافیقەکەمان سەرنجی ڕاکێشاین بۆ ئۆتۆمۆبیلێکی مارسیدس لەوبەر ڕاوەستا

بو، ئەویش چاوەڕوانی گـۆڕانی ڕەنگی لایتـەکـانی نەکـرد، وتی: «بڕوانە ئەوە سەرۆکە!» صـەددام خـۆی ئۆتۆمـۆبیلەکەی لێ ئەخـوڕی، منالێکی لە تەنیشـتـەوە دانیشت بو. حەرەس و حیمـایەی لە گەڵ نەبو. نازانم ئەمە ڕێکەوت بو یان شانۆ سازی، ئێمە زۆر جار لە تەعلیقەکانی ڕادیۆکەمان دا وت بومان: جەبان ئەو کەسەیە کە بە بێ فەوجێ حیمایە ناوێرێ هاتوچۆ بکا!

ڕۆژی ۳۱ ی کانونی دوەم بۆ دواجار لە گەڵ فـاضیل بەڕاک دانیشـتینەوە. ئیتر خۆمان ئامادە کرد بگەڕێینەوە. گەڕاینەوە ئاوەژێ.

لەم سەفەرەدا دەسکەوتی سیاسیمان نەبو، بەڵام زۆری گیراوەکان بەر دران و، چەردەیەک پارە کـە بڕیار بو مـانگانە بیـدەن بە یەکـێـتی، لە گـەڵ ۹ لانـکرۆز و مـارسـیـدسی تازەیان وەکـو دیاری صـەددام داینێ لە گـەڵ خـۆمـانی ببـەینەوە بۆ ڕاپەڕاندنی ئیشوکاری سەرکردایەتی یەکێتی. ئێمە پێویسـتیمان بە سەییارە نەبو، ئەوەندەمان سەییارە لە حکومەت گرت بو، لێمان زیاد بو.

*

لە ماوەی گفـتوگۆکانی یەکـێـتی - بەعس دا چەند هەڵـەیەکی تەکنیکی، کە زۆر زیانبەخش بون، دوبارە ئەبونەوە، لەوانە:

۱. هەمو جارێ هەندێ لە ئەندامانی وەفدی یەکێتی ئەگۆڕان، ئەمەیش بۆ ئەوە نەبو کە وەفدەکەیان پێ بە هێز بکرێ و، ئەندامە تازەکانی وەفدەکە بەشداری فکری و سیاسی و قانونی لە گفتوگۆدا بکەن، بەڵکو بۆ ئەوە بو بای باڵی خۆیان بدەن و، سود لە شوێنی حەسانەوە وئیمتیازاتی وەفدەکە وەر بگرن.

۲. هەمـو جـارێ وردەکـاری گـفـتـوگـۆکـانی ناو کـۆبونەوەکـان بێ پەروا بڵاو ئەکـرانەوە. بە تەلەفـۆن و بێـتـەل، لە کـۆبونەوەی داخـراو و کـراوەدا باس ئەکـران. ئەمەیش وای ئەکرد دوژمنەکانی گفتوگۆ لە لایەک و لایەنی حکومەتی لە لایەکی ترەوە، هەمو کارتەکانی یەکێتی بخوێننەوە و تاکتیک و پلانەکانی بزانن و نەخشەی تێکدانی دابنێن.

۳. شـوێـنی ژیانی ئەندامـانی وەفـدی یەکـێـتی لە لایەن حکومـەتەوە دیاری ئەکرا. بە زۆری لە کۆشکەکانی دەزگا ئەمنییەکان دا دائەنران. ئەو شوێنانەیش هەمو (لاقطە) یان تێ دا چێنرا بو. وەفـدەکـان لە ناو خـۆیان دا ئازادی قسـەکـردن و ئاڵوگـۆڕی بیـروڕایان نەبو، چونکە هەمو قسـەکـانیـان تۆمـار ئەکرا و گـوێ ی لێ ئەگیرا.

*

لایەنەکانی جود باسی "اتفاقیە" صدام - طالبانی "المذلە" و "الخیانیە"..
یان نەکرد. هەواڵەکانیان وەها نەگێرایەوە وەکو هەمو شت لە نێوان یەکێتی و بەعس
دا برابێتەوە، لە کاتێک دا لە نێوان یەکێتی - بەعس دا هیچ جۆرە ڕێککەوتنێکی
نوسراو یا نەنوسراو نەبو جگە لە ڕاگرتنی شەڕ، لە سەر هیچ مەسەلەیەکیش لە یەک
گەیشتن نەبو، بیروڕاکان جیاواز بون، لە ئاسۆی نزیکیش دا هیچ هیوایەکی لە یەک
گەیشتن نەمابو. بەڵام ناحەزەکانی یەکێتی، ئەیانویست ئەم باسە بۆ زڕاندنی
ناوبانگی یەکێتی و، شکاندنی ڕادەی ڕاستگۆیی یەکێتی، لە لای دۆستەکانی، بە
کار بهێنن.

حشع و لایەنەکانی جود لەم هەرایە مەبەستیان ئەوە بو: یەکێتی وەکو
ڕێکخراوێکی بێ بیروباوەڕی هەلپەرست پیشان بدەن، کە ڕێبازێکی سیاسی
سابیتی نیە و، هەمیشە لە گۆڕینی هەڵوێست و ئەمبەر و ئەوبەر دایە: جارێک لە
گەڵ ئەسەد و، جارێک لە گەڵ خومەینی و، جارێک لە گەڵ صەددامە..

جارێکیان کاربەدەستێکی ئێرانی هەمان باسی لە گەڵ کردم. کابرا وتی:
«ئێوە جەماعەتێکن لە سەر ڕێبازێکی سابیت قەرار ناگرن، هەر جارەی لە گەڵ
لایەکن و دژی لایەکن!»

وتم: «ئێمە تەلاقمان بۆ هیچ دەوڵەتێک نەخواردە هەتا هەتایە و لە هەمو
زروف و زەمانێک دا لە گەڵی بین. ئێمە دیفاع لە بەرژەوەندی گەلەکەمان ئەکەین.
بە پێ ی گۆڕانی هەڵوێستی دەوڵەتەکان هەڵوێستی ئێمەیش ئەگۆڕێ، بەرژەوەندی
گەلەکەمان لە گەڵ هەر دەوڵەتێ کۆک بێ لە گەڵی ڕێک ئەبین و، لە گەڵ هەر
دەوڵەتێ ناکۆک بێ لە گەڵی ناکۆک ئەبین. قازانجی گەلی کورد هۆی سەرەکی
سوڕانی ئێمەیە نەک دڵسۆزی بۆ فلان دەوڵەت، یا دەسکەوتی حیزبی یا قازانجی
عەشیرەتی و تایبەتی.»

لە لای من ئەمە بیانو هێنانەوە نەبو بۆ پاساودانی گۆڕینی بەردەوامی
هەڵوێستی یەکێتی، وەکو ناحەزەکانی ئەیانوت، بەڵکو ڕاستیەکی تاڵ بو، کە
زادەی هەلومەرجی نالەباری لایەنی سیاسی و جوگرافی گیروگرفتی کوردی عیراقە.
ئەگەر حکومەتی عیراق مافی نەتەوەیی کوردی بسەلماندایە چ قازانجێکی کورد
لەوەدا نەبو یەکێتی لە گەڵ سوریا یا ئێران هاوکاری بکردایە بۆ ڕوخاندنی ڕژێم لە
بەغداد.

*

*

رۆژی ۲ ی شوبات، لە بەغدادەوە بە ئۆتۆمۆبیل بەڕێ کەتین. لە کەرکوک لە بارەگای لجنەی تنسیق وچانێکی کورتمان دا، لەوێوە گەڕاینەوە ئاوەژێ.

دو مانگ بو بە ئاشکرا گفتوگۆ دەستی پێ کرد بو، بەڵام هیچ ئەنجامێکی باشی لێ دەرنەکەت بو. خەڵک چاوەڕوان بون ڕێکەوتننامەی یەکێتی - بەعس بخوێنرێتەوە. داوودەزگای بەعس لە کوردستان بپێچرێتەوە. دەزگا سەرکوتکەرەکان لە کوردستان نەمێنن. خەڵک لە سەربازی و جەیشی شەعبی ببەخشرێن. بەعسیش ئەیویست دەسەڵاتی خۆی لە کوردستان دا بەهێزتر بکات و، کەڵک لە گفتوگۆی ئاشتی وەربگرێ، بۆ ئەوەی هێزی مرۆیی کوردیش بخاتە ناو جەنگەوە.

داوودەزگای پرۆپاگاندەی حیزبەکانی جود کە لە ئێران بون، توشی هیستیریا بوبون، هێرشەکانیان بۆ سەر یەکێتی و مامجەلال و سەرکردەکانی تری گەیشت بوە ئەوپەڕی ڕادەی نزمی. ئەم پرۆپاگەندانە لە ناو خەڵک دا دەنگی ئەدایەوە و، کاری ئەکردە سەر بنکەکانی یەکێتی. هۆی ڕاستەقینەی ئەم هێرشانەش ئەوە نەبو، کە ئەوان بە تەنگ بەرژەوەندییەکانی کوردەوەن و، یەکێتی فرۆشتویەتی، بەڵکو لە پلەی یەکەم دا ئەوە بو، ئەترسان ڕێککەوتنێکی وەکو ۱۱ ی ئازاری ۱۹۷۰ دوبارە ببێتەوە، یەکێتی بەهێز ببێ و، ئەوان بپوکێنەوە. ترسەکەیشیان لە جێگەی خۆی دا بو.

لە ڕۆژانی ٢٤ - ٢٦ ی شوبات دا کۆبونەوەی کۆمیتەی سەرکردایەتی کرا. بە دوای ئەمەش دا دو کۆبونەوەی جیاواز بە کادرە پێشمەرگەیی و کادرە ڕێکخراوەییەکان کرا. مەبەست لەم کۆبونەوانە ڕونکردنەوەی هەلومەرجی گفتوگۆ و، وەرگرتنی بیروڕای کادرەکان بو. ئێمە گوشارێکی زۆری لایەنگرانی یەکێتی و کۆمەڵانی خەڵکمان لە سەر بو. تەنانەت هەندێ لە ئەندامانی سەرکردایەتی و لە کادرەکان (عەنتەرییات) یان ئەنواند، کە ئێمە لە خەبات ماندو بوین و گوایە ئەوان ماندو نەبون.

ڕاستییەکەی ئەوە بو: لامان وابو ئەو هۆیانەی پاڵیان پێوە نابوین بۆ گفتوگۆ، وەکو خۆیان ما بون و، تەرازوی هێز بە قازانجی یەکێتی نەگۆڕا بو. لە بەر ئەوە جارێ هیچ دەرەتانێکمان نیە جگە لە درێژەدان بە گفتوگۆ، هیچ کارتێکیشمان بە دەستەوە نەبو لە بەرامبەر بەعس دا بە کاری بهێنین، جگە لە شەڕکردنەوە، لەو حاڵەتەش دا ئەبو خۆمان بۆ هەڕەشەکانی طاریق عەزیز ئامادە بکەین.

*

*

موسلّ

ئەو مـــاوەیە هەمـــو ڕۆژێ بە دەیان و بگرە بە ســەدان کــەسم ئەبینی ئەبو دەربارەی ڕەوتی گفتوگۆ وەلامی پرسـیارەکانیان بدەمەوە. ئەو پرسـیار و وەلامانەش ئەوەندە دوبارە ئەبونەوە و، ئەوەندە ناخـۆش بون، گـەیشـتبـومـە لێـواری کـەوتن. ڕۆژێکیـــان دۆســتــێکم لە هەولێـــرەوە هات. ئەویش هەر بۆ دەنگوباس هات بو. ئەمهێشت قسە دابەزرێنێ وتم: «کەست لە گەڵە؟» وتی: «نەخێر». قاتێ چاکەت و پانتـۆڵم دایە دەستی وتم: «ئەمـە ببە و ئۆتۆمـۆبیلەکەت ببە پەنایەکی نەبینراوەوە، منیش تۆزێکی تر دێمە لات.» چوم ئیزنم لە مامجەلال خواست و ئاگادارم کرد چەند ڕۆژێ خـۆم ون ئەکـەم. ڕۆیشـتم بۆ لای دۆسـتـەکـەم. هەر لەوێ دا جلەکـانم گـۆڕی و چاکەت و پانتۆڵم لە بەر کرد. وتم: «لێخورە بۆ هەولێر!»

لە هەولێر چوینە ماڵی ئەوان و کۆسرەتمان ئاگادار کرد. هەندێ جار حەز ئەکەم بە تەنها بم و، لەو تەنیاییەدا ئەحەسێمەوە. کۆسرەت ماڵەکەی خۆیانی بۆ چۆڵ کردم و گـواسـتـمـەوە ئەوێ. جـاروبار کـابرای دۆستم یا کـۆسـرەت ئەهاتن خـواردنیـان بۆ ئەهێنام ئەگینا وەکو تر چەند ڕۆژێ تاک و تەنها و بێدەنگ لە ژورەوە بوم. پشـوم دا و حەسامەوە.

لە گـەڵ کـۆسـرەت بە دوقـۆڵی سـەردانی دهۆکـمـان کـرد و ڕۆژێکیش چوین بۆ مـوسلّ. لە موسلّ چوینە لای دکـتـۆرێکی دان. لە مـێژ بـو دەمـودانم پاک نەکـردبوەوە. دەمودانم پاک کردەوە. پیاسەیەکی درێژمان بە بازاڕ و شەقامەکانی موسلّ دا کرد. بە تەما بوم ئەو شەوە لەوێ بمێنمەوە. ئێوارەکەی چوین بۆ سەیری زیندانەکەی موسلّ کە (ردهە الاعـدام) ی لێ بو، پاشان چوین بۆ سـەیری ئەو گۆڕستـانەی خنکێنراوەکانیـان تێ دا ئەناشت. خـنکێنراوەکان کـورد و بە زۆری ئەندام و پێشـمـەرگەی یەکـێتی بون. بەعس بێ حورمەتیەکی زۆری بەم گۆڕسـتـانە کرد بو. چەند لاشەیەکی لە یەک گۆڕدا شـارد بوەوە. کێلەکانی هەمـو شکاو و کەلوکۆم بو. کەسـوکاری قـوربانیـەکان لە سەر هەندێ لە کێلەکان ناوی کوڕەکانیان نوسی بو. گۆڕستانەکە پەرژین نەکرا بو. لە بەر ئەوە سـەگ و ئاژەڵ و ولاخ ئەهاتە ناوی. کـە ئەو دیمەنەم دی ئیـتـر هیچ ئارەزویەکم ئەمـا لەو شـارەدا بمێنمـەوە. یەکـســەر گـەڕاینەوە هەولێـر و لەوێشـەوە بۆ ئاوەڕێ. بەعـسـیـەکـان ئەیانوت: «الکردی الجـیـد هو الکردی المیت» کەچی بە مردویەتیش ڕێزیان لێ نەگرت بون.

*

*

عەسکەری فیرار

لەو چەند مانگەدا یەکێ لە گیروگرفتە گەورەکانی ئێمە، مەسەلەی عەسکەری فیرار و جەیشی شەعبی بو. دەیان هەزار عەسکەری فیرار لە ناو شارەکان دا ئەسوڕانەوە، جاروبار بەر پەلاماری مەفرەزەکانی بەعس ئەکەوتن و ئەگیران. کەسوکاریان ئەهاتنە سەر ئێمە و داوای ئازادکردنی کوڕەکانیان ئەکرد. ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی یەکێتی ئازاد بو، ئەوان ئەیانتوانی بە ئازادی و بە بێ ترسی ڕاونانی مەفرەزەکانی بەعس لەو شوێنانەدا بژین، بەڵام ئەمانە گەنجی تازە پێگەیشتوی شاری بون، لە دێهات هەڵیان نەئەکرد.

مەفرەزەکانی بەعس سەربازە گیراوەکانیان ئەناردەوە یەکەکانی خۆیان، ئەگەر یەکەم ڕاکردنی بوایە پاش ماوەیەک زیندانی ئەیانکردەوە بە سەرباز و، ئەگەر لەوانە بوایە لە شەڕ هەڵات بێ، گوللەبارانیان ئەکرد.

ڕۆژی ٧ / ٣ / ٨٤ لە سلێمانی ١٦ سەربازی هەڵاتویانْ گوللەباران کرد. ئەم تاوانە بیروڕای گشتی خەڵکی وروژاند. لەوەوپێش زۆر کەسی کەیان گوللەباران کرد بو، کەس گلەیی لە یەکێتی نەئەکرد، چونکە هیچ پێوەندییەکی لە گەڵ عیراق نەبو، بەڵام ئێستا خەڵک بە گشتی، گلەییان لێ ئەکرد چونکە لە کاتی گفتوگۆدا بو. یەکێتی جگە لەوەی ناڕەزایی لای لجنەی تنسیق دەربڕی، ڕۆژی دوایی یەکێتی بەیانێکی دەرکرد، هێرشێکی توندوتیژی کردە سەر داوودەزگاکانی بەعس.

ڕۆژی ٩ / ٣ / ٨٤ (مجلس قیادە الثورە) بە بروسکە فەرمانی دا بە داوودەزگاکانی سلێمانی گوللەبارانی عەسکەری فیرار ڕابگرن.

ناحەزەکانی یەکێتی، بە تایبەتی جود، ئەمەیان کرد بە بیانو بۆ هێرشی زۆرتر بۆ سەر یەکێتی و، تاوانبارکردنی بە هاوکاری لە گەڵ بەعس، بۆ ڕاونانی عەسکەری فیرار. ئیتر هیچ سەربازێکی کوردیان گوللەباران نەکرد، تا گفتوگۆ کۆتایی پێ هات.

جەیشی شەعبی

عیراق بۆ سازدانی هێزی مرۆیی دانیشتوانی عیراق، هەمو ئەوانەی لە تەمەنی سەربازی دا بون، کرد بو بە سەرباز، بەڵام ئەوی لەم تەمەنە بەرەوژورتر بو، یا لە بەر هەر هۆیەک نەکرا بو بە سەرباز، بە زۆر ئەیان کردن بە جەیشی شەعبی. ماوەیەک ژنیشیان ئەکرد بە جەیشی شەعبی.

دوای دەس پێ کردنی گفتوگۆ، بەعس لە کوردستان دا درێژەی بەم کارە دا. ئەمەش دیسان گیروگرفتێکی گەورەی بۆ دروست کرد بوین. خەڵک نەیئەویست ببێ

بە جەیشی شەعبی و، بەعس زۆری لێ ئەکردن و، دەرگای گوزەرانی لێ دائەخستن. لە بەر ئەوە داوایان ئەکرد یەکێتی لەم گێچەڵە بیانپارێزێ.

ئەو جارەی من چوم بۆ بەغداد، ڕۆژێکیان ئەبو سەرحان بە ئۆتۆمۆبیل بردمی بۆ گەڕان. لە ڕێگا ئەم کێشەیەم لە گەڵ باس کرد. ئەویش نوکتەیەکی بۆ گێڕامەوە. لێرەدا وەکو خۆی ئەینوسمەوە:

وتی: «دانیشتوانی سەرئەرز، بە هۆی بێدادی و زوڵم و زۆرەوە، سکاڵا ئەبەنە لای خوا. خوا بۆ لێکۆڵینەوەی سکاڵای بەندەکانی خۆی ئەنێرێ بە دوای پێغەمەرەکانی دا. موسا، عیسا، محەمەد ئامادە ئەبن. خوا داوایان لێ ئەکا هەر یەکەیان بچێتە ناو ئومەتەکەی خۆیەوە بۆ لێکۆڵینەوە لە شکاتەکانیان.

موسا لە ناو جولەکە دا، عیسا لە ناو مەسیحی دا، محەمەد لە ناو موسوڵمان دا، دەس ئەکەن بە گەڕان و لێکۆڵینەوە. پاش ماوەیەکی کورت عیسا لێکۆڵینەوەکانی خۆی تەواو ئەکا ئەگەڕێتەوە ڕاپۆرتی خۆی پێشکەش ئەکا. دوای ئەو بە ماوەیەک موساش ئەگەڕێتەوە ڕاپۆرتی خۆی پێشکەش ئەکا. بەڵام محەمەد هەر دەرناکەوێ چەند مانگێ تێ ئەپەڕێ بێ ئەوەی هیچ هەواڵێکی هەبێ. ئەمجارە هەندێ لە فریشتەکانی ئەنێرێ بۆ سەر ئەرز بۆ سۆراخی محەمەد، دوای چەند مانگ گەڕان ئینجا محەمەدیان دۆزییەوە. سەیریان کرد محەمەد لە عیراق کراوە بە جەیشی شەعبی و ڕاستەوخۆ بردویانە بۆ جەبهە.»

وتی: «کاکە باسی چی ئەکەی، لە عیراق تەنانەت محەمەدول مستەفایش عەفو ناکرێ، ئەبێ بچێ بۆ جەبهە!»

ئەمە ئەکرێ بکرێ بە پێوانەی ڕادەی سازدانی هێزی مرۆیی عیراق لە سالانی جەنگ دا.

*

کێشەی جاش

یەکێ لەو کێشانەی ڕۆژانە توشمان ئەبو. کێشەی شەڕی جاش و پێشمەرگە بو. ڕاگرتنی شەڕ هەروەکو جەیش و پێشمەرگەی ئەگرتەوە، ئەبو جاش و جەیشی شەعبی یش بگرێتەوە. جاشەکان کە لە ڕاوکردنی پێشمەرگەدا دەورێکی گەورەیان هەبو، هەمو ئەناسران و بە بەرچاوەوە بون، لە کاتێک دا جەیش کە هێزی سەرەکی شەڕی پێشمەرگە بو ئەناسراو بون، بە گوێرەی دیسیپلینی سەربازی ئەجوڵانەوە.

ئەو ماوەیە پێشمەرگە ڕژا بونە شارەکانەوە و، بە جادە گشتییەکان دا هاتوچۆیان ئەکرد، زۆر جار جاش و پێشمەرگە توشی یەک ئەهاتن و ئەبو بە شەڕیان.

[illegible]ڕولا ئەکوژران. هەندێ لە فەرماندەی تیپەکان بێ ئەوەی ئەنجامی کارەکە لێک بدەنەوە، شەڕیان بە جاش ئەفرۆشت و بۆسەیان بۆ ئەنانەوە. جاری وا هەبو فەرماندەی کەرتێ، یا فەرماندەی مەفرەزەیەک، لە پەناوە جاش، جەیشی شەعبی، سەربازیان ئەکوشت، تەنیا بۆ ئەوەی چەکەکەی، یان ئۆتۆمۆبیلەکەی ببەن. جاشەکانیش لە تۆڵەی ئەمەدا لە جێگەیەکی کە بۆسەیان بۆ پێشمەرگە ئەنایەوە، کۆمەڵێ پێشمەرگەی بێ ئاگای تێ ئەکەوت و، بە خۆڕایی ئەکوژران.

ڕۆژی ٣١ ی مارت تاقمێ پێشمەرگە کە لە سلێمانیەوە بەرەو سورداش بەڕێوە بون، کەوتنە یەکێ لەم بۆسە کوێرانەوە، شێخ عەلی و ٣ پێشمەرگە بریندار بون و، تۆفیقی حاجی کە یەکێ لە کادرە باشەکانی حشع و، تازە ڕیزی ئەوانی بە جێ هێشت بو کوژرا.

ئۆباڵی سەرەکی لەم بێ دیسیپلینیەی پێشمەرگەدا ئەکەوتە ئەستۆی سەرکردایەتی یەکێتی، چونکە خۆی هیچ ئەرمییەکی لە گەڵ جاش و بەعسیەکانی کوردا نیشان نەدا، چاوپۆشی لە موخالەفەی پێشمەرگەکانی ئەکرد و، لە سەر ئەو بەرەڵاییەی ئەیان نواند لێ ی نەئەپرسینەوە. بەمجۆرە یەکێتی جاشەکانی ترساند و، وای لێ کردن بە هیچ جۆرێ لە یەکێتی نزیک نەبنەوە، بەڵکو بۆ دابین کردنی پاشەڕۆژی خۆیان، زۆریان پەیوەندییان لە گەڵ لایەنەکانی جود دامەزراند.

*

ئەم ٣ کێشەیە: عەسکەری فیرار، جەیشی شەعبی، جاش، لە سەرەتای دەس پێ کردنی گفتوگۆوە ڕو بە ڕومان بونەوە. زۆری کاتی لوجنەکانی تنسیق و، بەشێکی کاتی دانیشتنەکانی وەفدەکانی حکومەت و یەکێتی، بەم گیروگرفتانەوە ئەکوژران. خەریک بو ئەم ڕوداوە لاوەکیانە زاڵ ئەبون بە سەر لایەنی سیاسی گفتوگۆکەدا.

*

ئەورۆزی سورداش

بۆ ئەوەی گیان بکەینەوە بە بەر گفتوگۆکەدا ڕۆژی ١٦ ی مارت مام جەلال بۆ جاری دوەم چوەوە بۆ بەغداد، بەڵام ڕۆژی ١٩ ی مارت گەڕایەوە سورداش بۆ بەشداری لەو کۆبونەوە گەورەیەدا کە بە بۆنەی ئەورۆزەوە لە لایەن یەکێتیەوە ڕێک خرا بو.

ڕۆژی ئەورۆز سەدان هەزار کەس لە سەرانسەری کوردستانەوە هات بون بۆ سورداش. تا ئەو کاتە لە مێژوی کوردستانی عیراق دا قەرەباڵغی وا گەورە کۆ

نەبوبوەوە. خەڵک هەمو بە هیوای ئەوە بون ئیتر شەڕی کوردستان تەواو ببێ و، کۆتایی بە چەوسانەوەی بەعسی بێت. ئەم کۆبونەوەیە نیشاندەری ئەوە بو کە خەڵک گفتوگۆیان پێ چاکترە لە شەڕ.

وتاری سەرەکی لە کۆبونەوەکەدا مامجەلال خوێندیەوە. وتارێکی درێژ و هەمەلایەنە بو، باسی ڕەوتی گفتوگۆ و خواستەکانی کوردی کرد، بەڵام لە هەمو شت زیاتر پێ ی لە سەر ئاشتبونەوەی گشتی داگرت. هەمو لایەنەکانی بانگ کرد بۆ ئاشتی و تەبایی و، چارەسەر کردنی ناکۆکیەکان بە گفتوگۆی هێمنانە.

ڕۆژی نەورۆز هەمو پێشمەرگەکانم ئیزن دا و، خۆم بە تەنیا چوم بۆ ناو قەرەباڵخیەکە بۆ گەڕان. حسێن سنجاری، کە تازە لە ئەوروپاوە گەڕابوەوە، ئەویشم لە گەڵ بو. ئەورۆژە لە گەڵ هەزاران کەس، ناسیاو و نەناسیاو، کچ و کوڕ، ژن و پیاو، گەورە و پچوک، جەژنە پیرۆزە و، چاک و چۆنی و قسەم کرد. زۆرم پێ خۆش بو کە ئەمبینی ئەو خەڵکەی لەو دەشتە فراوانە دا کۆبوبونەوە، هەمو دلشاد و خۆشحاڵ، بە جوانترین جل خۆیان ڕازاند بوەوە و، خۆشترین خواردنیان لە گەڵ خۆیان هێنا بو. کۆسرەت ئەو کاتە لە ناوشار لێپرسراوی ڕێکخراوی هەولێر بو. ئەویش بە ماڵەوە هات بو. نانم لە گەڵ ئەوان خوارد و، هەندێ پیاسەمان بە یەکەوە کرد.

هەوڵی ئاشتبونەوە

یەکێتی بە ڕاستی ئەیویست لە گەڵ لایەنەکانی جود ئاشت بێتەوە و، کێشەکانیان لە گەڵ چارەسەر بکا. دوای ئەم بانگەوازە ئاشکرایە، چەند هەوڵێکی تری ژێر بە ژێر درا. ڕۆژی ١٦ / ٤ / ٨٤ جارێکی تریش فەرەیدون دارتاش و محەممەد حەمە باقی چون بۆ برادۆست بۆ بینینی بەرپرسەکانی حشع. ئەمجارەیش هیچ ئەنجامێکی نەبو.

لە هەمان کات دا م س نامەی بۆ پدک نوسی و بۆی نارد بۆ ڕاژان، بەڵام نەک هەر وەڵامی ئیجابی نەدرایەوە بەڵکو کۆپی نامەکە گەیشت بوەوە دەزگا جاسوسیەکانی عیراق.

حشع و پدک و لایەنەکانی تری جود، وایان زانی بو ئەم هەوڵەی یەکێتی لە بەر لاوازیەتی، بە تایبەتی هەواڵی جموجوڵی ئەوانەیان بیست بو کە خەریکی دروستکردنی ئالای شۆڕش بون.

لە دەرەوەش چەند کەسایەتیەکی بێلایەنی کورد هەوڵێکی تریان لە گەڵ مەسعود دا بو، بۆ ئاشتکردنەوەی یەکێتی و پارتی. مەسعود چەندین مەرجی پێشەکی دانابو. لەوانە داوای کرد بو: یەکێتی پەیوەندی لە گەڵ عیراق ببڕێ،

هەنگاوانی ئێمەش، لە بەرامبەر مەرجە پێشەکیەکانی ئەو دا، داوایان کرد بو ئەویش پەیوەندی لە گەڵ ئێران ببڕێ. ئەم هەوڵەش سەرکەوتو نەبو.
جود لە بن دەسەڵاتی ئێران دا بون، بە بێ ڕەزامەندی ئێران نەیانئەتوانی لە گەڵ یەکێتی پێک بێن. ئێرانیش یەکێتی بە دوژمن دائەنا، لە بەر ئەوە هەر هەوڵێ بۆ ئاشتبونەوە ئەدرا سەری نەئەگرت. یەکێتی بۆ ئەوەی لە گەڵ جود پێک بێ، ئەبو لە پێش دا لە گەڵ ئێران پێک بێ.

*

کێشەی خوێندکاران

لە مانگەکانی مارت و نیسان و مایس دا مامجەلال بۆ درێژە پێدانی گفتوگۆ چەند جارێ ئەچوە بەغداد و ئەگەڕایەوە کوردستان. لەو خولانەی گفتوگۆ دا عیززەت دوری سەرۆکی وەفدی حکومەت و، طاریق عەزیز، عەلی حەسەن مەجید، فاضیل بەڕاک، مەحمود شوکر شاهین.. ئەندامی وەفدەکە بون.
یەکێ لەو دیاردانەی سەرنجی ڕائەکێشا ئەوە بو، هەرچەند مامجەلال ئەچو بۆ بەغداد، هەلومەرجی کوردستان ئاڵۆز و گرژ ئەبو.
ڕۆژی ١٢ ی مایس خوێندکاران لە سلێمانی کەوتنە مانگرتن و خۆپیشاندان لە بەردەمی محافظەدا. بو بە تەقوتۆق. ٣ خوێندکار کوژران. بۆ ڕۆژی دوایی قەرەباڵخیەکی زۆر لە بەردەم بارەگای جەیشی شەعبی دا کۆ ئەبێتەوە. ئەبێ بە شەڕ لە نێوان جەیشی شەعبی و خۆپیشاندەران دا. پێشمەرگەی یەکێتی بۆ پشتیوانی لە خۆپیشاندەران تێکەلاوی شەڕ بون. زیاتر لە ٢٠ جەیشی شەعبی بە زیندویەتی لە سەربانی بارەگاکەوە هەڵدرا بونە خوارێ. لەو کاتەدا مامجەلال لە بەغداد بو.
صەددام پێ ی وت بو: «لە سلێمانی شتێکی وا ڕوی داوە، من ئەمهێشتوە ئیجرائات وەربگیرێ، بۆ ئەوەی گفتوگۆ تێک نەچێ، چونکە ئەزانم سلێمانی شاری یەکێتیە، ڕوداوی وەها، لە سلێمانی نەبوایە و لە کاتی گفتوگۆ دا، لە هەر شارێکی تر بقەومایە شارەکەم لە دەریای خوێن دا نقوم ئەکرد.»
ڕۆژی ١٨ ی مایس مامجەلال گەڕایەوە سورداش. بەعس لای وابو: ئەوەی یەکێتی لە سەردەمی شەڕدا بە شەڕ پێ ی نەکراوە، ئەیەوێ لە ژێر سایەی ئاشتی دا جێبەجێ ی بکا. بێ باوەڕی و نائومێدی لە گفتوگۆ لە لای هەردولا دروست بوبو. هەم صەددام و هەم عیززەت دوری ئەمەیان لای د. قاسملو باس کرد بو. سەرەتای حوزەیران د. قاسملو لە بەغدادەوە هاتە لامان و، نیگەرانی ئەوانی پێ ڕاگەیاندین. بەڵام بەعس لەو کاتەدا ترسی هێرشی ئێرانی هەبو، نەیئەویست جارێ لە شەڕەوە

بگلێتەوە لە گەڵ یەکێتی.

*

لەو ماوەیەدا من زنجیرەیەک وتارم لە ژێر ناوی: «عیراق و مەسەلەی کورد»ا نوسی، ویستم بیروڕاکانی بەعس کە لە کاتی گفتوگۆ دا تێیان گەیشت بوین بۆ خەڵک رون بکەمەوە. ڕادیۆی یەکێتی، لە ڕۆژانی ١ تا ٨ ی حوزەیران دا بە کوردی و بە عەرەبی بڵاوی کردەوە و، بە کۆکراوەییش لە دو نامیلکەی سەربەخۆ دا، بە کوردی و بە عەرەبی، چاپ کرا. لە بەر ئەوەی هەندێ لەو باسانە تا ئێستاش جێگەی ناکۆکین لە نێوان کورد و بەعس دا، لێرەدا دەقاودەق ئەیان نوسمەوە.

- ١ -

عیراق و مەسەلەی کورد

ئەگەرچی مێژووی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، سەرگروشتە و داستانی چەندین ئیمپراتۆریەت و پاشایەتی و خەلافەت و سەڵتەنەتی وەکو هەخامەنشی و ئەخمینی و ساسانی و ئیسلامی و ئەمەوی و عەبباسی و عوسمانی و صەفەوی و قاجاری... مان بۆ ئەگێڕێتەوە، بەڵام لە تاریخی کۆن و نوێ دا، هەرگیز مێژوی دەوڵەتێک بەدی ناکرێ، کە ناوی دەوڵەتی عێراق بوبێ.

ڕاستە کە پایتەختی دەوڵەتی عەبباسی لە شاری بەغداد بوە، بەڵام دەوڵەتی عەبباسی دەوڵەتێکی ئیسلامی پان و بەرین بوە هەر لە شیمالی ئەفریقاوە تا سنوری هندستانی گرتۆتەوە، بەڵام خەلافەتی عەبباسی لەقەوارە و قاڵب و ناوی دەوڵەتی عیراق دا نەبوە بەڵکو لە ژێر ناوی خەلافەتی عەبباسی و ئەمیرەلمونمینینی موسوڵمانانی دنیادا بوە.

عیراق بەم سنورەی ئێستای و، بەم پێکهاتنە نەتەوەیی و دینی و مەزهەبییەوە کە هەیە، دەوڵەتێکی تازەیە، قوولاییەکی مێژویی نیە، چونکە عیراق نەوەکو دەوڵەت و نە وەکو موستەعمەرەیەکی یەکگرتو، بەم سنورەی ئێستای و تەنانەت وەکو وڵاتێکی یەکگرتوش لە چوارچێوەی دەوڵەتی عوسمانی دا وجودی نەبوە، بەڵکو لە دوای ڕوخانی سەڵتەنەتی عوسمانیەوە، لە پاش جەنگی جیهانی یەکەم، کە دەوڵەتە ئیمپریالیستە گەورەکانی دنیا لە بەینی خۆیان دا ڕێک کەوتن لەسەر دابەشکردنی میراتی (کابرا نەخۆشەکە)ی عوسمانی، وە بە پێ ی تەرازوی هێزەکانی ئەو سەردەمەی دەوڵەتە گەورەکانی دنیا و ڕوداوەکانی ئەوسا، بۆ تەئمین کردنی بەرژەوەندییەکانی ئیمپریالیزم و کۆنەپەرستی، بێ گوێ دانە ڕەغبەت و ئارەزوی میللەتەکانی ناوچەکە و، بێ لێکدانەوەی هیچ ئیعتیبارێکی نەتەوەیی و

دینی، تەنانەت بێ گوێ دانە هیچ ئیعتیبارێکی ئینسانی، ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستیان بە گوێرەی قازانجەکانی خۆیان لەت و پەت کرد.

هەر ئەو زەمانەی ئەم ناوچەیەی تێدا لەت و پەت کرا، جولانەوەیەکی بەهێز لە سەرانسەری عەرەبستان دا گەشەی کردبو، لە پێناوی یەکخستنی ولاتانی عەرەبی و بەدیهێنانی سەربەخۆیی دا، تەنانەت شۆڕشی عەرەبی کە شەریف حسێن سەرکردایەتی نەکرد و ئینگلیز ڕاستەوخۆ یارمەتی نەدا، ئامانجی هەرە گەورەی سەربەخۆیی و یەکگرتنەوەی (مشرقی عربی) بو. هاوزەمان لە گەڵ ئەو جولانەوەیەدا، جولانەوەیەکی نەتەوەیی پەرەسەندوش لە کوردستان دا هەبو، کە ئینگلیز دوژمنایەتی نەکرد، لە پێناوی بەدەس هێنانی مافی ئازادی بڕیاردانی چارەنوسی خۆی دا لە سەربەخۆیی و ئازادی و یەکگرتنەوەی نیشتمانی گەلی کوردا.

ئەمە حەقیقەتێکی مێژوییە، بەڵگە تاریخیەکانی ناو ئارشیفەکانی دەوڵەتە زلەکانی ئەو سەردەمە و، ڕوداوەکانی ئەو زەمانە و، ڕەنج و خەبات و تێکۆشانی گەلانی کورد و عەرەب لەو قۆناغەدا، شاهیدی بۆ ئەدەن.

هەروەکو تێکچونی هاوسەنگیی تەرازوی هێزەکان لەبەینی دەوڵەتە سەرمایەدارە ئیمپریالیستەکانی دنیادا، لە ئەنجامی بەهێز بون و گەشەکردنی هەندێکیان و لاواز بون و گەشە نەکردنی هەندێکی تریان دا، بو بە هۆی ئەوەی سەر لە نوێ بیر لە دابەشکردنەوەی دنیا بکەنەوە بە سەر خۆیان دا و، لە ئەنجامی ئەمەیش دا جەنگی جیهانی یەکەم هەڵگیرسا. هەروەها تێکچونی ئەو وەزعەی لە پێش جەنگی جیهانی یەکەم دا هەبو وە گۆڕانی بە بارێکی تردا لە پاش کۆتایی جەنگ، بە جۆرێک کە ئەڵەمانیا شکا و سەڵتەنەتی عوسمانی پارچە پارچە بو، شۆڕشی ئوکتۆبەر بنچینەی ڕژێمی قەیسەری لە ڕوسیا هەڵتەکاند و، هەلومەرجێکی نوێ لە سەر ئاستی دنیا هاتە کایەوە، کە ئینگلیز و فەرەنسا و ئەمریکا وەکو ٣ دەوڵەتی زلی دنیا سەر لە نوێ دنیایان بەو جۆرە دابەش کرد کە لە گەڵ قازانجە ئابوری و سیاسی و ستراتیجیەکانی خۆیان دا ئەگونجا، بە تایبەتی لە مەسەلەی نەوت و بازاڕ و گەمارۆدانی دەوڵەتی تازە دامەزراوی سۆفیێتی دا، بۆیە لە سەر کەلاوەی دەوڵەتی عوسمانی، لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دا، چەندین ماندات (انتداب) و دەوڵەتۆکەی بێ سیادە و موستعەمەرەیان پێک هێنا، لەوانە: عیراق و سوریە و لوبنان و فەلەستین و ئوردون و عەرەبستانی سعودی و میرنشینەکانی خەلیج و، نەیان هێشت گەلانی ناوچەکە بە ئامانجە نەتەوەییەکانی خۆیان بگەن، بەڵکو لە بەینی دەسەڵات و نفوزی ئینگلیز و فەرەنسەدا دابەشیان کردن. لە وەش دا

کورد، یەکێک لە نەتەوەکانی ناوچەکە، نەک هەر بە ئامانجەکانی خۆی نەگەیشت، بەڵکو نەتەوە و نیشتمانەکەیان بەوپەڕی بێویژدانیەوە دابەش کرد، بەشێکی خرایە سەر دەوڵەتی ئێستای عیراق و مەسەلەی کورد بو بە یەکێک لە مەسەلە گرنگ و ئاڵۆزەکان.

عیراق دەوڵەتێکە لەو هەلومەرجەدا بە پێ ی ویست و ئارەزوی ئینگلیز پێک هات و، بەو جۆرەی کە ئیمپریالیزمی ئینگلیزی سنوری بۆ دیاری کردوە و، بەو جۆرەی کە خۆی شێوەی ڕژێم و حوکمڕانی تیا دانا، تەنانەت فەیصەڵی کوڕی شەریف حسین، کە خەڵکی حیجاز و لە سوریا دەرکرابو، هێنا و بە (مەلیک)ی سەپاند بە سەر عیراق دا.

لە بەر ئەوەی ئیمپریالیزمی ئینگلیزی لە دروستکردنی دەوڵەتی عیراق دا ئەوەندە بایەخی بە ئیرادە و ویستی دانیشتوانی ناوچەکە و، بە لێکدانەوەی ئیعتیباراتی نەتەوەیی و دینی و مەزهەبی نەداوە، ئەوەندەی بایەخی داوە بە مسۆگەر کردنی دەسکەوت و قازانجەکانی خۆی لە مەسەلەی پەترۆڵی و ئابوری و سیاسی و ستراتیجی دا، بۆیە شتێکی سەیر نیە، ئەگەر ئێمەش وەکو بەر لە چەن ساڵێک نوسەرێکی عیراقی وتویەتی بڵێین، عیراق ئەشێ پێی بوترێ: «مەتحەفی ئەجناس» چونکە:

لە نەتەوە دا، عەرەب و کورد و تورکمان و ئاسوری و ئەرمەنی و فارسی.. تێ دا بوە.

لە دین دا، موسوڵمان و مەسیحی و یەزیدی و جولەکە و سوبی.. تێدا بوە.

لە مەزهەب دا، سوننی جۆراوجۆر و شیعەی جۆراوجۆر و کەنیسەی جۆراوجۆری تێدا بوە.

ئینجا وڵاتێکی ئاوها کە «مەتحەفی ئەجناس» ی نەتەوەی جۆراوجۆر و دینی جیا جیا و مەزهەبی جیا جیا بێ و... بە بێ پرس و ئارەزو و ڕەزامەندی دانیشتوانی ناوچەکە خۆیان و، بە زۆر لە چوارچێوەی سنوری سیاسی یەک دەوڵەت دا کۆکرابنەوە، بێ ئەوەی یەکسانی و هاوتایی و هەبونی مافی وەکیەکی یان بۆ مسۆگەر کرابێ و، لە ناو ئەوانەش دا کەمایەتیەک، بە زۆر خۆی سەپاند بێ بە سەر هەمویان دا، بێگومان لە باتی ئەوەی ئارام و ئاسایش و ئیستقرار و گەشەکردن و پێشکەوتنی تێ دا بەدی بێ، هەمیشە هۆی تێکچون و پێکا هەڵپڕژان و شەڕ و شۆڕی تێ دا نەمێنێ و بە هێز نەبێ.

کاربەدەستانی عیراق هەر لە زەمانی هاشمیەکانەوە ئیدیعای ئەوەیان کردوە:

که خەڵکی عیراق بەشێکن لە نەتەوەی عەرەب و، ئەرزی عیراقیش پارچەیەکە لە نیشتمانی عەرەب، لە کاتێک دا ئەمە واقیعی دیمۆگرافی دانیشتوانی ئێستای عیراق و، لێکۆڵینەوەی ئارکیۆلۆجی شوێنەوارە کۆنەکانی سەرزەمینی عیراق و، مێژوی ڕوداوەکانی ناوچەکە و سەرژمێری ڕاست و دروستی دانیشتوان، ئەو ئیدیعایە نەک جارێک بەڵکو هەزار جار بە درۆ ئەخاتەوە، چونکە کورد لە عیراق دا سەرەڕای ساڵەهای ساڵی هەوڵی تواندنەوە و دەربەدەرکردن و دەرکردنی لە خاکی باوباپیرانی خۆی، هێشتا بە لایەنی کەمەوە (سێ - یەکی) دانیشتوانی پێک ئەهێنێ. وە لە ڕوی زەمانیشەوە، چەن هەزار ساڵ بەر لە هاتنی عەرەب لە گەڵ مەوجاتی سامی لە جزیرەی عەرەبیەوە بەرەو عیراقی ئێستا، گەلی کورد لە نیشتمانی ئێستای خۆی دا نیشتەجێ بوە. کەچی لە گەڵ هەمو ئەم ڕاستیانەدا کاربەدەستانی عیراق لە کۆنەوە وا ئیدیعا ئەکەن کە هەمو عیراق بەشێکە لە نەتەوە و نیشتمانی عەرەب، لە کاتێکدا کە ڕاستی ئەوەیە بەشێکی خەڵکی عیراق بەشێکن لە نەتەوەی عەرەب و بەشێکی وڵاتی عیراق بەشێکە لە عەرەبستان و، بەشێکی خەڵکی عیراق بەشێکن لە نەتەوەی کورد و بەشێکی وڵاتی عیراق بەشێکە لە نیشتمانی نەتەوەی کورد و، خەڵکی عیراق و وڵاتی عیراق پێکهاتون لە پێکەوەلکاندنی بەشێکی نیشتمانی کورد و بەشێکی نیشتمانی عەرەب.

جا ئەگەر مەسەلەی بە کار هێنانی مافی ئازادی بڕیاردانی چارەنوس و یەکگرتنەوەی نەتەوەی عەرەب، وەکو پرنسیپ (واتە مبدا)، لە ناو چوارچێوەی دەوڵەتی یەکگرتوی خۆی دا، مافێکی ڕەوای نەتەوەی عەرەب بێ، ئەوا بێگومان مەسەلەی بە کار هێنانی مافی ئازادی بڕیاردانی چارەنوس و یەکگرتنەوەی نەتەوەی کوردیش، وەکو پرنسیپ، لە ناو چوارچێوەی دەوڵەتی یەکگرتوی خۆی دا مافێکی ڕەوای نەتەوەی کوردە. هیچ کەس و تاقم و لایەنێک بۆی نیە ئەو مافە بۆ هەندێ نەتەوە حەڵاڵ و بۆ هەندێکی تر حەرام بکا.

ئەگەر بۆ عەرەب مافی ئازادی بڕیاردانی چارەنوس و یەکگرتنەوەی نەتەوەی عەرەب لە چوارچێوەی دەوڵەتێک دا حەڵاڵ بێ، بێگومان ئەبێ بۆ کوردیش وابێ.

وە ئەگەر بۆ عەرەب مافی حوکمڕانی و بڕیاردانی ئێستا و پاشەڕۆژی دەوڵەتی عیراق حەڵاڵ بێ ئەبێ بۆ کوردیش حەڵاڵ بێ.

ئەگەر عەرەب لە عیراق دا ئەیەوێ لە گەڵ کوردا بژی و، ئەگەر ئەیەوێ دەوڵەتی عیراق بمێنێ، ئەبێ لە ئێش و ئازارەکانی کورد، لە ئاوات و ئامانجەکانی، لە داوا و داخوازییەکانی بگا، بە تایبەتی چونکە تا ئێستەش هەر ئەو نەتەوەی

دەسەلاتدار و خاوەن دەسەلاتی سیاسییە لەعیراق دا.

شەریکایەتی کورد و عەرەب لە عیراق دا ئەگەرچی لە سەردەمی پاشایەتی دا لە دروشمی عیراق دا ئیشارەتی بۆ کرابو و، لە دواییتردا لە شۆرشی ١٤ ی تەموزدا هەم لە دەستوری موەقەت دا شەریکایەتی کورد و عەرەب لە عیراق دا و، هەم لە دروشمی کۆماری عیراق دا بە ئاشکرا دەرخرابو، وە لە بەندێکی دەسکاری کراوی ١٩٧٠ی دەستوری موەقەتی ئێستای عیراقیش دا، لەوانە رونتر و ئاشکراتر دان نراوە بەوەدا کە: گەلی عیراق پێکدێ لە دوو نەتەوەی سەرەکی کورد و عەرەب. کەچی ئەمانە هەموی هەر نووسینی سەر کاغەز بون و، هەرگیز لە کردەوەی رۆژانەی کاروباری دەوڵەتی عیراق دا رەنگیان نەداوەتەوە، هەمو عیراقیەکی خاوەن ویژدان ئەزانێ کە هەرگیز هاوولاتیەکی کورد ئەوەندەی هاوولاتیەکی عەرەب مافی هاوولاتیتی عیراقی نەبوە و، نەی توانیوە بەکاری بهێنێ. ئەگەر لە پلە هەرە بەرزەکانی کاری دەوڵەتی یش دا بوبێ، بگرە زۆر جار هاوولاتی کورد مافەکانی پێشێل کراوە، بە چاوی سوک سەیری کراوە، گومان لە دڵسۆزی کراوە، هەمیشە رێگەی لێ گیراوە شوێنی ئاسایی خۆی بگرێ، تەنانەت ئەگەر خۆی و شەرەفی خۆیشی بە کاربەدەستانی رۆژ فرۆشت بێ.

گومانی تێ دا نیە لە ژێر سایەی هەلومەرجێکی ئاوەها نالەبار و نابەرامبەردا کورد لە سەر هەقی بە جواب دێ، داوای مافەکانی خۆی ئەکات، هەر کاتێکیش هیچ رێگەیەکی هێمنانەیان بۆ نەهێشتبێتەوە، بە ناچاری پەنای بردۆتە بەر زەبروزەنگ و شۆرش. ئەوەش مافێکی سروشتی و سەرەتایی هەمو نەتەوە و گەل و تاقم و دەستەیەکی زوڵم لێکراوە لە سەرتاسەری دنیادا. هەر ئەم زوڵمەش بوە پاڵی بە گەلی کوردەوە ناوە راپەرێ و شۆرش بەرپا بکا. هەر ئەمەش بوە پاڵی پێوە ناوە، لەوەتی دەوڵەتی عیراق دامەزراوە، لە حاڵی روبەروبونەوە دابێ لە گەڵ دەوڵەتی عیراق دا. ئەوانەی ئەیانەوێ مەسەلەکە بە جۆرێکی تر لێک بدەنەوە. دیارە قازانجیان لەوە دایە و، خۆیان دور ئەخەنەوە لە لێکدانەوەی عیلمی رواوە سیاسی و کۆمەلایەتی و ئابوریەکانی... ژیانی میللەتی عیراق. ١ ی حوزەیرانی ١٩٨٤

- ٢ -

## ئەمنی ستراتیجی عیراق و مەسەلەی کورد

لەوەتەی دەوڵەتی عیراق دامەزراوە، گەلی کورد لە خەباتێکی بێ پسانەوەدا بوە، لە پێناوی سەلماندنی مافە نەتەوەیی و دیموکراتییەکانی دا، وە حکومەتی

عێراقیش لە هەولدانێکی بێ پسانەوەدا بوە، بۆ سەرکوتکردنی جولانەوەی شۆڕشگێرانەی گەلی کورد.

گەلی کورد ئەگەرچی جاروبار بۆ چەن مانگێک، یا خود بۆ چەن ساڵێک، لە ئەنجامی شکستێکی عەسکەری یا لە ئەنجامی شکستێکی سیاسی دا، جولانەوە شۆڕشگێرانەکەی خاموش بوبێ، بەلام هیچ کات کۆڵی نەداوە لە خەبات و روبەروبونەوەی دەولەتی عیراق و دام و دەزگاکانی، بە رێگەی جوراوجور و شێوەی جیا جیا، هەر لە پێشکەشکردنی عەرزوحاڵ و مەزبەتە و یادداشت و نامەی کراوەی ناو رۆژنامەوە تا مانگرتن و خۆپێشاندان و خەباتی ژێرزەمینی و بەیان و بلاوکراوە، تا بە کار هێنانی چەک و زەبروزەنگی شۆڕشگێرانە.

کاربەدەستانی عیراق هیچ کات نەیان ویستوە لە هۆی راستەقینەی هەلگیرسانی شۆڕشی کورد و لە هۆی نارەزایی و بێزاری و هەراسانی خەلکی کوردستان بگەن، هەرگیز نەیان ویستوە بە راست و دروستی گیروگرفتە سیاسی و کۆمەلایەتی و ئابوری و فەرهەنگیەکانی گەلی کورد بزانن و، رەگوریشەی مەوزوعی مەسەلەی کورد بدۆزنەوە و چارەی عادیلانەی بکەن، بەلکو هەمیشە:

لە لایەکەوە - بوختان و درۆیان بۆ جولانەوەی رەوا و حەقخوازی کورد هەلبەستوە، بە گوێرەی زەمان و زروف هەر کالایەک لە برەودا بوبێ، جارێک بە فیتی سۆڤیەتی و، جارێک بە فیتی ئیمپریالیزم و، کەرەتێک بە دەسیسەی سەهیونیزم و، کەرەتێکی تر بە فیتی ئێران و، تاوێک بە هی سوریا و، زۆر جاریش بە کۆنەپەرستی و دواکەوتویی و پیلانگێرییان لە قەلەم داوە.

لە لایەکی تریشەوە - بەوپەڕی درندایەتیەوە، هەمیشە بە هێزی چەکدار و هەمو شێوەکانی تری تۆقاندن و کوشتن و وێرانکاری، بەربونەتە وێزەی گەلی کورد و خاکی کوردستان، بۆ سەرکوتکردنی جولانەوەکەی و، بگرە هەندێ جار بۆ لە ناو بردنی گەلی کورد.

شۆڕشی حوزەیرانی ١٩٧٦ نواندنەوەی مەوزوعیی ویست و ئیرادەی میللەتی کورد بوو بۆ بەرپەرچدانەوەی چەوساندنەوەی نەتەوایەتی، بە تایبەتی دژی تەهجیر و تەرحیل و تەعریب و تەبعیس، جولانەوەیەک بوو لە ناو هەناوی پر لە ناسۆر و داخ و ئێش و ئازاری گەلی کوردەوە هەلقولا بو بۆ دیفاع لە وجودی قەومی کورد و نیشتمانەکەی.

جا هەر وەکو شۆڕشی حوزەیران دەسکردی کەس و تاقم و عەشیرەت، یا خود دەسیسەی بێگانە و دوژمنانی عیراق نەبو، بەلکو ئەنجامی ئەو زولم و زۆرە بو کە

کاربەدەستانی عیراق لە گەلی کوردیان کرد، هەروەها شۆڕشی ئەیلولیش دەربڕینی مەوزوعیی ویست و ئیرادەی گەلی کورد بو دژی چەوسانەوە و زۆر لێکران، لە پێناوی بەدیهێنانی مافە ئینسانی و دیمۆکراتی و نەتەوەیی و نیشتمانیەکانی گەلی کوردا، نەک دەسکردی کەس و حیزب و عەشیرەت یا فیتی ئیمپریالیزم.

هەر لەبەر ئەوە دوای ئاشبەتالی ٧٥ ساڵێکی نەخایاند خەبات دەستی پێکردەوە، شۆڕشی حوزەیرانی ٧٦ درێژە کێشانی شۆڕشی ئەیلولی ١٩٦١ە و، شۆڕشی ئەیلولیش درێژە کێشانی ئەبەردەکانی بەر دەرکی سەرای سلیمانی و ئاوباریک و شۆڕشەکانی تری گەلی کوردە.

هەڵسەنگاندنێکی مەوزوعیی شۆڕش و ڕاپەڕینەکانی گەلی کورد لە عیراق دا، لێکۆڵینەوەی ڕەگوڕیشەی مێژوی سیاسی، ئابوری، کۆمەلایەتی، فەرهەنگی... بۆ هەمو پیاوێکی ژیر و بە ویژدان دەرئەخات چ جای ئەوانەی بە سەنگ و تەرازوی عیلم ڕوداوەکانی ژیانی میللەتان هەڵئەسەنگێنن کە مەسەلەی کورد لە عیراق دا دەسکردی بێگانە و ئیمپریالیزم و سەهیونیزم و شەرق و غەرب و ئەم دەوڵەت و فلان حیزب و عەشیرەت نییە، بەڵکو گیروگرفتێکی مەوزوعییە، سەر چاوەکەی چەوساندنەوەی نەتەوایەتی گەلی کورد و، بێ بەش کردنیەتی لە مافە ئاساییەکانی خۆی، لە سەرو هەمویانەوە مافی ئازادی بڕیاردانی چارەنوسی خۆی وەکو هەمو گەلانی سەر زەمین، وە تا ئەو دەمەی زوڵم و چەوسانەوەیشی لە سەر بمێنێ گیروگرفتەکە ئەمێنێ و، خەبات و ڕاپەڕین و شۆڕش و زەبروزەنگ و بەرەنگاریش هەر ئەمێنێ.

هەڵبەتە هەر وەکو دەوڵەتی عیراق هەمو جار دەس بۆ ئەم دەوڵەت یا ئەو ڕائەکێشێ کە یارمەتی بدا لە چارە سەرکردنی کێشەیەکی خۆی دا، بە تایبەتی لە کوژاندنەوەی کێشەی کوردا، کوردیش هەمان هەوڵی داوە و دەستی بۆ ئەم دەوڵەت یا ئەو دەوڵەت ڕاکێشاوە کە یارمەتی بدا، هیچ نەبێ بۆ ئەوەی لە ناو نەچێ.

بێگومان ئەم دەوڵەت یا ئەو دەوڵەت هەوڵی داوە بۆ مسوگەر کردنی قازانجی تایبەتی خۆی دەس وەربداتە کاروباری ناوخۆی عیراقەوە و جێگە پێ ی نفوزی خۆی قایم بکا، هەروەها هەوڵیشیان داوە دەس وەربدەنە مەسەلەی کورد و بە کاری بهێنن بۆ قازانجی خۆیان. بەلام نە هەوڵدانی سەرکردایەتی جولانەوەی کورد بۆ وەرگرتنی یارمەتی و بە دەسهێنانی پشتیوانی لەم و لەو، ئیتر ڕاست بوبێ یا ناڕاست، چاک بوبێ یا خراپ، تەنسیری کردۆتە سەر عەدالەت و ڕەوایی ناوەرۆکی مەسەلەی کورد، وە نە هەوڵی بێگانەیش بۆ دەس وەردان لە مەسەلەی کورد

ماهیەتی عادلانەی جولانەوەی کوردی گۆڕیوە.

جولانەوەی کورد، بزوتنەوەیەکی مێژووکردی مەوزعییە. تەعبیر لە ئیرادە و ئاواتەکانی گەلی کورد ئەکا لە پێناوی بەدەسهێنانی مافەکانی دا، لە پێناوی پێشکەوتنی کۆمەلایەتی و گەشەکردنی و، گەیشتنی دا بە کاروانی پێشکەوتنی گەلانی دنیا، بۆیە نە لە ڕێ دەرچونی جاروباری سەرکردایەتیەکەی لە ڕێبازی ڕاست و دروستی مێژووی خۆی، نە دەستێوردانی ناڕەوای بێگانە و نە هەولی دڕندانەی کاربەدەستانی حکومەت بۆ تێکشکاندنی.. هیچی سەری نەگرتوە و لە سەر تاوێری ئیرادەی خەلکی کوردستان ورد و خاش بوە.

کاربەدەستانی عیراق، هەر لە سەردەمی دەسەلاتی بنەمالەی هاشمیەوە هەتا ئێستا مەسەلەی کوردیان بە ناهەق و ناڕەوا بە یەکێک لە گرنگترین ئەو خەتەرانە لە قەلەم داوە کە هەڕەشە لە عیراق و پاشەڕۆژی دەولەتی عیراق، بەلکو هەڕەشە لە نەتەوە و نیشتمانی عەرەب ئەکا، لە کاتێک دا ئەمە بۆچونێکی چەوت بەلکو شۆڤێنی و ڕەگەزپەرستانەیە و دوورە لە ڕاستییەوە.

لە ڕوانگەی بەرهەلستی "خەتەری" مەسەلەی کوردەوە، هەر لە دامەزرانی دەولەتی عیراقەوە، کاربەدەستانی عیراق ئەوەندە پارە و پولەی لە سەرکوتکردنی جولانەوەی کورد و وێرانکردنی کوردستان دا خەرجیان کردوە، ئەوەندە ڕەنج و ماندووبونەی لە کوژاندنەوەی کلپەی شۆڕش و ڕاپەڕینەکانی کوردا بە فیڕۆیان داوە، ئەوەندە خوێنەی لە ڕۆلەکانی کورد و عەرەبیان بە ڕشتن داوە.. ئەگەر چەن یەکی ئەوەیان لە پرۆژەکانی ئاواکردنەوەی کوردستان و گەشە پێدان و پێش خستنی دا، لە بەگەڕخستنی هێزی بەشەری کورد و کەلک وەرگرتن لە سەروەت و سامانی خواداد و سروشتی کوردستان دا سەرف بکرایە، ئێستا هەم عیراق هەم کوردستان لە بارو زروفێکی تر و هەم گەلی عیراق و هەم گەلی کورد لە قۆناغێکی تری ژیان دا ئەبون.

بەلام کینە و بوغزی نەتەوەیی کاربەدەستان و دانانی مەسەلەی کورد بە خەتەر بۆ سەر خۆیان و نەتەوە و نیشتمانی عەرەب، وای لێکردون هەمیشە لە هەولدانی بەردەوام دا بن بۆ تواندنەوەی گەلی کورد و شێواندنی فەرهەنگ و مێژوو و نەریت و داب و دەستوری کوردی و داگیرکردنی ئەرزەکەی و هەللوشینی چاوچنوکانەی سەروەت و سامانی کوردستان و بەری ڕەنجی خەلکەکەی. ئەمەش دەلاقەیەکی گەورەی لە بەینی دەولەتی عیراق و گەلی کوردا دروست کردوە.

دەولەتی عیراق لە وەتی دامەزراوە تا ئێستا بە چاوی غەریب و گومان

لێکراو و پیلان گێر و یاخی و بێگانە سەیری هاوولاتی کورد نەکا ، لە کاتێک دا هەزاران ساڵە لە سەر ئەرزی باوباپیرانی خۆی و لە ناو نیشتمانی نەتەوەیی خۆی دا دانیشتوە و ئەژی، لە بە جێهێنانی ئەرکی نیشتمانی دا هیچی لە عەرەبی عیراقی کەمتر نەبوە.

بۆیە کوردیش هەمیشە بە چاوی دەوڵەتێکی بێگانەی چەوسێنەر و زۆردار و داگیرکەر سەیری حکومەتەکانی عیراقی کردوە کە ماف و خاک و ئازادی لێ زەوت کردوە و، حکومەتی عیراق و دام و دەزگاکانی نەک هەر بە هی خۆی نەزانیوە، بەڵکو بە دام و دەزگای سەرکوتکەر و خوێنمژ و بێگانەی لە قەڵەم داوە.

ئەم دوو نۆرینە جیاوازە: نۆرینی کاربەدەستانی عیراق بۆ کورد وەکو خەتەرێک بۆ سەر عیراق و نەتەوە و نیشتمانی عەرەب. لە بەرامبەر ئەمەدا نۆرینی کورد بۆ کاربەدەستان لە عیراق دا وەکو خەتەرێکی کوشندە بۆ سەر مان و بوونی گەلی کورد و خاکی کوردستان، تا دێ قوڵ ئەبن.

کاربەدەستانی عیراق لە باتی ئەوەی مافە ڕەواکانی گەلی کورد بسەلمێنن و لە ڕێگەی دانان و جێبەجێ کردنی ماف و داوا هەق و ڕەواکانی کوردەوە، هەوڵی یەکێتی گەلی عیراق و، پارێزگاری یەکێتی قەڵەمڕەوەکەی بدەن و، یەکێتییەکی ئارەزومەدانە لە بەینی گەلی کورد و گەلی عەرەب دا پێک بهێنن و، بەو ڕێگەیە (ئەمنی سراتیجی) عیراق بپارێزن و، دوری بخەنەوە لە مەترسی هەڵوەشان و لە یەک ترازان و پارچە پارچە بون و، ڕێبەری بکەن لە هێزەکانی بێگانە کە درز و کەلێن لە ناو عیراق دا بدۆزنەوە، کەوتونەتە وێزەی گەلی کورد بۆ دەرکردنی لە نیشتمانی نەتەوەیی خۆی و بلاوە پێکردن و لە ناو بردنی، لە ئەنجامی ئەمەش دا گەلی کورد بە ناچاری پەنای بردۆتە بەر چەک و شاخ بۆ ئەوەی وجودی قەومی خۆی بپارێزێ لە توانەوە و لە ناوچون.

شتێکی ئاساییە ، بگرە پێویست و ناچارییە ، کە هەمو دەوڵەتێک چوارچێوەی (ئەمنی ستراتیجی) خۆی یا خود (ستراتیجی ئەمنی) خۆی دابڕێژێ بۆ ئەوەی بتوانێ خۆی لە هێرشی ڕاستەوخۆ و ناراستەوخۆی هێز و دەوڵەتانی تر و لەکنە کردن و نفوزی بێگانە و پیلانگێرییان بپارێزێ، یەکێتی خاک و گەلەکەی و سەربەخۆیی ولاتەکەی جێگیر بکا ، هەر لە بەر ئەوەش، هیچ دەوڵەتێک لە دنیادا نیە کە بایەخ بە مەسەلەی ئەمنی سراتیجی خۆی نەدا و فاکتەرەکانی هەڵنەسەنگێنێ و ڕێوشوێنی پاراستن و بە هێز کردنی دانەنێ، ئیتر سروشتی چینایەتی دەوڵەتەکە و جۆری ڕێژێمەکەی هەر چۆنێک بێ ، کۆنەپەرست بێ یا پێشکەوتنخواز، دیکتاتۆری

بێ یا دیموکراتی، سوسیالیستی بێ یا سەرمایەداری. هەڵبەتە هەر کام لەم دەوڵەتانە بە گوێرەی سروشتی چینایەتی خۆی و فەلسەفەی تایبەتی حوکمڕانی خۆی نەخشەی (ئەمنی ستراتیجی) خۆی دائەنێ.

ئەمنی ستراتیجی هەر لە یەک فاکتەر پێک نایەت، بەڵکو لە چەندین فاکتەر پێکدێ کە ڕەنگە گرنگترینیان مەسەلەی یەکێتی ڕیزەکانی خەڵکی ناو سنوری دەوڵەتەکە بێ، بە جۆرێکی ئەوتۆ کە ناکۆکی نەتەوەیی و ناکۆکی دینی و ناکۆکی مەزەبی و ناکۆکی چینایەتی ناو دانیشتوانی دەوڵەتەکە بە شێوەیەکی وا چارەسەر بکا کە پاشەڕۆژی دەوڵەتەکە و یەکێتی خەڵک و قەڵەمڕەوەکەی نەخاتە خەتەرەوە، وە ناکۆکیەکان وا لێ نەکرێن کە ببێتە مایە هەڵگیرسانی شەڕی ناوخۆ و تێکچونی یەکێتی گەل و وڵات و هێز و دەوڵەتانی بێگانەش بتوانن دەستی تێ وەربدەن و کەڵکی لێ وەربگرن.

هەروەکو لە وتارێکی پێشتردا وترا عیراق (مەتحەفێ ئەجناس)ە، واتە وڵاتێکی فرە - نەتەوە، فرە - چین، فرە - دین، فرە - مەزەبە، بەو پێیەش هەڵبەتە گیروگرفت و کێشە و ناکۆکی جۆراوجۆری تێ دا نەبێ، بە تایبەتی چونکە عیراق لە هەلومەرجی دوای شەڕی جیهانی یەکەم بە پێ ی ویست و ئیرادەی عەرەب و کورد و دانیشتوانی تری ئێستای عیراق، لە دامەزران و پێک هێنانی دا نە خۆی وەکو دەوڵەتێکی کۆن نەریت و تەقالیدێکی شارستانی کۆن و دێرینەی هەبوە، وە نە سەرەتا و پرنسیپەکانی دامەزراندنی پەیوەندی ئارەزومەدانە و دیموکراتی و نوێ ی ئەم سەردەمەیان تێ دا ڕەچاو کراوە، لە بەر ئەوە گیروگرفتەکان هەمویان بە چارە نەکراوی ماونەوە و تۆوی تەقینەوە لە هەناویاندا هەیە.

چارەنوسی دەوڵەتێکی لەو بابەتە لە دوو حاڵ بە دەر نیە:

یەکەمیان - پێکەوە ژیانی ئارەزومەندانەی هەمو ئەو نەتەوە و دین و مەزەبە جیاوازانەی لە سنوری یەک دەوڵەتدا کۆبونەتەوە، لە سەر بنچینەی سەلماندنی مافی یەکتری و ڕێزگرتنی یەکتری و یەکسانی و بەشدار بون لە بەڕێوەبردنی وڵات و پاشەڕۆژ و چارەنوسی دا، هەر یەکەیان بە گوێرەی قورسایی خۆی. جیاوازی نەتەوەیی و ڕەگەزی و دینی مەزەبی نەبێتە پێوانەی دڵسۆزی و دەسەڵاتداری لە وڵات دا، گەل و دین و مەزەبێ سەردەستە و ژێر دەستە نەبێ، ئەوسا گەلێکی گونجاو و تەبا و یەکگرتو پێک دێ، کە ناحەزانی ئەو دەوڵەتە بە هیچ جۆرێک لە ڕێگەی بە کارهێنانی گیروگرفتەکانی ناوەوە ناتوانن زەفەری پێ ببەن بەمەش بنچینەیەکی گرنگی ئەمنی ستراتیجی دائەمەزرێ.

لە ناو دەوڵەتێکی وادا جێگەی خۆبەزلزانینی نەتەوایەتی و شوڤێنێتی و ڕەگەزبازی و تایفەگەری و جیاوازی دینی و مەزەبی نابێتەوە، بۆیە هیچ کام لەو نەتەوە و دین و مەزەبانەش هەست بە چەوسانەوە ناکەن و پێکەوە هەوڵی بنیاتنانی وڵاتێکی ئاوەدان و گەشەکردو و پێشکەوتو ئەدەن.

دووەمیان - نەتەوەیەک ئەبێتە حوکمڕان و دەسەڵاتدار و ئەوانی تر ئەبنە ژێردەستە و هاووڵاتی پلەی دووەم و سێیەم و خوارتر.. ئەوسا بۆ پاریزگاری دەسەڵاتەکەی خۆی ئەمنی ستراتیجی لە سەر بنچینەی خۆبەزلزانینی نەتەوایەتی و جیاوازی ڕەگەزایەتی و دینی و مەزەبی دائەمەزرێنێ و بە ڕێگەی زەبروزەنگ و کوشتن و لە ناو بردن و ڕاگوێزان و تواندنەوە هەوڵ ئەدا حوکمەکەی خۆی بپارێزێ و سەر بە نەتەوە و دین و مەزەبەکانی تر دابنەوێنێ، هەڵبەتە لە ژێر سایەی حوکمێکی وەهادا ناکۆکییەکان ئەتەقنەوە، شەڕ هەڵئەگیرسێ، شۆڕش و بەرەنگاری دەس پێ ئەکا و، هەست بە چەوسانەوە و زوڵم و زۆر لێکران قوڵ ئەبنەوە لە ناخی دەرونی کۆمەڵانی خەلک دا و، گیانی جیابونەوەخوازی و خۆ دابڕین بەهێز ئەبێ و مەسەلەی ئەمنی ستراتیجیش نەک هەر دابین نابێ، بەڵکو پاشەڕۆژی دەوڵەتەکە ئەکەوێتە ژێر هەڕەشەی ڕوخان و هەڵوەشان و پارچە پارچە بونەوە.

لە وەتی دەوڵەتی عیراق دامەزراوە، نەتەوە پەرستەکانی عەرەب لایان وایە کە ئەرزی عیراق بە شیمال و جنوب و شەرق و غەرب و وەسەطەوە موڵکی عەرەبە و بەشێکە لە نیشتمانی عەرەب و هەمو ئەوانەی غەیری عەرەبن، لە وانە گەلی کوردیش کە لە سنوری دەوڵەتی عیراق دا دانیشتون، میوانی نەتەوەی عەرەبن و لە سەر ئەرزی عەرەب ئەژین، بۆیە ئەرکی پاراستنی عیراقیش هەر لە ئەستۆی عەرەبدایە و مەسەلەی تەئمین کردنی ئەمنی ستراتیجیش هەر ئەبێ خۆیان دای بنێن و لە سەر بنچینەی ئەوەش دای بنێن کە عەرەب ( لەم ساڵانەی دواییدا عەرەبی سوننی بەعسی) لە هەمو شوێنێک دا و لە هەمو دام و دەزگایەک دا دەسەڵاتداری تەواو و بێ شەریک بێ، لەم ڕوانگە تەسک بینەوە لایان وایە، داواکردنی مافی نەتەوایەتی بۆ گەلی کورد گێچەڵە بە نەتەوە و نیشتمانی عەرەب و خزمەتی ئیمپریالیزم و سەهیونیزم ئەکا.

لایان وایە هەرچی باسی جیاوازی مەزەبی و چەوساندنەوەی شیعەی کرد نۆکەری ئێرانە و خزمەتی بیری تایفەگەری ئەکا.. بۆیە ئەبێ ئەمانە لاواز بکرێن و هەوڵ بدرێ بتوێنەوە و، زمان و فەرهەنگ و مێژوویان بشێوێنرێ و، لە شوێن و جێگای گرنگ و دەوڵەمەند و ستراتیجی دا نەهێلرێن و ڕابگوێزرێن و، لە دام و

دەزگای گرنگی دەوڵەت و کارگە و دامەزراوی گرنگ دا ئیشیان نەدرێتێ و، لە خوێندەواری و زانستگا و مەعهەدەکاندا بێ بەش بکرێن.. هەر بە پێ ی مەنطیقی چەوتی ڕەگەز پەرستانەی ئەمنی ستراتیجی گوایە بۆ ئەوەی خەتەری کورد نەمێنێ، لە سەر دەوڵەتی عیراق، کە بە پێ ی قسەی ئەوان بەشێکە لە نیشتمانی عەرەب:

دەیان هەزار خێزانی کوردی فەیلییان لە عیراق دەرکرد و سەروەت و سامانیان زەوت کردن.

دەیان هەزار خێزانی کوردییان لەو ناوچانە دەرکرد کە تێکەڵاون لە کورد و تورکومان و عەرەب و، عەرەبیان هێنایە جێگایان.

دەیان هەزار خێزانی کوردیان لەو ناوچانە دەرکرد کە پەترۆڵ یا مەعدەنی تریان تێ دایە.

سەدان هەزار خێزانی کوردیان لە گوندەکانی سەر سنوری ئێران و سوریا دەرکرد و ئەوەی بە درێژایی هەزاران ساڵ لە باخ و ڕەز و ئاوەدانێ بنیاتیان نابو تێکیاندا...

ئەمانە سەرەڕای ئەوەی دامەزراوە گرنگەکانی پەترۆڵ و کارەبا و کبریت و ئاسن لە ڕوی کرێکاری کوردا داخراوە و دەزگا و دائیرە گرنگەکانی دەوڵەت جێگەی کوردی تێ دا نابێتەوە.

ئەمنی ستراتیجی ئێستای عیراق کە لە سەر بنچینەی جیاوازی ڕەگەزایەتی و جیاوازی حیزبایەتی و جیاوازی مەزەبی دانراوە، نەک هەر ناتوانێ پاشەڕۆژی عیراق بپارێزێ و ئەمنی عیراق مسۆگەر بکات، بەڵکو زەمینەی هەڵوەشانی دەوڵەتی عیراق و لەت و پەت بونی قەڵەمڕەوەکەی خۆش ئەکات. ٢ ی حوزەیرانی ١٩٨٤

- ٣ -

نەمنی ستراتیجی عیراق و مەسەلەی (تەرحیل) ی کورد

دەمێکە کاربەدەستانی حکومەتی عیراق کەوتونەتە (تەرحیل) واتە ڕاگوێزانی زۆرەملێ ی خەڵکی کوردستان، بە زۆر لە جێگە و شوێنی باووباپیرانیان دەریان ئەکەن و بەم لاو ئەولا بە هەندەران دا پەرش و بڵاو و ئاوارەیان ئەکەن.

سەردەمێ دەیان هەزار کوردی فەیلی، بەو بیانوە لە سەرانسەری عیراق دەرکران، گوایا ڕیشە و ئەسڵ و فەسلیان عیراقی نیە و مەترسی لە سەر ئەمنی عیراق دروست ئەکەن. دەمێکی تر جوتیارانی دەوروبەری کەرکوک و کرێکاران و خەڵکی ناو شاری کەرکوک و ناوچە نەوتاویەکانی تر ڕاگوێزران و دەرکران گوایا نەبێ حکومەت ئەمنی شاری کەرکوک و ناوچە نەوتاویەکانی بپارێزێ.

پاشان کەوتنە ڕاگوێزانی هەمو درێژایی شریتی سنوری کوردنشین، بە قولایی ١٠ - ٢٠ کیلۆمەتر بە بیانوی پاراستنی ئەمنی عیراق لە تەماع و دەستدرێژی بێگانە.

سەر ئەنجامی ئەو سیاسەتی ڕاگوێزانە زیاتر لە یەک ملیۆن مرۆڤی کورد بەر ئەم هێرشی ڕاگوێزان و دەربەدەر کردنە کەوتون، زیاتر لە یەک ملیۆن مرۆڤی کورد ئاوارە و سەر لێ شێواو بون، ولاتیش لە خزمەت و بەهرە و ڕەنج و ماندوبونیان مەحروم بوە.

تا ئێستا پتر لە ١٣٠ هەزار کوردی فەیلی لە بەغداد و شارەکانی کوردستان دەربەدەری ئێران و وولاتانی تر کراون .. لەوانە دەیان هەزاریان خۆیان و باوک و باپیریان عیراقین و بەشێکی زۆریان (جنسیە) ی عیراقییان هەیە، دەیان هەزاریشیان منداڵ و ساوان یا گەنج و تازە هەڵچون و لە قوتابخانەی ناوەندی و ئامادەیی و کۆلێج و پەیمانگاکان ئەیانخوێند، کە هەم خۆیان و هەم باوکیان لە عیراق لە دایک بون. ئەمانە هەمو ماڵ و سامان و خانوبەرەیان زەوت کرا تەنانەت لە هەندێ جاردا منداڵی ساواشیان بە جێ ما و دەرفەتیان نەدرا خۆیان کۆبکەنەوە.

لە ساڵی ١٩٦٣دا ٢١ گوندیان لە دبس ڕاگوێزا و زیاتر لە ١٥٠٠ خێزانی جوتیاریان دەربەدەر کرد.

لە ساڵی ١٩٧٢دا میری کەوتە یارمەتیدان و هاندانی چەند دەربەگێکی عەرەب بۆ ئەوەی لە دەوروبەری کەرکوک زەوی و زاری جوتیار و موڵکدارانی کورد بکڕن.. لە هەمان کات دا کەوتە هاندانی دەربەگە کوردەکانی ئەو ناوچانە بۆ ئەوەی زەوی و زاریان بەو عەرەبانە بفرۆشن. لە ئەنجام دا سەدان خێزانی کورد لە ناوچەی داودە و کاکەیی دەربەدەر کران و عەرەب نشین کران لەوانە گوندی (حەشیشە و دلسی گەورە، دلسی بچوک، ڕەبماوا، کومبز، گرد رابیعە، سیکانی، کەراکرە، کەریمە، سەی محەمەد، عەتشایە، تەل مەغار، ئەرغوون و پەنجا علی و هەفت تەغار).

لە تەک ئەوەدا کەوتنە ڕاگوێزانی سەدان خێزانی کورد لە ناوچەکانی شەنگار و شێخان و زمار و سمێل و تەلەعفەر و عەین زالە و خانەقین و پاشان ناوچەکانیان تەعریب کردن.

هەروەها لە ساڵی ١٩٦٣ بەدواوە، کەوتنە ڕوخاندنی هەزاران خانوی کورد لە ناو شاری کەرکوک دا، لە گەڕەکی شوریجە و ئازادی و دەربەدەر کردنی خێزانەکانی، تەنانەت لە ساڵی ١٩٧٧دا کە کەوتنە ڕاکێشانی جادەی ٦٠ مەتری و

[illegible]ملاک کردنی خانوی خێزانە کوردەکانی شوریجە، ڕێگەیان نەدان لە شاری کەرکوک دا زەوی بکڕنەوە و جارێکی تر خانوی تێ دا بکەنەوە تا دەربەدەری شارەکانی تریان کردن.

لە سالی ١٩٧٥ بە دواشەوە کەوتنە ڕاگوێزانی ناوچەکانی سنور، سنوری عیراق - سوریە، عیراق - تورکیا، عیراق - ئێران و زیاتر لە ١٥٠٠ گوندیان ڕاگوێزا و زیاتر لە ٧٥٠ هەزار مرۆڤی کوردیان لە زەوی باو باپیرانیان هەڵکەند و خزانیانە ئوردوگا زۆرەملیەکانەوە.

دیارە ئەم هەمو ڕاگوێزان و ئازاردانە، ئەم هەمو خۆ ماندو کردن و پارە و پول خەرج کردنەی میری.. ئەم هەمو هێزی کار و خێر و سامان لە کیس چونە هەروا بە خۆڕایی نەکراوە، یا لە بەر خاتری پێشخستنی کۆمەڵی کوردەواری نەبوە.

بەڵکو ئەوە هەموی بە گوێرەی نەخشە و پیلان ئەنجام دراوە، مەبەستی سەرەکیش تێکدانی وەزعی دیمۆگرافی عیراق و دارشتنی ئەو وەزعەیە بە گوێرەی بیر و بۆچونی کاربەدەستان، کە بێگومان لە گیانێکی شوفێنییەوە هەڵئەقوڵێ.

ڕاگوێزانی زۆرە ملیی کورد، لە پایتەخت و لە کەرکوک و ناوچە نەوتاویەکانی تریش، لە ناوچەکانی سنور لە تەک شالاوی تەعریب و تەبعیس دا هەموی لە سەر بناغەی یەک بیر کردنەوە دامەزراوە، کە حکومەتە یەک لە دوا یەکەکانی عیراق هەمویان لە سەری پێک هاتون ئەویش گوایا پاراستنی ئەمنی ستراتیجی عیراقە، کە لە ووتارێکی تری ئەم زنجیرە ووتارەدا بە درێژی باس کراوە.

ئنجا چونکە نەخشەی (ئەمنی ستراتیژی) حکومەتی عیراق لە سەر ئەساسێکی شۆفێنی دامەزراوە ڕووی کردۆتە سێ مەسەلە:

١. تێک دانی نیسبەتی کورد و عەرەب لە عیراق دا.

٢. دوور خستنەوەی خەتەری کورد لە سەر پاشەڕۆژی عیراق.

٣. تێکدانی قوڵایی ستراتیجی جوڵانەوەی کورد.

دەرکردنی پتر لە ١٣٠ هەزار کوردی فەیلی و هەڵاتنی چەندین هەزار کوردی تر بۆ هەندەران لە ترسی زەبروزەنگ بۆ کەم کردنەوەی نیسبەتی کوردە بەرامبەر نیسبەتی عەرەب لە عیراق دا. بۆ ئەوەی هەمیشە عەرەب ئەتەوەی گەورە بێ و هەرگیز نیسبەتی کورد لە هی عەرەب نزیک نەبێتەوە و تەئسیر لە سەر وەزعی سیاسی، فەرهەنگی عیراق نەکا، ئەبێ نیسبەتی کورد کەم بکەنەوە.

ڕاگوێزانی زیاتر لە ٧٥٠ هەزار کورد لە ناوچەکانی سنور و دەیان هەزار خێزانی کورد لە کەرکوک و ناوچە نەوتاویەکان و عەرەب نشین کردنی ئەو ناوچانە

لە بەر ئەوەیە کە حکومەتی مەرکەزی لە عیراقدا بڕوا و متمانەی بە کورد نیە، وا تەماشای کوردی کردوە کە گوایا خائین و نیشتمانفرۆش و دژی ئەمن و سەربەخۆیی و پاشەڕۆژی کار ئەکەن، پیاوی بێگانەن و هەمیشە دەست لە گەڵ دوژمنانی عیراقدا تێکەڵاو ئەکەن، لە ناوچە سنورەکانەوە ئەبن بە بنکە و پرد بۆ هاتنی نفوزی بێگانە و لە کەرکوک و ناوچە نەوتاویەکانی تریشدا مەترسی لە سەر دامەزراوە نەوتیەکان و ئابوری عیراق دروست ئەکەن... بۆیە ئەبێ حکومەت رایانگوێزێ و ناوچەکانی سنور بە چۆڵی بهێڵێتەوە و ناوچە نەوتاویەکانیش لە باتی کورد بە عەرەب بپارێزێ.

لە راگوێزانی ١٠ تا ٢٠ کیلومەتر مەبەستێکی تریش هەیە، کە ئەوەش تێکدانی قولایی ستراتیجی جولانەوەی شۆرشگێرانەی خەڵکی کوردستانە تا بۆشاییەک لە بەینی کوردی عیراق و کوردی ئێران و تورکیا و سوریەدا دروست ببێ و کوردی عیراق نەتوانێ بۆ گەشە کردن و بۆ پێشەوە چونی جولانەوەکەیان قولاییەکی نەتەوەییان هەبێ، ئەوەندەی لە تواناشدا بێ لە وانی پارچەکانی تری کوردستان داببرێ و هەستی ئینتیمای بۆ نەتەوەی کورد لاواز بکا یا نەیهێڵێ تا حکومەتی مەرکەزی عیراق بە ئارەزوی خۆی و بەو جۆرەی ئەیەوێ لە عیراقدا کورد لە قالب بدا.

بێگومان لە باتی ئەوەی حکومەتی مەرکەزی بە چاوی گومان تەماشای کورد بکا و لە ئەنجامدا ببێ بە هاوولاتی دەرەجە دوو یا سێ و لە هەمو مافێکی مرۆیی و نەتەوەیی بێ بەری بکرێ، لە باتی ئەوەی ئەو هەمو پارە و خەرجە لە راگوێزان و دەربەدەر کردنی کوردا سەرف بکرێ... لە باتی ئەوەی ناوچەکانی چۆڵ بکرێ یا بە عەرەب بکرێ... لە باتی ئەوانە هەمو ئەگەر مافە رەواکانی خۆی پێ بدرێ، زەبروزەنگ و چەوسانەوەی لە سەر لاببرێ، وەکو عەرەب یا بڵێین عەرەبی بەعسی تەماشا بکرێ و هاوولاتی ئاسایی عیراق بێ. ئەو هەمو پارە و خەرجەش لە ئاوەدان کردنەوەی ناوچەکانی و گوزەران و ژیانیدا سەرف بکرێ لە سەر ئەرزی خۆی و باو باپیرانی بمێنێتەوە و چەکدار بکرێ، دیارە شورەیەکی پۆلایین دروست ئەکا بۆ پارێزگاری نیشتمانەکەی... ئەوسا داگیرکەری عیراق مەگەر بە سەر لاشەکەیدا هەنگاو بنێ ئەگینا بە دڵ و گیان بەری پێ ئەگرێ.

لە بری ئەوەی جوتیاری کورد لە ناوچە نەوتاویەکاندا دەربکرێ و عەرەب کێش بکەن، لە جێگەی نیشتەجێیی بکەن، ئەگەر مافە رەواکانی گەلەکەی بسەلمێنن و ئەگەر ئەو پارە و خەرجی لە راگوێزانیدا سەرفی ئەکەن لە گوزەران و خۆش کردنی

ژیانیدا سەرف بکەن، چ پێویست بە ڕاگوێزانی ئەکا، چ پێویست بەوە ئەکا بە چاوی گومان تەماشا بکرێ... بێگومان ئەو کاتە هەر وەک ئەرزەکەی خۆی پاریزگاری لە بیرە ئەوتەکان ئەکا.

دیارە ڕێگەی سەلماندنی مافی کورد و بە یەکسان تەماشا کردنی ڕێگەیەکی ئاسانتر و مسوگەرترە، ڕێگەی جێبەجێ کردنی ئەمنی ستراتیجی پاراستنی یەکێتی و پاشەڕۆژی عیراقە نەک ڕێگەی ڕاگوێزانی کورد و بە غەریب تەماشا کردنی... چونکە ڕێگەی ڕاگوێزان و ئازاردان و چەوسانەوە و تەعریب و تەبعیس کردنی ڕێگەیەکی سەخت و پڕ لە هەڵدێرە، ڕێگەی لێک هەڵوەشانەوەی عیراقە نەک پاراستنی یەکێتی عیراق و گەلی عیراق، هەر بەم ڕێگەیەش ئەمنی ستراتیجی عیراق ئەکەوێتە مەترسیەوە. ٣ ی حوزەیرانی ٨٤

- ٤ -

ئەمنی ستراتیجی عیراق و مەسەلەی (تەبعیس) ی کورد

لە مێژە هەندێ لە کاربەدەستانی حیزبی بەعس، خەریکی هەوڵ و تەقەلایەکی بەردەوامن بۆ ئەوەی ئەوەندەی بۆیان ئەکرێ، بە هۆی دەسەلاتی حوکمەوە کورد بکەن بە بەعسی و فەرهەنگی کوردی بشێوێنن و تەبعیسی بکەن.

هەر چەنەندە سیاسەتی تەبعیس لە سالی ١٩٦٣ەوە سەری هەڵداوە، بەلام پەرەسەندنی بەو شێوە فراوان و توندوتیژە لە پاش ئاشبەتاڵەوە دەستی پێ کردوە. لەو هەلومەرجەدا کە کۆمەلانی خەلکی کوردستان دوچاری ئائومێدی بوبون، بۆ ماوەیەک بێ خاوەن و بێ پاریزەر مابونەوە... دەستە دەستە فەرمانبەر و کرێکار و مامۆستا و خوێندکار و کاسبکار و جوتیار و موختاری کورد بانگ ئەکران. هەڕەشەی دەرکردن و نان برانیان لێ ئەکرا، یان پلە و پایە و پارە و نیش پێ دانیان ئە خستنە بەر دەم، تەنها بۆ ئەوەی ببن بە بەعسی ئەوی لەم خۆ ماندوکردنە و زەبروزەنگ نواندنەشەدا بۆیان کرا بە بەعسی بریتییە لە چەند سەد کوردێک کە لە کۆمەلی کوردەواریدا بە گەندوگو و پۆخلەواتی حیزب و تاقمەکانی تر و کۆمەڵ ناسراون.

شان بە شانی ئەو کارانەی دەرهەق مرۆڤی کورد ئەکرا، دەست کرا بە دەسکاری کردنی بەرنامەکانی پەروەردە و خوێندن، ڕادیۆ و تەلەفزیۆن، گۆڤار و ڕۆژنامەکان، بە شێوەیەکی ئەوتۆ کە فەرهەنگ و مێژووی کورد بشێوێنێ و فەرهەنگی بەعسی بناخنێتە مێشکی. هەروەها دەست کرا بە سەپاندنی مەشقی (طلائع) و (فتوە) لە هەمو قوتابخانەکانی کوردستان دا تا بتوانرێ هەر لە مندالییەوە، کورد بونی خۆیان لە بیر بەرنەوە و فەرهەنگی بەعسی لە مێشکیاندا

بچەسپێنن، ئینجا بۆ ئەوەی ئەو تەگبیرە سەر بگرێ دەست کرا بە بەعسی کردنی مامۆستاکان و دەزگاکانی خوێندن و پەروەردە... بەو جۆرە ئەبو هەر خوێندکارێکی کورد ڕوی بکردایە خانەی مامۆستایان، بۆ ئەوەی وەربگیرێ لە پێشدا ئیستیمارەی بە بەعسی بون ئیمزا بکا... لە زۆر کارگە و دائیرەی دەوڵەتیشدا بۆ ئەوەی کورد کارێکی پێ بدرێ ناچار ئەکرا ببێ بە بەعسی و لە هەمو دائیرەکانیشدا بەعسیەکیان بە ناوی (ضابط ئەمن)ەوە ئەکردە کوێخایان، جگە لەوەش کە بۆ (ترفیع) و (قدم) ئەبوایە بەر لە هەمو شتێ ببێ بە بەعسی.

بەڵام ئایا ئەو هەمو هەوڵ و خۆ ماندوکردنەی ئەو کاربەدەستانە بۆ تەبعیس کردنی کورد و فەرهەنگی کورد لە پێناوی چی دایە و؟ تا ئێستا بەرهەمەکەی چی بوە؟

حیزبی بەعس، حیزبی عەرەبە، ملیونەها عەرەبی عیراقی لە بەردەست دایە، ڕەنگە سەدان هەزار عەرەبیشی کردبێ بە بەعسی... ئیتر بۆ چی دەس لە تەبعیس کردنی کورد هەڵناگرن، کون بە کون بە شوێنیدا ئەگەڕێن، هەر چۆنێ بێ تەبعیسی بکەن...

ئاخۆ لە بەر ئەوەیە کە بە بێ کورد هەڵناکەن... ئاخۆ ئەیانەوێ خێر و خۆشی و ئیمتیازاتی عەرەبی بەعسی بۆ ئەمیش بهێنن، یا ئەیانەوێ پەیامەکەیان بە کورد بگەیەنن بۆ ئەوەی لە ژێردەستی و چەوساندنەوە و پاشکەوتنی کۆمەلایەتی و فەرهەنگی و ئابوری ڕزگاری بکەن؟

ئاخۆ لە بەر ئەوەیە سود لە بەهرەو توانای کورد وەربگرن و حیزبی بەعسی پێ بە هێز و بە توانا بکەن و یەکسانی هاوولاتی عەرەبی عیراق و کوردی عیراق بسەلمێنن؟

یا خود تەبعیس یەکێکە لە سێ چوکڵەی ( تەرحیل و تەعریب و تەبعیس) و پەیوەندی بە نەخشەی (ئەمنی ستراتیجی) عیراقەوە هەیە، ئەو ئەمنی ستراتیجیە کە لە ڕوانگەیەکی شوڤێنی یەوە ڕوی کردۆتە کەم کردنەوە و دەربەدەرکردن و تواندنەوەی کورد و سڕینەوەی شوێنەواری کوردستانی و نەتەوەیی ناوچەکانی.

بەڵێ چونکە کاربەدەستانی عیراق بڕوایان بە کورد نەبوە و متمانەیان پێ ی نەبوە، بە چاوی خائین و نیشتمانفرۆش و پیاوی بێگانە سەیریان کردوە... لە بەر ئەوە ئەوەندەی بۆیان لوابێ لە بری ڕازی کردنی خەڵکی کورد و سەلماندنی مافە ڕەواکانی، کەوتونەتە ویزەی کورد، گوایا بۆ ئەوەی خەتەری کورد لە سەر پاشەڕۆژی عیراق دور بخەنەوە، خەریکی تەرحیل کردن و دەرکردنی کورد بون، خەریکی

بەعسی و شێواندنی فەرهەنگی بون، ناوچەکانی و فەرهەنگەکەیان تەعریب کردوە.

تەبعیسی کورد کە یەکێک بوە لە سێ چوکلەکە، بۆ ئەوە نەبوە نەتەوەی کورد بە لای میری رابکێشێ و، لەو رێگەیەوە برایەتی کورد و عەرەب بە هێز بکا و پاشەرۆژی عیراق و، یەکێتی گەل و ئەرزی عیراق مسۆگەر بکا و لە پارچە بون بیپارێزێ.

تەبعیسی کورد بۆ ئەوە نەبوە کە میری هەوڵ بدات دۆستایەتی کورد بۆ خۆی دابین بکا و لە فیتنی بێگانە و تەفرە خواردن بیانپارێزێ... یا وەک ئەڵێن: دوژمنانی عیراق لە خشتەیان نەبەن و نەیانکەنەوە بە گژ حوکمی عیراق دا.

نەخێر تەبعیسی کورد بۆ هیچ شتێ لەوانە نیە، بەڵکە بۆ بەگژا چونی جولانەوەی شۆرشگێرانەی خەڵکی کورستانە. هەولدانە بۆ لاواز کردنی جولانەوەی کورد و کنە کردن لە کۆمەلی کوردەواریدا.

بۆ ئەوەیە لە لایەکەوە ئەوەندەی ئەکرێ، کورد بە سەر خۆیەوە بکەن بە جاسوس و هەڵسوکەوتی خەڵک و تێکۆشەرانی کۆمەڵی کوردەواری بخەنە ژێر چاودێریەوە و هەر کاتێ ویستیان راویان بکەن. لە لایەکی تریشەوە، هەوڵ بدەن ئەوەندەی بۆیان ئەکرێ، بە زۆر خەڵکی کورد لە جولانەوەکەی دا ببرن، ریسوایان بکەن و بیانشکێنن بۆ ئەوەی وەک مرۆڤیش ئەوانە سوک بکەن، و لە نەتەوەکەیان بشۆرێنەوە و کەڵکی خزمەتکردنی مەسەلەی میللەتەکەی خۆیان نەمێنێ و، ئەگەر بکرێ بشیانکاتەوە بە گژ مەسەلە رەواکەی خەڵکی کوردستان دا.

هەمیشە دەسەلاتدارانی عیراق، هەر یەکەیان لە روانگەی تایبەتی خۆیەوە هەولی ئەوەی داوە کورد لە عیراقدا بەو شێوەیە لە قالب بدا کە لە بەرژەوەندی خۆیەتی... هەر لە زەمانی ئینگلیزەوە تا ئەمرۆ ئەو تەقەلایە بەردەوامە و دەستی لێ هەڵنەگیراوە، مەبەستی بنەرەتی هەمو ئەوانەش یەک مەبەستە ئەویش ئەودیە کە کورد لە عیراقدا داببرن لە نەتەوەی کورد، بە جۆرێ هەست نەکا کە بەشێکە لە نەتەوەی کورد، بەڵکە لە سەردەمی ئینگلیزدا هەوڵ و تەقەلا رو لەوە بو کورد ناچار بێ خۆی بە بەشێ لە بریتانیای گەورە بزانێ... و ئێستاش بۆ ئەوەیە کە بە ناچاری دابیرێ لە هەستی (انتماء) بۆ نەتەوەی کورد و ببێ بە بەشێ لە نەتەوەی عەرەب، لە عەرەبیشدا ببێ بە بەعسی، تا بە ئاسانی و ئاسایی هەمو عیراق بە بەشێکی خاکی عەرەب حساب بکرێ.

ئەگینا ئەگەر بروا و متمانەیان بە کورد هەیە، نەک بە کوردی کوردپەروەر،

تەنانەت ئەگەر بڕوایان بە کوردی بەعسی هەیە:

- لە ناو خەڵکی خانەقینی تەعریب و تەبعیس کراو و ڕاگوێزراودا سەدان کوردی خۆفرۆش و بەعسی هەیە بۆچی ڕێگەیان نادەن ئەوانە بگەڕێنەوە، تەنانەت ئەوانەی بون بە ئەمن و ئیستیخبارات و جەیشی شەعبی و بەعسی.

- لە ناو ئۆردگا زۆرە ملێکاندا سەدان جاش و خۆفرۆش و بەعسی هەیە بۆ متمانەیان پێ ناکرێ و ڕێگەیان نادرێ بگەڕێنەوە گوندەکانی خۆیان.

حیزبی بەعس بەم جۆرە، بەو هەست و هەڵوێستی بڕوا نەبونەوە، بەو سیاسەتەی بە بەعسی کردنەی کورد، قازانجی نەکردوە، نەیتوانیوە سود لە دۆستایەتی و وزە و توانای خەڵکی کوردستان وەربگرێ بەڵکو خۆی ناخۆشەویست و ناشیرین کردوە رق و نارەزایی خەڵکی کوردستانی زیاتر کردوە، لە بریتی نزیک کردنەوەی کورد لە حیزبی بەعس، بۆتە هۆی دور کەوتنەوەی کورد لەو حیزبە، بۆتە هۆی ئەوەی چۆن بەعسی بڕوای بە کورد نیە ئاوا کوردیش بڕوای بەو نەبێ.

ئەگەر بێتو، ئەو هەمو خەرج و هەوڵ و تەقەلایەی حیزبی بەعس ڕوی لە پەیدا کردنی دۆستایەتی کورد بوایە، ڕوی لە پەیدا کردنی متمانەی کورد بوایە بە حوکمەکەی، ئەکرا کورد دۆستێکی بە هێز و بە کەڵکی بوایە. ئەگەر لە بری بە بەعسی کردن و هەوڵی تواندنەوەی، مافە ڕەواکانی دابین بکرایە و بە چاوی یەکسان لە گەڵ عەرەبی بەعسی تەماشا بکرایە، ئەوا ئەکرا کورد دۆستێکی ئەمین و دڵسۆزی بوایە... ئەو کاتە نەک مەترسی لە کورد نەئەبو، نەک پێویستی نەئەکرد بە زۆر بیکردایە بە بەعسی بەڵکو ئەیتوانی دڵنیا پشتی لێ بکاتەوە و بەشێکی دور و درێژی سنوری نیشتمان پارێزراو بێ لە هەمو جۆرە پیلان و هێرش و پەلاماردانێکی دوژمنانی عیراق. ٤ ی حوزەیرانی ٨٤

- ٥ -

ئایا مانەوەی وەزعی نائاسایی کوردستان لە قازانجی کێیە؟

ئەوی، لەم هەلومەرجەی ئێستای کوردستان دا، بە وردی چاوێک بە شوێنە جیا جیاکانی کوردستان و لایەنە جۆراوجۆرەکانی کۆمەڵی کوردەواری دا بخشێنێ، ڕەنگە سەیری لێ بێ کە سەرەڕای ڕاوەستاندنی شەڕ لە کوردستان دا کە چی باری نائاسایی هەمو لایەنێکی ژیانی کوردایەتی گرتۆتەوە بە بێ ئەوەی خاو بونەوەی ئەو بارە و ئاسایی بونەوەی بکەوێتە بەر چاو.

هێشتا سەدان کوردی سیاسی کە لە سەر جولانەوەی کورد گیراون لە زیندانەکانی میری دان و چەندین کەسیشیان لە ژوری سێدارە چاوەڕوانی

بە[illegible]ێکی نادیار نەکەن، سەرەڕای ئەوەی یەکێتی نیشتمانی کوردستان پەیتا پەیتا داوای ئازاد کردنیان ئەکا.

هێشتا هەزاران کورد دەربەدەری دەرەوەی عیراقن، زۆربەیان بە پەرۆشەوە ئەیانەوێ بگەڕێنەوە نیشتمان و ناو کەسوکاری خۆیان، بەڵام نازانن چارەنوسیان چی لێ بەسەر دێ.

سەدان فەرمانبەر و کرێکار و موچەخۆری تریش کە بە هۆی هەلومەرجی پێشوی کوردستان و بە هۆی جولانەوەی شۆرشگێرانەی میللەتەکەمانەوە لە کار و ئیشی خۆیان دەر کراون، چاوەڕوانی ئەوەن چارەسەری کێشەکەیان بکرێ و بگەڕێنەوە سەر کار و پیشەی خۆیان و ماڵ و منداڵیان لە دەست باری سەختی گوزەران و ژیان ڕزگار بکەن.

سەدان خوێندکاری کورد کە گیراون، لە خوێندن دەرکراون بە هۆی سیاسی و لە سەر جولانەوەی شۆرشگێرانەی کورد بە تەمای ئەوەن قاپی کۆلێج و پەیمانگا و قوتابخانەکانیان بۆ بکرێتەوە و بگەڕێنەوە خوێندنی خۆیان تەواو کەن، کە چی تازە هی تریان لێ دەر ئەکرێ و زانکۆ و پەیمانگاکان قاپی لە رویان دا دائەخەن.

خەڵکی سەدان گوندی ڕاگوێزراوی کوردستان کە بە زۆر ڕەوانەی شوێنی تر کراون یا پەرش و بڵاو کراونەتەوە یا خزێنراونەتە ئۆردوگا زۆرە ملێیەکانەوە، هەر دەربەدەرن و لە زەویوزار و کانی و کارێز و ڕەز و باخ و کوردستانی باو و باپیرانیان قەدەغە ئەکرێن.

هێشتا هەزاران خێزانی عەشایەری عەرەب، کە بە زۆر هێنراون بۆ تەعریبی کوردستان، لە سەر خاکی زەوت کراوی جوتیاری ڕاگوێزراوی کوردستان ماونەتەوە و نەگەڕاونەتەوە شوێنی ئەسڵی خۆیان.

هێشتا چەندین هەزار هاوڵاتی کوردی بارزانی بێ سەر و شوێن و چارەنوس بزر چاوەڕوانی سەرفراز بون ئەکەن و چەندین هەزار خێزانی بارزانی بە جێ ماو و بێ کەس و کار و لە هەمو خزمەتی ئینسانی بێ بەش بە ئومێدی گەڕانەوەی کوڕ و باوک و برایان شەوان ڕۆژ ئەکەنەوە. بە هەزار کوردی فەیلی لە وڵات دەرکراویش دەربەدەری وڵاتانن و ئەپرسن ئاخۆ کەی لەو مەینەتیە دەرباز ئەبن.

هێشتا، سەرەڕای ئەوەی کە دیمەنی گۆڕەپان و شەقامی شارەکانی و ڕێگە و بانی نێوان شار و لادێ ی کوردستان، بە سەدان ئوتومبیل و تانکی زرێپوش و پڕ لە چەکدار، سەدان ڕەبیەی سەربازی سەر لوتکەی شاخ و سەر گرد و تەپۆڵکەکان، ئەک وڵاتێکی پڕ شەڕ و کێشە ئەهێنێتە بەرچاوی مرۆڤ، بەڵکو ئەگەر بێگانەیەک چاوی

پێ بکەوێ وڵاتێکی داگیرکراوی دێتە بەر چاو. ئەمانە هەمو جگە لەوەی کە دەیان مۆڵگەی جاش دژی کۆمەڵانی خەڵک و جوڵانەوەکەیان پەرەیان پێ ئەدرێ و هەوڵ و کۆششی میری ڕوی کردۆتە دامەزرانی دەیانی تریش بە ناوی (افواجی) سوکەوە، ئەمانە هەمو لە تەک دەزگاکانی تردا بە بێ هیچ دودڵی و لێکدانەوەیەک دەست وەرئەدەنە ژیانی هاووڵاتی کوردەوە و هیچ بەرگرتنێکی میریش نیە بۆ پاراستنی ژیانی شەخسی هاووڵاتی.

ئەمانە هەمو جگە لەوەی کە هێشتا لە زۆر شوێن بە زۆرە ملی هاووڵاتی کورد، فەرمانبەر و کرێکار و خوێندکار و مامۆستا و هونەرمەند و ئەدیب ناچار ئەکەن کە ببن بە بەعسی یا جەیشی شەعبی، وە لە هەمو بوارێکی دامەزراندن لە کار و مەرکەزی گرتنی دەوڵەتدا لە تەرفیع و لەزەماڵە و لە خوێندن و لە نیشتەجێ بوندا جیاوازی زەق و ڕەق لە بەینی کورد و غەیری کوردا ئەکرێ، تەنانەت کورد لە شاری کەرکوکی کوردستان دا بۆی نیە وەک هیچ هاووڵاتیەکی تری عیراق خانو دروست بکا و زەوی بۆ خۆی بکڕێ و بە سەربەستی تیا بژی.

ئەم هەمو شتە ناناسایییانە، سەرەڕای شەڕ ڕاوەستاندن و بۆ پێشەوە چونی وتوویژ ڕەنگی بارودۆخی کوردستانی ڕشتوە و هەندێ دەستە و تاقم چ لە ڕیزی جوڵانەوەی کوردا و چ لە لای میری سورن لە سەر مانەوەی ئەم بارە ناناسایییەی کوردستان، بۆیە ئەپرسین مانەوەی وەزعی ناناسایی کوردستان لە قازانجی کێ دایە؟

- گەڕانەوەی سەدان گوندی ڕاگوێزراو، گەڕانەوەی دەیان هەزار جوتیاری دەربەدەر بۆ ناوچەکانی خۆیان، جگە لەوەی کە ئەبنە هێزێکی گەورەی بەرهەم هێنان لەشکرێکی گەورە و لە شکاندن نەهاتوی ئەوتۆ پێک ئەهێنێ کە وەکو گیانی خۆی لە دژی پەلاماردانی ئێران، دیفاع لە بەشێکی دور و درێژی سنور بکا و ئەو کاتە میری ئەتوانێ زۆری ئەو هێزە سەربازیەی لەو شوێنانە سەنگەری بەستوە، یا لە سەر قوتەی شاخ و گرد و تەپۆڵکەکانی کوردستان ڕەبیەی لێداوە، بیبات بۆ جەبهەکانی جەنگ لە سەر سنوری ناوەڕاست و خواروی عیراق بۆ تێک شکاندنی پەلاماردانی بێگانە.

- بە هەڵوەشاندنەوەی جاش و (افواج) ی سوک و نەهێشتنی دەستدرێژی بۆ سەر خەڵکی کوردستان و ڕێگە گرتن لە دەست وەردانی ئەوانە و (منظمە) و (امن) و (استخبارات) و چەکداری تر لە ژیانی شەخسی هاووڵاتی کوردا و بە جێبەجێ کردنی ئیسلاحی زەراعی بە قازانجی جوتیاران و، ڕێگە گرتن لە بوژانەوەی دەرەبەگایەتی، لە ژێر چەتری ئاشتی و سەلماندنی مافە ڕەواکانی کوردا، لە جێگەی

چەند دەستەیەک چەکداری کرێ گرتە و دەرەبەگ هەمو خەڵکی کوردستان ئەبنە شورەیەکی قایم بۆ پاراستنی نیشتمان و پوچەڵ کردنەوەی پیلانی دوژمنان و شکاندنی هێرش و پەلاماردانی داگیرکەری ئێرانی.

- بە بەردانی زیندانیە سیاسیەکان و برا بەرزانیەکان و خۆش کردنی زەمینەی گەڕانەوەی کوردە فەیلیەکان و پەنابەرە سیاسیەکان و ساز کردنی دەرفەتی دیمۆکراتیانە بۆ بەشداری تەواوی خەڵک کە حوکمڕانی خۆی و خزمەتی گەل و نیشتماندا، دڵخۆشی و متمانەیەکی وا بە کاربەدەستان پەیدا ئەبێ کە هیچ پێویستیەکیان نەمێنێ بە زیندان و تۆقاندنی خەڵک بۆ پاراستنی دەسەڵاتی حوکم، بەڵکو ئەو خەڵکەی ئازاد ئەبێ و مافی دیمۆکراتی خۆی دەسگیر ئەبێ، خۆی ئەبێتە شورەیەکی پۆلایین بۆ پاراستنی ئاسایشی وڵات.

- بە دەست هەڵگرتن لە سیاسەتی تەبعیس و زەبروزەنگ نواندن بۆ ئەوەی چەند سەد کوردێک بکەن بە بەعسی یان جەیشی شعبی، بە ڕێگەدان بە ڕێکخراوە سیاسی و دیمۆکراتی و پیشەییەکانی کوردستان، ئەتوانن نەک هەر ئەو حاڵەتە نەهێڵن کە کورد لە حیزبی بەعس دور ئەکەوێتەوە و بە زاڵم تەماشای ئەکا، بەڵکو لە سێبەری ئاشتی و برایەتی و سەلماندنی مافی کوردا بە هۆی ئەو ڕێکخراوانەوە هاوپەیمانی بە هێز پەیدا بکا و دۆستایەتی میللەتی کورد مسۆگەر بکا. تا هەمو کۆمەڵانی خەڵکی عیراق یەک ڕیز بە گژ دوژمنانی گەل و نیشتمان دا بچن و خەریکی پاراستن و گەشەپێدانی عیراق بن.

بەمجۆرە لابردنی باری نائاسایی کوردستان بە قازانجی گەل و نیشتمان ئەگەڕێتەوە، یەکێتی خەڵکی عیراق پتەو ئەکا، گومان و دودڵی ناهێڵێ، بەرگری لە پاراستنی عیراق خورت و بە توانا ئەکا، زەمینەی گەشە کردن و پێشکەوتن خۆش ئەکا و پیلانەکانی دوژمنانی گەلی عیراق تێک ئەشکێنێ.

کە چی مانەوەی ئەو وەزعە نالەبار و نائاساییە، ئەبێتە مایەی بەدبینی و بێ بڕوایی خەڵکی کوردستان، ئەبێتە هۆی پەیدا بون و گەشە کردنی دژایەتی کردنی دەسەڵاتی حوکم لە عیراق دا، ئەبێتە مایەی دڵ ڕەنجانی جوتیاران، کرێکاران، خوێندکاران، هونەرمەندان، ئەدیب و نوسەران، مامۆستایان و کاسبکاران لە کوردستان دا، ئەبێتە مایەی ئەوە کە هەمو کەس لە کوردستان دا چاوەڕوان بن، هەوڵیش بدەن ڕۆژێ زوتر لەم حکومەتە ڕزگار بن کە ئەم وەزعە نائاساییەی بۆ ساز کردون.

بەوا تایەکی تر ئەبێتە هۆی لاواز کردنی جبهەی ناوخۆی عیراق و تێکچونی

ئەرزوی هێز لەو جەنگە چارەنوس سازەدا کە خەڵکی عیراق دوچاری بون.
بەڵام ئایا نەهێشتنی وەزعی نائاسایی لە کوردستان دا بە قازانجی کێ و مانەوەی لە بەرژەوەندی کێیە؟
هەمو ئەو لایەن و کەس و تاقمانەی، پاراستن و پێشکەوتن و بۆ پێشەوەچونی عیراقیان مەبەستە، هەمو ئەوانەی بە هێز بونی جەبهەی ناوخۆی عیراق و برایەتی کورد و عەرەب و سەرکەوتنی هەوڵ و تەقەلای دڵسۆزانە و مەسئولانەیان گەرەکە بۆ چارەسەر کردنی مەسەلەی کورد بە ئاشتی، هەمو ئەوانەی دژی هەڵگیرسانەوەی شەڕی شوم و وێرانکەرن لە کوردستان دا، نەهێشتنی وەزعی نائاسایی کوردستان بە قازانجی خۆیان و مەسەلە نیشتمانیەکەیانە.
هەمو ئەو کەسانەش کە لە سەر حیسابی برایەتی کورد و عەرەب، لە سەر حیسابی جەبهەی ناوخۆی عیراق، لە سەر حیسابی لاواز بونی بەرگری عیراق دژی داگیرکەران و، لە سەر حیسابی شەڕ و پشێوی لە کوردستان دا خەریکی دەوڵەمەند بون و بەد ئەخلاقی و خۆ قایم کردنن، مانەوەی وەزعی نائاسای کوردستان بە قازانجیانە. ئینجا ئەوانە چ لە ریزی میری دا بن یا کۆنەپەرستانی کورد بن، کە ئەوانەش بیانەوێ یان نەیانەوێ، راستەوخۆ یان ناراستەوخۆ خزمەتی دوژمنانی عیراق ئەکەن، خزمەتی داگیرکەرانی ئێران ئەکەن و تیاچونی عیراق و پارچە پارچە بونی عیراقیان ئەوێ. ٥ ی حوزەیرانی ٨٤

- ٦ -

مافی مرۆڤ لە ژێر سایەی حکومەتی عیراق دا

رێزگرتن لە مافی مرۆڤ و پاراستنی کەرامەتی، هەم بنچینەی دامەزراندنی سەربەستی و ئاشتی و دادپەروەریە، هەم پێوانەی رێز و رەوا بون یا نارەوایی و خراپی هەر رژێم و دەسەڵاتێکی حوکمە.
فەرامۆش کردنی مافی مرۆڤ و پێشێل کردنی گەلێ جار بۆتە هۆی ئەوە کە کاری وا دزێو و ناشیرین دەرحەق مرۆڤ بکرێ، کە ویژدانی مرۆڤایەتی ئازار بدا و بیهەژێنێ.
لە بەر ئەوە هەمو دەوڵەتانی پێشکەوتوی دنیا، رێزگرتنی مافی مرۆڤ و پاراستنی کەرامەتیان کردوە بە بەردی بناغەی یاسا و بەرنامەی کاری سیاسی و بەرێوەبردنی سەرجەم کاروباری دەوڵەت و کۆمەڵ و، چەندین یاسای تایبەتیان بۆ حورمەت گرتنی ماف و کەرامەتی مرۆڤ جێگیر کردوە.
ئەو دەوڵەتانەش کە بەشداریان کرد لە رێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان دا، لە

بەر دەمی هەمو دەوڵەتان و میللەتانی دنیا و ویژدانی خۆیان دا، بەڵێنیان دا کە بە تەواوی ئیلتیزام هەم بە بڕوانامەی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان و، هەم بە (بەیانی جیهانی مافی مرۆڤ) ەوە بکەن و، چیتر مافی مرۆڤی ولاتانی خۆیان فەرامۆش نەکەن و کەرامەتی پێشێل نەکەن.

بەو پێیە ئەبو هەمو حزکمڕانەکان لەوە بگەن کە (مرۆڤ هەمو بە ئازادی و یەکسانی لە ماف و کەرامەت دا لە دایک ئەبن، و عەقڵ و ویژدانیان پێ بەخشراوە، ئەبێ بە گیانی برایەتی لە گەڵ یەکتر رەفتار بکەن).

وە کە (هەمو کەس مافی ئەوەی هەیە بە ئازادی بەشداری هەر کۆڕ و کۆبونەوەیەکی هێمنانە بکات و هەرگیز نابێ کەس ناچار بکرێ بچێتە هیچ جۆرە ڕێکخراوێکەوە).

وە کە (نابێ هیچ مرۆڤێ بە زۆر بگیرێ یا حیجز بکرێ، وە نابێ هیچ مرۆڤێ ئەشکەنجە بدرێ یا رەفتاری درندانە و رەقەکاری لە گەڵ بکرێ، نابێ سزای قورس بدرێ یا کەرامەتی بریندار بکرێ).

عیراق، وەک یەکێک لەو دەوڵەتانەی لە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان دا بەشدار بوە و، بەڵێنی بەو دەوڵەتە بەشدارانە و بە ڕای گشتی جیهان داوە کە ئیلتیزام بە بڕوانامە و بەیانی مافی مرۆڤەوە بکا و، حورمەتی ئازادی و مافی مرۆڤ بگرێ و، ڕێگە نەدا کەرامەتی مرۆڤ پێشێل بکرێ. کەچی یەکێکە لەو حکومەتانەی لە کۆنەوە ناوی دەرکردوە بەوەی کە حورمەتی مافی مرۆڤ ناگرێ و پێشێل کردنی مافی مرۆڤ و کەرامەتی ئینسان بۆتە نەریتێکی جێگیر لە لای داو و دەزگاکانی حکومەتی عیراق.

سەرەڕای ئەوە کە هەندێ فەقەرەی دەستوری عیراق لە بارەی مافی مرۆڤ و حورمەت گرتنی کەرامەتیەوە ئەدوێ، وە یاسای (ئوصولی محاکمەی جەزائی عیراق) ساڵی ١٩٧١، هەندێ ڕێوشوێنی تایبەتی دائەنێ بۆ ئەوەی کەس بە ئارەزو نەگیرێ و نەخرێتە ژێر ئەشکەنجە و ئازاردانەوە.

سەرەڕای ئەوە کە عیراق جارێکی تر لە ٢٥ / ١ / ١٩٧١دا پەیمانی ناو دەوڵەتی مافی مەدەنی و سیاسی مرۆڤی ئیمزا کردوە، وە سەرەڕای ئەوەی کە چەندین جار لیژنەی مافی مرۆڤ لە جنیف سەرنجی کاربەدەستانی عیراقی ڕاکێشاوە بۆ ئەوە کە حورمەتی کەرامەت و مافی مرۆڤ ناگیرێ و بڕوانامەی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان و بەیانی جیهانی و مافی مرۆڤ لە عیراق دا پێشێل ئەکرێ.

کەچی هاووڵاتی عیراقی لەسەر سادەترین (اخباریە) و راپورت کێش ئەکرێ بۆ لێپرسینەوە و لێدان و هەڵواسین، لە کاتێک دا دەیان دەزگا لە عیراق دا دروست کراوە بۆ گرتن و لێدان و گوم کردن و هەڵواسین و کوشتن و دەسدرێژی بۆ سەر مافی مرۆڤایەتی هاووڵاتی، بەڵام هیچ دەزگایەک نیە بۆ پارێزگاری و لەسەر کردنەوەی هاووڵاتی کە دەسدرێژی ئەکرێتە سەر.

لە وەتەی دەوڵەتی عیراق دامەزراوە کاربەدەستانی حکومەت بۆ پارێزگاری حوکمەکەیان هەمیشە پەنایان بردۆتە بەر رێگەی زەبروزەنگ بۆ سەرکوتکردن و لە ناوبردنی موعارەضە، تەنانەت ئەگەر موعارەضەکە چەکدار و توند و تیژیش نەبوبێ، بەڵکو هێمنانە و سیاسی و لەسەرخۆش بوبێ.

نمونەی ئەو زەبروزەنگ نواندنە بێ جێیە، ئەگەر چی مێژوی دەسەڵاتدارە یەک لە دوا یەکەکانی عیراقی پڕ کردوە، هەر لە مانگی رابوردودا، لە مانگرتنی هێمنانەی خوێندکارانی کوردستان دا لە شاری هەولێر و کەرکوک و سلێمانی، کاربەدەستانی دەزگاکانی کەوتنە گیانی خوێندکاران و لە شاری کەرکوک بە ناهەق و بە ناڕەوا خوێندکار نەجات ئیسماعیل و لە سلێمانیش شەش کەسیان شەهید کرد و ئێستاش دەیان کەس لە گیراوەکانی ئەو مانگرتنە هێمنانەیە لە سەردابەکانی دائیرەکانی ئەشکەنجە و لێدان دا ماونەتەوە.

ئازادی و دیمۆکراتی و سەربەستییە شەخسیەکانی هاووڵاتی عیراقی لە هیچ کات و سەردەمێکا حورمەت نەگیراوە و نەبوە، جێگەی داخە ئەمە بۆتە تەقلیدێک لە حوکم کردنی عیراق دا و، چەندین حکومەت هات و رۆیشت و گۆڕا، کەچی وەزعی ئازادی ئینسان و پارێزگاری کەرامەتی مرۆڤ هەر وەکو خۆی ماوەتەوە.

ئێستاش پاش دوو جار لێبوردنی گشتی زیندانیە سیاسیەکان و، پاش هەوڵ و ماندوبونێکی زۆری یەکێتی ی نیشتمانی بۆ بەردانی چەند سەد گیراوێکی سیاسی تر، زیاتر لە هەزار کورد لە لە سەر مەسەلەی سیاسی جوراوجۆر گیراون لە زیندانەکانی میری و گرتوخانەکانی دەزگاکان دان،کە لە وانە زیاتر لە ٢٠ کەسیان لە ژوری سێدارەدان و مەرگ هەڕەشەیان لێ ئەکات. لە گەڵ ئەم وتارەدا ناوی لیستەیەکی بلاوئەکەینەوە.

ئێستاش زیاتر لە چوار هەزار کوردی بارزانی لە گرتوخانەیەکی تایبەتی نەناسراودا بێ سەر و شوێنن، لە هەمو مافێکی مرۆڤ و لەهی گیراوی سیاسی بێ بەشن، تەنانەت بۆ ساڵێک ئەچێ رێگەی (مواجهە) ی هیچ کەسێکیان نەدراوە، بەبێ ئەوەی کە بە ئاشکرا محاکەمە کرابن یان تاوانەکانیان ئاشکرا بێ. کە

بیمومان ٨٠ ٪ی ئەوانە بەبێ تاوان و ڕەش بگیر لە زیندان خزێنراون.

هەروەها سەدان مرۆڤی سیاسی عەرەب گیراون و لە زیندانەکان دا ماون و هەندێک لەوانە بێ سەر و شوێنن.

لە گەڵ ئەوەدا کە حکومەتی عیراق چەندین بەڵگە و پەیمانی ناودەوڵەتی مۆر کردوە دژی ئەشکەنجە و لێدان و هەڵواسینی مرۆڤ، لە دەستوری عیراقیش دا ئەشکەنجەدان قەدەغە کراوە و، بە چەندین یاسای تری عیراقی ڕێ لەوە گیراوە کە بە زۆری لێدان و ئازاردان (اعتراف) لە گیراوی سیاسی وەربگیرێ.

کەچی ئەشکەنجەدان، بوە بە مەسەلەیەکی ئاسایی و بە بەرچاوی لێپرسراوانەوە هەمو دەزگاکانی ئەمن و ئیستیخبارات و هی تر ئەشکەنجە لە گەڵ هاووڵاتی عیراقی دا بە کار ئەهێنن ئەگەر لەسەر سادەترین اخباریە گیرابێ.

ڕێکخراوی لێبوردنی جیهانی (ئەمنستی) و لێژنەی مافی مرۆڤ لە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان چەندین جار ناڕەزایی و بێزاری خۆیان لەسەر لێدان و ئەشکەنجەدانی گیراوی سیاسی بە لێپرسراوانی حکومەتی عیراق گەیاندوە.

کە چی بە تەنها لە کاتی خۆپێشاندانە گشتیەکانی کوردستان ساڵی ١٩٨٢ لەو خەڵکەی لە کاتی خۆپێشاندانەکان گیران زیاتر لە ١٠٠ خوێندکار و هاووڵاتی کورد لە ژێر لێدان و ئەشکەنجەدا لە ناوچون و تا ئێستاش بێ سەر و شوێنن.

ئێمە لە کاتێک دا داوا لە کاربەدەستانی حکومەتی عیراق ئەکەین کە کارێکی وا بکات حورمەتی کەرامەت و مافی هاووڵاتی عیراقی بگیرێ و بروانامەی نەتەوە یەکگرتوەکان و بەیانی جیهانی مافی مرۆڤ پێشێل نەکرێ و، داوا ئەکەین گیراوە سیاسیەکان ئازاد بکرێن و سنورێک بۆ لێدان و ئەشکەنجەدان دابنرێ، داوا لە هەمو ئازادیخواز و ڕێکخراوەکانی مافی مرۆڤ و پاراستنی مافی زیندانی سیاسی و لە هەمو دەوڵەتانی پێشکەوتوی دنیا و ڕای گشتی جیهانی ئەکەین کە: داوا لە حکومەتی عیراق بکەن گیراوە سیاسیەکان ئازاد بکرێن. ٦ ی حوزەیرانی ٨٤

- ٧ -

حکومەتی عیراق و گەمەی موفاوەضات

یەکێک لەو مەسەلە سەرەکییانەی کە بۆتە هۆی دواکەوتن و دەرد و بەڵای گەلانی ڕۆژهەلات نەبونی ئازادی و سەربەستی و هەبونی (استبدای شرقی)یە.

استبدادی شرقی بە درێژایی چەندین قەرن بۆتە نەریتی باو و زاڵی حوکمڕانی لە هەمو ناوچەی ڕۆژهەلات دا.

ئینسان لەسەر پچوکترین داوای ڕەوای خۆی لە وانەیە نەک هەر ئازار بدرێ، بەڵکو لەوانەیە بە ناهەق بە ئەشکەنجە و ئازار بکوژرێ.
یەکێک لەو دەوڵەتانەی پڕەپڕی وشەی (استبدادی شرقی) تێدا بوتە نەریتی حوکمرانی، دەوڵەتی عیراق بوە لەوەتی دامەزراوە.
لە عیراق دا ئازادی پێکەوەنانی حیزب و نەقابە و ڕێکخراو نەبوە.
لەعیراق دا ئازادی مانگرتن و خۆپێشاندان نەبوە.
ئازادی ڕۆژنامەنوسین و دەربڕینی بیروڕا و داوا و ڕەخنە نەبوە.
بەڵکو لە عیراق دا مافی مرۆڤ هەمیشە پێشێل کراوە و نەبێ ئینسان لەو قەفەزەدا بجوڵێتەوە کە دەوڵەت بۆی دیاری کردوە ئەگینا تووشی سزادان ئەبێ، جا لە وەزعێکی وادا کە ئازادی و ژیانی دیمۆکراتی و ژیانی پارلەمانی، نە بە مەعنای راستەقینە و نە بە مەعنای روکەش نەبێ، ئینسان دوو ڕێگەی لە بەردەمدایە:
یا سەر شۆڕکردن بۆ واقیعی حاڵ و ڕازی بون بەو چارەنوسەی بۆی دیاری کراوە کە بریتیە لە دیلی و زەلیلی.
یا خود بەرەنگاری و ڕوبەڕوبونەوە و یاخی بونی تاک و بە کۆمەڵ لە ڕوی واقیعی حاڵ واتە (استبداد)ا ئەگەرچی ناخۆش یا نائومێدانەش بێ.
لە بەر ئەوەی میللەتی کورد هەرگیز دەوڵەتی خۆی نەبوە تا بزانین لەویش دا هەر (استبدادی شرقی) زاڵ ئەبو و، مافی مرۆڤ پێشێل ئەکرا یا ڕێچکەیەکی تری ژیانی ئەگرت، بەڵکو میللەتی کورد هەمیشە بێ دەوڵەت و ژێردەستە و چەوساوە و زوڵم لێکراو بوە، لە ژێر باری جەور و زوڵمی (استبدادی شرقی) دا ناڵاندویەتی. بەڵام جێگەی سەربەرزییە بۆ هەمو کوردێک کە میللەتی کورد بە درێژایی مێژوی خۆی، لە هیچ زەمان و لە هیچ زەمینێکدا سەری شۆڕ نەکردوە بۆ واقیعی حاڵ و زوڵم و زۆر و ئیستیبداد و دیلایەتی قبوڵ نەکردوە، بۆیە بەشێکی مێژوی ڕۆژهەڵاتی ناوەراست پێکدێ لە شەڕ و شۆڕی کورد لە گەڵ دەوڵەتانی ناوچەکە.
نەتەوەی کورد، ئەگەرچی دەوڵەتیشی نەبوە، بەڵام ئەگەر لە گەڵ نەتەوە گەورەکانی دەوروپشتی دا وەکو عەرەب و فارس و تورک بەراورد بکرێ لە بواری بینا کردنی شارستانیتی و حەزارەتی ڕۆژهەڵات و ئیسلام دا، هەر لە کاروباری دروستکردنی پرۆژەی کانیاوی گوندێکەوە تا نوسینی قووڵ لە مەسەلەکانی علومی ئیسلامی و فەلسەفی دا، تا کاروباری عەسکەریی گەورەی وەکو شەڕی سەلیبییەکان، کورد هیچی کەمتر نەبوە لە نەتەوەکانی دەوروپشتی، لە گەڵ ئەوەش دا مێژوی ناوچەکە تاکە یەک ڕوداو ناگێڕێتەوە لە سەر ئەوەی کورد کەرەتێک ئەرزی

نەتەوەیەکی تری داگیر کردبێ یا دەسدرێژی کردبێتە سەر مافی میللەتێکی تر، بەڵکو بە درێژایی تاریخ هەر کورد ئەرزی داگیر کراوە و مافەکانی پێشێل کراوە و دەسدرێژی کراوەتە سەر و ئەیان هێشتوە بەو چەشنە بژی کە خۆی ئەیەوێ، هەر لە بەر ئەمەش بوە چەک، ڕاپەڕین و شۆڕش و زەبروزەنگی شۆڕشگێڕانە دژی دەوڵەتانی داگیرکەری ناوچەکە بەشی گەورەی مێژوی نەتەوەی کورد پێک ئەهێنێ. ڕەنگە موبالەغە و خۆهەڵکێشان نەبێ کە ئەگەر بڵێین ئەوەش ڕەنگدانەوەی پرۆسەی جۆری پێکهاتنی تایبەتی نەتەوەی کورد و گەشە کردنی بێ، کە هەرگیز زوڵم و زۆر و نیهانە و دەسدرێژی پێ قوبوڵ نەکراوە.

گەلێک جار نوسەرانی بێگانە کە لە سەر کوردیان نوسیوە، وایان لە قەڵەم داوە کە کورد زۆر حەزی لە یاخی بون و گوێ نەدانە قانون و چەک هەڵگرتنە، لە ڕاستی دا ئەمە بینینی ڕوکەشی مەسەلەکەیە، چونکە ڕاستە کورد هەمیشە لە حاڵی یاخی بون و بەرهەڵستیی قانونی زۆردارانەی دەوڵەتانی ناوچەکەدا بوە، بەڵام کورد بۆیە ئەو ڕێگەیەی گرتوە چونکە هیچ ڕێگەیەکی تری لە بەر دەم دا نەبوە. نەی توانیوە بە ڕێگەی سیاسی و هێمنانە داوا و نامانج و ویست و خواست و ئاوات و، تەنانەت ئەو زوڵم و چەوسانەوەیەی بە سەریەوە بوە، بخاتە بەر چاوی خەڵک و کاربەدەستان، ڕێگەی نەدراوە حیزب و ڕێکخراوی تایبەتی خۆی دروست بکا، گۆڤار و ڕۆژنامەی تایبەتی خۆی بڵاو بکاتەوە، بۆ دەربڕینی نارەزایی مانگرتنی بێدەنگ و هێمن یا خۆپێشاندانی بێدەنگ و هێمن بکا، پارلەمان و کۆڕ و کۆبونەوەی ئازاد نەبوە قسەی خۆی تێدا بکا. بە پێچەوانەوە کاربەدەستانی بێگانە لە کوردستان دا هەمیشە بە ئاگر و ئاسن وەڵامی گەلی کوردیان داوەتەوە جگە لە ڕێگەی بە کار هێنانی زەبروزەنگ و خەباتی چەکدار، کورد وتەنی جگە لە زمانی تفەنگ هیچ ڕێگە و بوار و مەیدانێکیان بۆ نەهێشتۆتەوە کاری تێدا بکا، بۆیە کوردیش بە ناچاری ڕێگەی خەباتی چەکداری گرتوە، لاشمان وایە ئەوە هەم ئەرک و هەم مافی هەمو نەتەوە و گەل و چین و تاقمێکە کە لە ڕووی زوڵم و چەوسانەوەدا ڕابپەڕێ و دەس بداتە چەک و پەنا بباتە بەر زەبروزەنگ، ئەگەر زوڵم و زۆر و چەوسانەوە و نیهانەی قوبوڵ کرد شایستەی حورمەت و ڕێزلێنان و پشتیوانی نیە.

تەنیا ڕێگەی هەمو جار کاربەدەستانی ناچار کردبێ گوێ لە داواکانی کورد بگرن شۆڕش و دەسدانە چەک بوە، کاربەدەستانیش تا لە ڕێگەی بە کارهێنانی زەبروزەنگی عەسکەری و پۆلیسی بۆ کوژاندنەوەی شۆڕشی کورد نائومێد نەبوبن، ئامادە نەبوم گوێ لە ئاهو ناڵەی کورد بگرن، بۆیە:

هەم کورد کە بەرامبەرەکەی ئامادە بوبێ گوێ لە داواکانی بگرێ ڕێگەی موفاوەضەی گرتوە وەکو یەکێک لە شێوەکانی خەباتی گەلی کورد.

هەم کاربەدەستانیش کە ئانومێد بون لە ڕێگەی بە کارهێنانی چەک دژی گەلی کورد ڕێگەی موفاوەضەیان گرتوە وەکو گەمەیەک بۆ شکاندنی شۆڕشی گەلی کورد.

بزوتنەوەی ڕزگاری نیشتمانیی گەلی کورد قەرنێک زیاترە، بە پێی تێگەیشتنی زانستی، دەستی پێکراوە، وە لەو قەرنەش دا گۆڕان و گەشەکردنی قوڵ و بنەڕەتی بەسەر شێوە و ناوەڕۆکی بزوتنەوەکەدا هاتوە، لە ڕوی ناسینی دۆست و دوژمن و ناسینی سروشتی ناکۆکیەکان و ناسینی ئوسلوبی خەبات و تێکۆشانی قۆناغی جۆراوجۆر، لە گەڵ ئەوەش دا موفاوەضە لە بەینی بزوتنەوەی ڕزگاری گەلی کورد و کاربەدەستان دا هێشتا وەکو ئوسلوبێک بۆ تێکشکاندنی شۆڕشی کورد لە لایەن کاربەدەستانەوە هەر بەردەوامە، ئەگەرچی تەجروبەی نەتەوەی کورد بە درێژایی قەرنی ڕابوردو لە گەڵ موفاوەضەدا هەتا بڵێی تاڵ و ناخۆش بوە، چونکە پڕی بوە لە پیلانگێڕی و غەدر و دەگە لێدان.

بزوتنەوەی ڕزگاری نیشتمانیی گەلی کورد کەم جار لە مەیدانی عەسکەری دا شکستی خواردوە، بەڵکو زۆر جار شەڕی بردۆتەوە، کەچی لە مفاوەضەدا واتە لە خەباتی سیاسی و لە مەیدانی سیاسی دا زۆر جار شەڕەکەی دۆڕاندوە، چونکە هەروەکو پێشتر وترا مفاوەضە هەمیشە تیغێکی دودەم بوە:

هەم کورد ویستویەتی بە کاری بهێنێ بۆ دەربڕینی خواست و ویست و ئێش و ئازارەکانی.

هەم کاربەدەستان ویستویانە بە کاری بهێنن بۆ تێکشکاندنی شۆڕشی کورد ئیتر سا یان بە پیلانگێڕان و گرتن و لە ناو بردنی سەرکردەکانی شۆڕشەکەیان، بە کڕین و سوک کردنیان و کوژاندنەوەی شۆڕشەکە.

ئەمجارەش کە سەرکردایەتی یەکێتی نیشتمانی کوردستان پاش پرس کردن بە هەمو کادرە عەسکەری و سیاسیەکانی خۆی و، بە زۆربەی ڕۆشنبیرانی گەلەکەمان و کەسانی خاوەن ڕەئی و، ژمارەیەکی زۆری پیاو ماقوڵانی شار و دێهات، دەربارەی مفاوەضە، لە دوای نۆ ساڵ خەباتی خوێناوی و هەشت ساڵ خەباتی بێوچانی چەکدار، بڕیاری دا داخلی مفاوەضە بێ لە کاتێکا هەمو تەجروبە تاڵ و ناخۆشەکانی مفاوەضەی کورد و کاربەدەستانی لە شەستەکان و حەفتاکانی سەدەی بیستەم دا لە بیر بو، وە لە کاتێکا لە چەندین لایەن و تاقمی ناحەزەوە درۆ و بوختانی بە پاڵ درا

و له چەندین تاقمی دۆستەوە رەخنە و گلەیی هاتە سەر.

بەلام هەروەکــو دیاریکردنی ســەرەتای مــانگی حــوزەیرانی ١٩٧٦ بۆ هەلگیرسانەوەی شۆرش و خەباتی چەکدارانە دژی کاربەدەستانی عیراق راست و لە شــوێنی خــۆی دابو، ئەگــەرچی زۆر لایەن و حــیــزب و تاقم و دەولەت دژی بون و هەندێکیان بە خۆکوژییان دانەنا، هەروەها هەلبژاردنی کۆتایی ٨٣ و سەرەتای ٨٤ یش بۆ دەسکران بە مفاوەضە راست و لە شوێنی خۆی دابو، بەلام بەشی هەرە زۆری گــەلی کــوردیش لە عــیــراق دا پشــتــیــوانی لەو هەنگاوە کــرد، چونکە هەر دوو هەنگاوەکە:

هەم دەســپــێکردنەوەی شــەر لە ٧٦ دا، بە شــێوەی پارتیــزانی درێژە پێدانی خەباتی چەکداری گەلی کورد بو.

هەم دەسپێکردنەوەی مفاوەضە لە ٨٤ دا، بە شێوەی سیاسی درێژە پێدانی خەباتی ســیــاسی گــەلی کــورد بو، وە لە شــۆرشی کــوردا هەردوکــیــان یەکــتــری تەواو نەکەن.

ئەوا شــەش مانگە مفاوەضەیە لە بەینی گەلی کورد و کاربەدەستانی عیراق دا:

گەلی کــورد مــفــاوەضــە ئەکــا بۆ ئەوەی بە مــافــە رەواکــانی خــۆی بگات، بۆ ئەوەی خـــواست و ویــست و ئاوات و ئامــــانج و ئێش و ئازارەکـــانی خـــۆی بە کاربەدەستانی عیراق رابگەیەنێ.

حکومەتی عیراقیش مفاوەضە ئەکا بۆ ئەوەی کۆتایی بە شۆرشی کورد بهێنێ و بیکوژێنێتەوە.

هەلــبــەتە لێرەدا پرســیــارێکی گــرنگ دێتە پێشەوە کــە واتە بۆچی یەکــێتــی ی نیشتمانی بریاری مفاوەضەی دا لە کاتێک دا شۆرشی گەلی کورد لەوپەری بە هێزی دا بو لە روی عەسکەری و سیاسییەوە و، حکومەتی عیراق خەتەری ئێران بەلکو خەتەری روخانی لەسەر بو، وەلامی ئەم پرسیارە هەلئەگرین بۆ ئەلقەی داهاتو. ٧ ی حوزەیرانی ٨٤

- ٨ -

گەلی کورد و گەمەی موفاوەضات

کــاتێ یەکــێــتــی ی نیــشــتــمــانی ی کــوردســتــان داخلی مــفــاوەضــە بو لە گــەلّ حکومــەتی عــیــراق دا پاش هەشت ســالّ شــەری خوێناوی، چەندین کــەس و لایەن و حیزب و رێکخراو، تەنانەت چەند دەولەت، ئیتر لە روی دلسۆزی و هەست کردنەوە

بێ بە مەسئولیەت بە رامبەر گەلی کورد، یا لە ڕوی نامەردی و دوژمنایەتی یەکێتییەوە بێ، یەکێتییان خستە ناو قەفەزی محاکەمەوە یا ئەو پرسیارەیان بەرەو ڕو نەکردەوە کە بۆچی یەکێتی ی نیشتمانی لەو کاتەدا کە هێرشی ئێران گەرم بو لەسەر عیراق و خەتەری سەرکەوتنی ئێران و شکانی عیراق لە کایەدا بو شەڕی وەستان و کەوتە مفاوەضە؟

لێرەدا پێش ئەوەی بچینە سەر باسەکە چاک وایە سەرلەنوێ دو مەسەلەی گرنگ کە هەمیشە لەهەمو بڕیارەکانی یەکێتی دا ڕەنگی داوەتەوە دوبارە بکەینەوە:

یەکەمیان، یەکێتی نیشتمانی کوردستان لە وەرگرتنی هەمو هەڵوێستەکانی دا قازانجی کۆمەڵانی خەڵکی کوردستانی لێک داوەتەوە و، بە گوێرەی پێویستیەکانی هەلومەرجی مەوزوعیی کوردستان هەنگاوی ناوە، نەک بە پێ ی فەرمان و نەسیحەت و قسەی ئەم و ئەو، یا بە پێ ی بوختان و درۆ و جنێو و قسەی ئەم و ئەو، بەڵکو هەمیشە وەکو ڕێکخراوێکی سەربەخۆ بیری کردۆتەوە و بڕیاری داوە و ڕەفتاری کردوە.

دووەمیان، لە بەر ئەوەی یەکێتی ی نیشتمانی ی کوردستان هەمیشە قازانجی کۆمەڵانی خەڵکی کوردستانی لە بەرچاو گرتوە، بێ ئەوەی گوێ بداتە دەسکەوتی تایبەتی بۆ یەکێتی ی نیشتمانی وەکو ڕێکخراو یا وەکو ئەفراد، بۆیە هەمیشە لە هەمو مەسەلەیەک دا توانیویتی زۆر بە جورئەتەوە بێ ترس و سڵەمینەوە بڕیار بدا و هەنگاو بنێ.

هەر لەبەر ئەوەش بو، کە لە تاریکستانی ئاشبەتاڵ دا، لە کاتێک دا عیراق و ئێران ڕێک و تەبا بون، بڕیاری دا سەر لە نوێ ئالای شۆڕش و بەرەنگاری لە کوردستان دا هەڵ بکاتەوە و، لە گەرمەی شەڕ و دەسوەشاندنیش دا لە هێزەکانی عیراق، لە کاتێک دا عیراق و ئێران لە گەرمەی جەنگ دا بون، توانی بڕیار بدا شەڕ بوەستێنێ و داخلی مفاوەضە ببێ لە گەڵی، بێ ئەوەی پرس بە کەس بکا جگە لە گەلەکەی خۆمان و، بێ ئەوەی گوێ بداتە قسەی کەس جگە لە میللەتەکەی خۆمان.

یەکێتی ی نیشتمانی ی کوردستان لە زەعیفییەوە یا خود لە ئەنجامی شکان و کۆڵدان دا نەکەوتە مفاوەضە بەڵکو لەو کاتەدا کە داخلی مفاوەضە بو، هەم لە ڕوی پێشمەرگەییەوە لە سەرکەوتن دا بو، هەم لە ڕوی سیاسیەوە لە هەڵوێستێکی بەهێز دابو، ی ن ک، بە پێچەوانەی هەمو درۆ و دەلەسەکانی لایەنەکانی جودەوە کە لە ئێرانەوە ئەوەڕین، دەیان ئەبەردی گەورەی بە سەرکەوتویی لە سەرانسەری کوردستان دا ئەنجام دابو، شەڕی گەیاندبوە ئەو پێدەشتانەی کە لە شۆڕشی

نێولیش دا نەی گەیشتبویە، پێشمەرگە و جەماوەری شار و لادێ ی لە خەبات دا تێکەڵاو کردبو، سنوری ناوچەی ئازاد و بنکە و بارەگاکانی یەکێتی چەن قات فراوانتر کرد و لە قوڵایی کوردستانی عیراق دا جێگیر بو، هێزی پێشمەرگەیش لە روی تاکتیکی کارەوە لە چالاکی پچوکەوە چوبوە قۆناغی گەورەوە و، لە قۆناغی خۆپاراستنەوە چوبوە قۆناغی هێرش بردنەوە، ئەمە سەرەڕای ئەوەی هەمو هێزەکانی جودی بە کۆمەڵ شکاند و ریسوا کرد.

جا کە ی ن ک نە لە روی سیاسیەوە و نە لە روی پێشمەرگەییەوە لاواز نەبو، بەڵکو بە هێز بو، شۆڕشی گەلی کورد لە مەترسی دا نەبو، بەڵکو عیراق لە مەترسی دابو، شۆڕشی گەلی کورد پێویستی بە وەستاندنی شەڕ نەبو، بەڵکو عیراق پێویستی بە وەستاندنی شەڕ هەبو، کەواتە بۆ چی ی ن ک لەو کاتەدا کەوتە مفاوەضە؟

لە وەڵامی ئەمەدا ئەڵێین: دروست لەبەر هەمان هۆ، واتە لەبەر ئەوەی عیراق لە مەترسی دا بو، وە پێویستی بە وەستاندنی شەڕ هەبو. شتێکی شاردراوە نیە کاربەدەستانی عیراق چەندین ساڵە خەریکی جێبەجێ کردنی نەخشەی لە ناو بردنی کوردن، هەر وەکو لە وتارەکانی پێشودا رون کرایەوە، نەتەوە پەرستەکانی عەرەب کورد بە غەریب ئەزانن وا نیدیعا ئەکەن کە وەکو میوان لەسەر ئەرزی عەرەب دانیشتوە، لە بەر ئەوە رێگە و شوێنی دەرپەڕاندن و لە ناو بردن و تواندنەوەی دائەنێن و، بە شێکی زۆریشیان بە بەهانەی ئەمنی ستراتیجی عیراقەوە جێبەجێ کردوە.

هەڵگیرسانی جەنگ لە نێوان عیراق و ئێران دا، هەم فرسەتێکی بۆ گەلی کورد هەڵخست ئەگەر بیەوێ سود لە ناکۆکی ئەو دو دەوڵەتە وەربگرێ، هەم گوشار و زەغتی عەسکەری لەسەر پێشمەرگە کەم کردەوە و هێزی پێشمەرگە توانی چاکتر لە روی چەندایەتی و چۆنایەتیەوە گەشە بکات. لەو شەڕەدا کورد دەورێکی ئەوتۆی نەبو، هەروەکو دەستی لە هەڵگیرساندنی یا خود لە یارمەتیدانی کاریگەری لایەک دژی لاکەی تریان دا نەبو، تەنانەت مەیدانی شەڕەکەیش دور بو لە کوردستان، هەتا جاشەکانی ق . م کەوتنە گێچەڵ کردن بە شۆڕشی کوردستانی ئێران و یارمەتی هێزەکانی ئێرانیان دا لە پەلاماردانی بنکەکانی پێشمەرگە و گرتنی ناوچە ئازادەکانی کوردستانی ئێران دا بەو جۆرە شەڕیشیان خستە کوردستانەوە، کە ئەمەش یەکێک لە گەورەترین تاوانە تاریخیەکانی (ق . م) ە لە مێژووی گەلی کوردا.

کاربەدەستانی عیراق کە خۆی لە ئەسلا لە بەهانە بون لە گەلی کورد و چەندین ساڵە خەریکی جێبەجێ کردنی نەخشەی لە ناوبردنی گەلی کوردن لە عیراق دا، ئەو فرسەتەی بە هەل زانی بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی بەرنامەدار کار بکەن بۆ خۆشکردنی زەمینەی قەناعەتی ویژدانی لە لای نەتەوەی عەرەب بە گشتی و، گەلی عەرەب لە عیراق دا، وە لە ناو دام و دەزگای جەیش و هێزە چەکدارەکانی تردا بە تایبەتی، کە: گوایە کورد نەک هەر بەشداری عیراق ناکا لە شەڕدا، بەڵکو خائینە و، لە پشتەوە خەنجەری ژەهراوی لێ ئەدا و، ئەو شکست و زەرەرانەی لە شەڕدا لە گەڵ ئێران لێ ی ئەکەوێ، ئۆباڵەکەی لە ئەستۆی کوردایە، بۆ ئەوەی گەلی عەرەب لە ڕوی فکرییەوە ئامادە بکا کە وەکو میللەتێ بەشدار بن لە لەناوبردنی میللەتی کوردا، هەروەکو دەوڵەتی عوسمانی کە لە شەڕی ڕوس دا شکا، ئۆباڵەکەی خستە ملی ئەرمەن و ئەوەی کرد بە بەهانە بۆ قەتلوعامی ئەرمەن، وە ئاڵمانیا کە لە جەنگی جیهانیی یەکەم دا شکا ئۆباڵەکەی خستە ملی جولەکە و ئەوەی کرد بە بەهانە بۆ قیەتلوعامی جولەکە، کاربەدەستانی عیراقیش ئەیانویست ئۆباڵی شکانەکەی خۆیان کە هەمو کەسێکی ژیر و بە ویژدان ئەزانێ هۆی تری هەیە بخەنە ملی کورد و ئەوە بکەن بە بەهانە بۆ قەتلوعامی، لە کاتێک دا کە ئەوە فری بە سەر ڕاستییەوە نیە، چونکە ئەوە پێنج ساڵە چەن ملیون کورد لە ئێران دا لە شۆڕش دان دژی ڕژێمی ئێرانی، وە لە کوردستانی عیراقیش دا لە چەن دەستەیەکی دورە وڵاتی لە ناو خەڵک دا سوک و ڕیسوا بەولاوە کەسێکی کە هاوکارییەکی ئەوتۆیان لە گەڵ حکومەتی ئێران دا نەکردوە دژی عیراق و ئەگەر ژمارەی ئەوانەش لە گەڵ ژمارەی ئەو عەرەبانەدا بەراورد بکرێ کە هاوکارییان کردوە لە گەڵ ئێران ڕەنگە سەد بەرامبەر زیاتر بێ، لە کاتێک دا کە بەشداربونی نەتەوەی کورد بە قازانجی هەر کام لەو دوو دەوڵەتە، چ عیراق و چ ئێران، تەرازوی هێزەکانیانی بە جورێکی ئەوتۆ نەگۆڕێ، کە لە وانە بو چارەنوسی جەنگەکە بە یەکجاری بڕیار بدا.

ی ن ک وەکو گەورەترین هێزی سەربەخۆ و بە جورنەت نیسپاتی کرد کە گیروگرفتی کورد لە گەڵ ئێران و عیراق گیروگرفتێک نیە دەسکردی ئەو دەوڵەتانە یا لە ئەنجامی ناکۆکی ئەو دو دەوڵەتە بێ، بەڵکو گیروگرفتی گەلی کورد گیروگرفتی گەلەکە خۆی و زەوت کرانی مافەکانێتی. دەوڵەتەکانی عیراق و ئێران لە شەڕ دا بن یان ڕێک و تەبا بن، تا مەسەلەی کورد بە چارەسەرنەکراوی مابێ، گیروگرفت و شۆڕشی کوردیش هەر ئەمێنێ، چونکە شەڕکردن یا ڕێککەوتنی کورد لە گەڵ ئەو دەوڵەتانە نەبەستراوە بە شەڕ یا ڕێککەوتنی عیراق و ئێرانەوە بەڵکو بەستراوە بە

سەلماندنی مافەکانی گەلی کورد و، بە زەوتکردن و پێشێلکردنی مافەکانیەوە.
بۆیە شکانی عیراق یا ئێران لەو شەڕەدا بەندە بە بیروبۆچون و فەلسەفەی حوکمڕانی خۆیان و عامیلی ناوەوە و دەرەوەی هەر یەکەیان، نەک بە دڵسۆزی یا خیانەتی گەلی کوردەوە، کاربەدەستانی عیراق ئیتر ناتوانن بەهانەی هاوکاری کورد لە گەڵ ئێران بکەن بە بیانو بۆ لە ناوبردنی کورد یا بیکەن بە مادەیەک بۆ هاندانی جەیشی عیراق و هێزە چەکدارەکانی تر و گەلی عەرەب لە عیراق دا دژی گەلی کورد، چونکە گەلی کورد لە پێناوی مافە ڕەواکانی خۆی دا جەنگیوە، نەک لە پێناوی ئەم دەوڵەت یا ئەو دەوڵەت، وە کاتێکیش کاربەدەستانی عیراق ئامادەیی خۆیان دەربڕی بۆ چارەسەرکردنی کێشەی نەتەوایەتی گەلی کورد و لابردنی زوڵم و چەوسانەوە لە سەری بە ڕێگەی هێمنانە، وا گەلی کوردیش پێشوازی لەو ئامادەییە کرد. بەڵام پێ ئەچێ ئەمجارەیش وەکو هەمو جارەکانی تری مێژوی مفاوەضاتی بەینی کورد و کاربەدەستانی عیراق:.
کورد کەڵک لە مفاوەضە وەربگرێ بۆ دەربڕینی خواست و ویست و داوا و ئاوات و ئامانج و ئێش و ئازارەکانی، واتە بۆ چارەسەرکردنی کێشە کۆنەکەی.
کاربەدەستانیش کەڵک لە مفاوەضە وەربگرن وەکو گەمەیەک بۆ تێکشکاندنی شۆڕشی کورد، نەک وەکو ئوسلوبێک بۆ چارەسەرکردنی کێشەی نەتەوایەتی گەلی کورد.
لەمەیش دا بە پێچەوانەی هەمو جارەکانی ترەوە، ئەگەر جارەکانی تر مەسئولیەتی تێکچونی مفاوەضە دابەش بوبێ بە سەر کاربەدەستانی عیراق و سەرکردایەتی جوڵانەوەی کورد و هەندێ لای تردا، هەر لایەکیان بە پێی خۆی، ئەوا ئەمجارەیان مەسئولیەتی تێکچونی مفاوەضە ئەکەوێتە ئەستۆی کاربەدەستانی عیراق، نەک هیچ لایەنێکی تر، چونکە ی ن ک گەمەی مفاوەضات ناکا. ٨ ی حوزەیرانی ٨٤
لەم کاتەدا کێ مەسەلەی خوێندکارانی تەقاندەوە؟
لە کاتێک دا، وتوێژ لە نێوان یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان و میری دا بۆ پێشەوە ئەچو، هەنگاوێکی باشی نابو، ئا لەم کاتەدا دەستەیەکی شەڕخوازی میری بە دەستی ئەنقەست و بۆ تێکدان و پەکخستنی وتوێژ و نوێ کردنەوەی ئانارامی و تێکدانی برایەتی و یەکێتی ڕیزەکانی خەڵکی عیراق و سەپاندنەوەی شەڕ بەسەر میللەتەکەمان دا کێشەی خوێندکارانیان خولقاند و بەرە بەرە ئاگرەکەشیان خۆش کرد.

چونکە ئەو دەستەیە هەمیشە زەرەری لە پتەوبونی برایەتی کورد و عەرەب و ئاشتی دایە و قازانجیان لە هەڵگیرسانەوەی شەڕ دایە چاک شارەزای سازکردنی کێشە و گیروگرفتە، ئەزانێ دەرکردنی دەیان خوێندکاری کورد لە خوێندنی زانکۆ پەرە ئەسێنێ و ئەتەنێتەوە، خوێندکاران هەمو ئەگرێتەوە و پاشان هەزاران خێزان و بنەماڵەی کورد ئەگرێتەوە و لە ئەنجام دا بەشێکی زۆری خەڵکی کوردستان ڕائەکێشێتە کێشەوە و بار و دۆخی کوردستان ئاڵۆز ئەبێ و کۆسپ و تەگەرە لە پێش دەمی وتوویژی یەکێتی و میری دا دروست ئەکات.

لە کاتێک دا خوێندکارانی کوردستان خەریکی خۆ ئامادە کردن بون بۆ پێشوازی کردنی تاقی کردنەوەکانی کۆتایی ساڵ لە باتی ئەوەی کە هان بدرێن باشتر کۆشش بکەن و زیاتر خۆ بۆ تاقی کردنەوە ساز بدەن، ئەو لایەنە شەڕخوازە ئەخشەی ئەوەی دائەنا بە زۆر کێشیان بکا بۆ شەڕ، بە زۆر خوێندکارانی کوردی ناچار ئەکرد بچێ لە ئۆردوگاکانی "جەیشی شەعبی" دا تەدریب بکا. ئەو لایەنە شەڕخوازە شۆڤینیە بە چەشنێ کەوتە هەڕەشەکردن و زەبروزەنگ نواندن بەرامبەر خوێندکاران، کە مرۆڤ وابزانێ ئەنجامی جەنگی عیراق - ئێران، شکست و سەرکەوتنی بەرگری عیراق بەرامبەر هێرشی داگیرکەرانی ئێران لەسەر "تەدریب" کردنی چەند سەد خوێندکارێکی کورد وەستاوە.

ئەوە بوو ئەوانە کەوتنە تەنگ هەڵچنین بە خوێندکارانی کوردی زانکۆ، بۆ ئەوەی ناچار بکرێن بە زۆر ڕەوانەی تەدریب بکرێن، لە ئەنجامی قسایل ئەبونی خوێندکاران دا دەیان خوێندکاری کورد لە خوێندن دەرکران و ئەوەش خوێندکارانی ڕاکێشا بۆ ئەوەی بە مانگرتنی هێمنانە نارەزایی و بێزاری خۆیان بەرامبەر ئەو ڕەفتارانە دەربڕن کە دەرحەقیان ئەکرێ.

هەندێ لە لێپرسراوە داخ لە دڵەکانی کوردستان، ئەوانەی کە لە هەلومەرجی شەڕ و نائارامی دا، خەریکی دەوڵەمەندبون و گیرفان پڕکردن و دزی و بەدخویی بون، کەوتنە گیانی خەڵکی مانگرتووەوە چەندین کەسیان لێ کوشتن و بریندار کردن. وە بە بیانویەکی باشیان زانی بکەونە گیانی خەڵکی شارەکانی کوردستان هەر بۆ ئەوەی گفتوگۆ تێک بدەنەوە، وە بەم جۆرە هەلومەرجی کوردستانیان ئاڵۆزاند و کەوتنە قوت کردنەوەی کۆسپ و تەگەر لە ڕێگەی چارەسەری هێمنانەی مەسەلەی کوردا.

هەندێک لایەنی کۆنەپەرستی کوردیش کە بە مەسەلەکە و هەلومەرجە ئاڵۆزەکەی زانی کەوتە هەوڵ و تەقەلای نائومێدانە و قۆستنەوەی کێشەی

خوێندکاران بۆ قازانج و دەسکەوتی تایبەتی حیزبایەتی خۆیان.
بێگومان ئەو دو دەستە شەڕخوازە، شۆڤینیەکانی کە لە ناو کاربەدەستانی میری دان وە لایەنی کۆنەپەرستی کورد، کە بە تەنگ ڕژانی خوێنی کورد و عەرەبەوە نایەن، یەک مەسەلە بۆ شێواندنی دۆخی کوردستان کۆیان ئەکاتەوە ئەویش پەک خستنی هەوڵدانی دڵسۆزانە و مەسئولانەیە بۆ چارەسەر کردنی مەسەلەی کورد بە ئاشتی، وە تێکدانی وتوێژ و ئاڵوزکردنی بار و دۆخی وڵات و سەپاندنەوەی شەڕی ناڕەوا بەسەر میللەتەکەمان دا.
ئێمە لە کاتێک دا ئەو دو دەستە شەڕخوازە نیاز خراپە بۆ کۆمەڵانی خەڵک دەست نیشان ئەکەین وە داوا ئەکەین بە پەلە کێشەی خوێندکارانی کورد چارەسەر بکرێ، وە ڕێگە نەدرێ هەوڵی خراپی ئەو تاقمە سەر بگرێ.
ئەو ڕاستیە دوپات ئەکەینەوە کە بە دەرکردن یا گێڕانەوەی ژمارەیەک قوتابی زانکۆی کورد، مەسەلەی خوێندکاران گۆڕینێکی قوڵی بە سەردا ئایەت یا خود چارەسەر ناکرێ. چونکە تاقە ڕێگەی چارەسەرکردنی کێشەی خوێندکارانی کوردستان بەوە ئەبێ کە کێشەی کورد بە شێوەیەکی هەمە لایەنە لە عیراق دا چارەسەر بکرێ کە کێشەی خوێندکارانیش بەشێکی بچوکی ئەو مەسەلەیە گەورەیەیە. بەوە ئەبێ کە فەرق و جیاوازی نێوان خوێندکاری کورد و خوێندکاری عەرەبی بەعسی نەمێنێ و کاروباری بەڕێوەبردن و نەخشە دانانی گەشە کردنی قوتابخانە و زانکۆ و پەیمانگاکان و بەرنامەکانی خوێندنیان لە دەست ئەو کەسانەوە کە واقیعی کوردستان تێ ناگەن و ڕەچاوی ناکەن، یا نایانەوێ تێ بگەن بکەوێتە دەست کورد خۆی، هەر لەبەر ئەوەشە یەکێتی نیشتمانی کوردستان لە وتوێژدا و لە یاسای ئۆتۆنۆمی کوردستان دا داوای دامەزرانی ئەمانەتی پەروەردە و فێرکردن و خوێندنی باڵای بۆ کوردستان کردوە، تا بە تەواوی خوێندکاری کوردستان لە دەست چەوسانەوەی جیاوازی لە گەڵ کردن و سەپاندنی عەقڵی ئەم و ئەو بە سەریا دەرباز بێ و بە بێ ئەوەی داوای ئەوەی لێ بکرێ ببێ بە بەعسی قاپی هەمو کولێج و پەیمانگاکانی بۆ بکرێتەوە و لە ناردن بۆ خوێندنی هەندەران دا غەدری لێ نەکرێ.

*

سێیەمین کۆنفرەنسی کۆمەڵە

لە تەمموزی ١٩٨٤ دا سێیەمین کۆنفرەنسی کۆمەڵە لە هەواری کانی سێو لە بناری پیرەمەگرون دا بەسترا. ٢٣ مانگ بە سەر کۆنفرەنسی دوەم دا تێپەڕی بو. لەم کۆنفرەنسەدا ٢٨٧ نوێنەر و ١١ ئەندامی چاودێر بەشدار بون.

له ڕوی تەمەنیانەوە: ٤٤ ئەندامی لە نێوان ٢٠ - ٢٤ و، ١٧ ئەندامیان لە نێوان ٢٥ - ٣٠ و، ٧٤ ئەندامی لە نێوان ٣١ - ٣٥ و، ٣٤ ئەندامی لە نێوان ٣٦ - ٤٠ و، ١٨ ئەندامی بەرەوژوری ٤٠ ساڵ بون.

له ڕوی پیشەوە: ٥٤ ئەندامی کرێکار و، ٧ جوتیار و، ١٥٣ موچەخۆری پچوک و فەرمانبەر و، ١٤ موچەخۆری ناونجی و، ٤٩ ئەندامی پیشەی جیا جیا و خوێندکار، لەوانە ٥ نافرەت و، ١٠ کاسبکار. من ڕاپۆرتی سیاسی و، دەزگای ناوەندی ڕێکخستن ڕاپۆرتی سیاسی، ئایدیۆلۆجی، ڕێکخراوەیی و پێشمەرگەیی خوێندەوە. یەکێتی نوسەران، هونەرمەندان، مامۆستایانی کوردستان، نامەی پیرۆزبایییان نارد بو.

له کردنەوەی کۆنفرەنسەکەدا مامجەلال ، نوێنەری یەکێتی شۆڕشگێران و، د. قاسملو نوێنەری حیزبی دیموکراتی کوردستان و، ئیبراهیمی عەلیزادە نوێنەری سازمانی کوردستانی حیزبی کۆمۆنیستی ئێران ئامادە بون، هەر یەکە وتاری تایبەتی خوێندەوە.

دەربارەی گفتوگۆ کۆنفرەنس بڕیاری دا: «بە هەڵسەنگاندنی هەلومەرجی تایبەتی ناوچەکە و وڵات، وە بە ڕەچاوکردنی ئەو ڕاستییەی کە گفتوگۆ بۆتە یەکێک لە شێوەکانی خەباتی جولانەوەی کورد، پاش ورد بونەوە لە لایەنی سەلبی و ئیجابی گفتوگۆ ئەو بۆچونەی پەسند کرد: کە سەرەڕای ناسینی ماهییەتی ڕژێم و، سەرەڕای ئەوەش کە حکومەت لە گفتوگۆ دا ناجیددیە و، تاقیکردنەوە ئەو ڕاستییەی سەلماندوە کە هەمیشە لە بەڵێنەکانی پاشگەز ئەبێتەوە، بەلام هەوڵ بدرێ گفتوگۆ تا دوا چۆری بگوشرێ و بەر لەوە ئەپسێنرێ تا مەسئولیەتی مێژوویی پساندن و ئەنجامە خراپەکانی بکەوێتە ئۆباڵی ڕژێمی بەغداد. بە مەرجێ گفتوگۆ بەرامبەر مومارەسەی خراپی ڕژێم دەست بەستمان نەکا.»

گفتوگۆ و باسەکانی ناو کۆنفرەنس ٦٨ سەعات زیادتری خایاند.

لەم کۆنفرەنسەدا چەند کەسێکی نوێ کە لە ڕێکخراوی شارەکان دا کاریان ئەکرد هەڵبژێردران بە ئەندامی سەرکردایەتی، لەوانە کۆسرەت و، بە ئەندامی ئیحتیاتی سەرکردایەتی، لەوانە د. خەسرەو خاڵ، عومەر فەتاح، دلێر ئەحمەد شوکری.

پێڕەوانی ڕێبازی توندڕەو نەیانتوانی زۆرایەتی بە دەس بهێنن و، بیروبۆچونەکانی خۆیان بسەپێنن، بەڵێنیشیان دا ڕێزی بڕیارەکانی کۆنفرەنس بگرن.

*

کۆنفرەنسی شۆڕشگێڕان
بۆ هەڵسەنگاندنی هەلومەرجی کوردستان و ڕێکخستنەوەی کاروباری ڕێکخراوەیی، هەر لەم ماوەیەدا، یەکێتی شۆڕشگێڕان کۆنفرەنسی خۆی لە مێرگەپان بەست. گفتوگۆکانی ناو کۆنفرەنس بە هێمنی و تەبایی کرا و، هەڵبژاردنەوەی سەرکردایەتی تێ دا ئەنجام درا.

*

خولێکی تری گفتوگۆ
دۆخی ئاڵۆزاوی کوردستان و، ساردی نێوان یەکێتی و بەعس بە درێژایی مانگەکانی مایس، حوزەیران، تەمموز بەردەوام بو.
ڕۆژی ۲۰ ی تەمموز، سەعدی مەهدی صالح هاتە سورداش و، داوای کرد کە گفتوگۆ دەس پێ بکرێتەوە و، ئەوان ئامادەن بۆ پێشوازی وەفدی یەکێتی.
ڕۆژی ۲۵ ی تەمموز وەفدی یەکێتی بە ڕێ کەوتن بەرەو بەغداد.
ڕۆژی ۲۸ ی تەمموز لە بارەگای قیادەی قطری عیراق کۆبونەوەی هاوبەش دەستی پێ کرد.
وەفدی یەکێتی پێک هات بو لە: فەرەیدون عەبدولقادر، عومەر عەبوڵلا، عومەر عەزیز، بە سەرۆکایەتی د. فوئاد مەعصوم.
وەفدی عیراق پێک هات بو لە: فاضیل بەرڕاک، مەحمود شوکر شاهین، د. مونذیر ئال شاوی، عەبدولفەتاح ئال یاسین، بە سەرۆکایەتی عەلی حەسەن مەجید.
ئەو ٤ (ورقە) یەی یەکێتی ئامادەی کرد بو، کرا بو بە بەرنامەی گفتوگۆی ڕۆژانەی کۆبونەوەکان.
ئەم خولەی گفتوگۆکان لە هەمو خولەکانی پێشو و، خولەکانی دوایی ڕێکوپێکتر بو.
۸ دانیشتنی سەرەکی و چەند کۆبونەوە و دیدەنی لاوەکییان کرد بو.
۲ کۆبونەوەی تریشیان لە گەڵ کرد بون، یەکێکیان، لیواڕوکن مەحمود شوکر شاهین لە گەڵی کرد بون بۆ ڕونکردنەوەی (المحاور الاستراتیجیە) کە پێویستن بۆ پاراستنی عیراق لە هێرشی ئێرانی، تورکی، سوری. کۆبونەوەی دوەمیان وەکیلی وەزیری نەوت لە وەزارەتی نەوت لە گەڵی کرد بون بۆ ڕونکردنەوەی ئەو ناوچانەی نەوتیان تێ دایە. لەم دو کۆبونەوەیەش مەبەستیان ئەوە بوە، بە وەفدەکەی بسەلمێنن: ئەو شوێنانەی ناخرێنە سەر ناوچەی ئۆتۆنۆم، لە بەر ئەوەیە کە یان بۆ پاراستنی عیراق پێویستن، یاخود حەوزی نەوتیان تێ دایە، لە بەر ئەوە ئەبێ بە

دەس حکومـــەتی ناوەندیەوە بێ نەک دەســـەڵاتی ئۆتۆنۆم. دواتر بەعس ناویشی خستۆتە پاڵ ئەو شتانەی کە ئەبێ بەڕێوەبردنی بە دەس بەغدادەوە بێ.

لە ســـەر هەندێ مــەســـەلە پێک هات بون، لەوانە: ئاســـاییکردنەوەی هەلومەرجی کوردستـان و کەرکوک و، دەسەڵاتەکانی داوودەزگای ئۆتۆنۆم. لە سەر هەندێ مــەســەلەش ڕێک نەکــەوت بون بە چارە نەکــراوی مــابونەوە، دانرا بـون مامجەلال لە گەڵ صەددام یەکلای بکەنەوە، لەوانە: دیاریکردنی سنوری ناوچەی ئۆتۆنۆم و، پەیماننامەی جوقت (میثاق الجبهه الوطنیه القومیه التقدمیه).

ئەو پەیمانە، لە بابەتی ئەوە بو کە لە ۱۹۷۳ دا لە گەڵ حشع مۆریان کرد بو، ئەمە بە هیچ جۆرێ بە یەکـێـتی قـوبوڵ نەئەکـرا، چونکە یەکـێـتی لە کوردایەتی ئەشۆردەوە. بەعس ئەیویست هەمو شت بە یەکەوە بە لادا بخا و، هیچ مەسەلەیەک بە هەڵواسراوی بە جێ نەهێڵێ. جێبەجێ کردنی ئەوەی لە سەری ڕێک کەوت بون بەست بو بە موافەقەتی یەکێتیەوە لە سەر میثاقەکە.

وەفدەکە دوای لێبونەوە لە دانیشتنە سەرەکییەکان لە گەڵ عیززەت دوری کۆ بوبوەوە. ڕۆژی ۲۳ ی ئاب وەفـدی یەکـێـتی گـەڕایەوە سـورداش. لە کـۆبونەوەی سـەرکـردایەتی یەکـێـتی دا کـەوتینە لێکۆڵینەوەی بەڵگەکـان. هەندێ لەوانەی لە سەری پێک هات بون کەموکوڕییـان تێ دا بو پێـویسـتـیـان بە پێ دا چونەوە و باس کردنەوە هەبو.

*

ناکۆکیەکانی بەعس - یەکێتی

ناکـۆکـیـەکـان لە گەڵ بەعس ئەتوانرێ بکرێن بە دو بەشی جیاوازەوە: ناکـۆکی سیاسی و، ناکۆکی ئەرزی.

ناکۆکی سیاسی

لە عـیــراق دا بڕیاری سـیـاسی بە دەس کـێـیـە؟ بە دەس (المجلس الوطنی)؟ ئەنجومەنی وەزیران؟ (قیاده قطر العراق) ی حیزبی بەعـس؟ (مجلس قیاده الثوره) یە؟ یان بە دەس هێزێکی نەبینراوی غەیبیە؟ لە کاتی گفتوگۆدا ئەم کێشەیە بە زەقی هەستی پێ ئەکرا بە تایبەتی لە دو مەیدان دا: یەکێکیان، مەیدانی بەشداری کورد لە دەسەڵاتی ناوەندی دا. ئەوی تریان، لە مەیدانی دەسەڵاتی حوکمی زاتی دا.

بیروبۆچونەکانی یەکێتی لە گەڵ بەعس بە تەواوی لە یەکتری جیاواز بون.

. یەکـێـتی لای وابو، کـە عـیـراق پێـک دێ لە دو نەتەوەی سـەرەکی عـەرەب و کـورد، هەروەک لە دەسـتـوری کـاتیی عـیـراق دا نوسـراوە، لە بەر ئەوە ئەبێ لە هەمو

شتێک وا بەشی هەبێ و، بەشدار بێ لە داڕشتن و دانی بڕیاری سیاسی دا.
یەکێتی باوەڕی بە دیموکراسی و پلورالیزم و، بە ئازادی حیزبایەتی و ڕۆژنامەوانی و، دابەشکردنی دەسەلاتەکان بە سەر دەسەلاتەکانی تەشریعی، تەنفیزی، قضائی دا هەبو، وەکو ئەوەی باوە لە ولاتانی دیموکراتی دا لە دنیادا.
یەکێتی لە ڕێکخستنی پەیوەندی نێوان دەسەلاتی ناوەندی و دەسەلاتی حوکمی زاتی دا، باوەڕی وا بو، کە جگە لە کاروباری دیفاع، دەرەوە، پارەوپول.. ئەوانی تر ئەبێ بەجێ بهێلرێ بۆ دەزگاکانی حوکمی زاتی.
حیزبی بەعس بە موئامەرە هاتۆتە سەر کار. وەکو صەددامیش ئەلێ: «جئنا لنبقی». باوەڕی بە ژیانی دیموکراسی و پلورالیزم نیە، بەلکو ڕژێمێکی تۆتالیتاریە. هەوڵ ئەدا هاوولاتی عیراقی، بێ گوێ دانە نەتەوە و دین و مەزەب، بە گوێرەی بۆچونەکانی خۆی و تێگەیشتنی لە ژیان ڕابهێنێ و لە قالب بدا. ئامادە نیە لە پچوکترین دەسەلاتی خۆی بۆ هیچ حیزب و لایەکی تر بگوزەرێ. جۆری بەڕێوەبردنی حیزب و دەولەت لە عیراق دا شتێکی تایبەتیە و لە دنیادا نمونەی نیە.
بەعس سەیری ئەنجومەنی وەزیران و ئەنجومەنی نیشتمانی ئەکا، وەکو دو دەزگای بێ دەسەلاتی سیاسی.
داوودەزگای ئۆتۆنۆمی پێک هات بو لە: (المجلس التشریعی و المجلس التنفیذی). ئەندامانی تەشریعی بە ناو لە لایەن دانیشتوانی ناوچەی ئۆتۆنۆمەوە هەلئەبژێردران. بەلام ئەبوایە لەو کەسانە بن کە سەرکردایەتی بەعس پەسندیان ئەکا. مەرجەکانیشی ئەوەندە قورس و نالەبار بون، مەگەر کەسێ پێ ی لە کەرامەتی شەخسیی و نەتەوەیی خۆی بنایە، ئینجا پێ ی قوبوڵ ئەکرا. ئەم دەزگایە ئەگەرچی لە سەداسەد بە فەرمان و ئامۆژگاری بەعس کاری ئەکرد و، دەسکردی خۆی بو، کەچی دەسەلاتی دانانی (قانون) ی پێ نەدرا بو.
(المجلس الوطنی) یش لە بەغداد، شتێ بو لە بابەتی مەجلیسی تەشریعیەکەی هەولێر.
(المجلس التنفیذی) یش دەزگایەکی بێ دەسەلات بو. جگە لەوەی هەندێ لە دائیرەکانی سەر بە هەندێ لە وەزارەتەکان هیچ پێوەندییەکیان لە گەل ئەمانەتە عامەکانی حوکمی زاتی نەبو، محافظ و سەرانی دەزگا ئەمنیەکانیش ڕاستەوخۆ بەسترا بون بە بەغدادەوە.
بەعس وەکو دەزگایەکی بەڕێوەبەرایەتی بێ دەسەلاتی سیاسی سەیری ئەنجومەنی وەزیرانی ئەکرد. لە بڕیاردانی سیاسی دا ڕەنگە ڕاوێژیان پێ بکرێ،

بەڵام دەسەڵاتی دانی بڕیار و دەنگدانیان نەبو. لە یەکێ لە کۆبونەوەکان دا، عەلی حەسەن مەجید لە سەر دەسەڵاتەکانی ئەنجومەنی وەزیران بە ڕاشکاوی وت بوی: «لەوەتی بەعس هاتۆتە سەر حوکم، لە ئەنجومەنی وەزیران دا تەنیا یەک جار دەنگ دراوە، ئەویش لە سـالـی ١٩٦٨ دا بوە، ئەو بڕیارەش هەر ئەو کـاتـە هەڵوەشێنراوەتەوە.» لە گەڵ ئەوەش دا نەیان نەشاردەوە کە وەزارەتەکانی: دیفاع، کاروباری دەرەوە، کاروباری ناوخۆ، ئیعلام، تخطیط لە هیچ زروف و زەمانێک دا نادەن بە هیچ کەس و هیچ حیزبێ، جگە لە ئەندامی بەعس، لە ناو بەعسیش دا بەوانەی کە لە خۆیان نزیکن. دەزگا ئەمنیەکانیش: ئەمن، ئیستیخبارات، مزخابەرات، بە تەنیا لە دەس صەددام خۆی دا بو، بۆ کەس نەبو قسەی تێ دا بکا، تەنانەت سەرکردایەتی بەعسیش.

لە عیراق دا: مجلس قیادە الثورە، قیادە قطر العراق، المجلس الوطنی، ئەنجومەنی وەزیران هەبو. لە ناو هەمو ئەم دەزگایانەدا کورد یا کەسانی بە ڕیچەڵەک کورد هەبون. بە گوێرەی دەستور (مجلس قیادە الثورە) بەرزترین دەسەڵات بو، کە دانانی قانون و مەرسوم و بڕیاری سیاسی بە دەس بو. لە ڕاستی دا ئەمیش دەزگایەکی کارتۆنی بو، چونکە دەسەڵات تەنیا لە دەس یەک کەس دا بو، کە لە یەک کات دا سەرکۆمار و، سەرۆکی مجلس قیادە الثورە و، امین سر قیادە قطر العراق و، قائیدی عامی قواتی مسلحە و، سەروەزیران.. بو، ئەویش صەددام حسێن بو.

لە وڵاتێک دا، کە هەمو دەسەڵاتەکان لە دەستێک دا کۆبوبێتەوە و، ڕژێمی حوکمڕانی بە ڕادەیەک تۆتالیتاری بێ، دەس وەربداتە دیاریکردنی جۆر و ڕەنگی جلوبەرگی فەرمانبەرەکانی، تەنانەت قەڵەوی و لاوازییان، ئەبێ لە چ دەسەڵاتێکی خۆی لە کاروباری ناوەندی و لە کاروباری حوکمی زاتی دا بە قازانجی کورد دەس هەڵبگرێ؟

لە بەر ئەوە ئەبێ مرۆڤ بیهێنێتە بەرچاوی کە گفتوگۆ لە گەڵ ئەمانە کارێکی چەند دژوار و، پرسیارەکەی د. قاسملو چەند بەجێ بو: "ئایا ئێوە ئەزانن لە گەڵ کێ ئەدوێن؟"

*

ناکۆکی ئەرزی

عبدالرزاق الحسنی، کە یەکێکە لە مێژونوسە بە ناوبانگەکانی عیراق لە کتێبەکانی دا زۆر بە ڕونی سنوری کوردستانی عیراقی دیاری کردوە. لە (ج ٣، ص ٢٩٨) ی کتێبەکەی دا: «تاریخ العراق السیاسی الحدیث» نوسیویتی: «یقطن

الکرد في العراق مدنا وقرى تبتدئ من الحدود الايرانيه - العراقيه على خط مستقيم، يمتد من (جبل حمرين) حتى (جبل سنجار) حيث يتصل بالحدود العراقيه - التركيه - السوريه، ويولفون فيه اهم اقليه قوميه.»

بەلام بەعس و، پێش ئەویش حکومەتەکانی تری عیراق هەرگیز دانیان بەم سنورەدا نەناوە. یەکێ لە ناکۆکیەکانی شێخ مەحمود لە گەڵ بەریتانیا و، حکومەتی مەلیک فەیصەل و، یەکێ لە ناکۆکیەکانی مەلا مستەفای بارزانی لە شۆڕشی ئەیلول دا لە گەڵ بەعس ئەم مەسەلەیە بوە.

لە کۆتایی بیستەکان و سەرەتای سییەکان دا چالاکەکانی کورد داوای دروستکردنی دو لیوای تازەیان کردوە بە ناوی لیوای دهۆک، لە قەزا و ناحیە کوردنشینەکانی موسڵ و، لیوای باجەلان، لە قەزا و ناحیە کوردنشینەکانی دیالە و کوت.

دیاریکردنی شوێنە کوردییەکان، بو بە کێشەیەکی هەمیشەیی لە نێوان جولانەوەی کورد و حکومەتی عیراق دا، لە گفتوگۆکانی سەرکردایەتی بارزانی و بەعس دا سالی ١٩٧٠ ئەم کێشەیە بە چارەسەرنەکراوی بە جێ هێلرا بو بۆ ئەوەی لە سالانی دوایی دا سەرژمێریان تێ دا بکرێ. دوایی هەر ئەم کێشەیەش کرا بە بیانوی هەڵگیرساندنەوەی شەڕ.

★

بەعس پێش ئەوەی بێتە سەر حوکم بیری لە مەسەلەی گۆڕینی پێکهاتنی نەتەوەیی هەندێ ناوچە کرد بوەوە. سالی ١٩٦٣ ئەگەرچی ماوەی چەند مانگێ لە حوکم دا مایەوە، بەلام فریای ئەوە کەوت زۆری ناوچە نەوتییەکانی کەرکوک و هەولێری لە کورد چۆڵ کرد. سالی ١٩٦٨ یش کە بۆ جاری دوەم هاتەوە سەر کار، ئەم جارەیان بە رێکوپێکی و بیندرێژی کەوتە جێبەجێ کردنی ئەخشەکانی. بەعس بە پیرەوی لە تیۆرییەکەی صەددام حسێن، کە کورد بخاتە بەردەمی دو (استحاله) بۆ ئەوەی لە روی مادییەوە مەحاڵ بێ بتوانێ جیا ببێتەوە و، لە روی مەعنەویشەوە مەحاڵ بێ بتوانێ بیری لێ بکاتەوە، هەندێ رێوشوێنی داناوە:

١. هەمو ئەو ناوچانەی ئەوتیان تێ دایە ئەبێ لە قەڵەمڕەوی حوکمی زاتی دابڕێن و، لە کورد چۆڵ بکرێن.

بیانوەکەی ئەوەیە: سامانی سروشتی موڵکی هاوبەشی هەمو گەلی عیراقە ئەبێ بە دەس دەسەلاتی ناوەندییەوە بێ.

٢. هەمو ئەو ناوچانەی بۆ پاراستنی سنوری عیراق و بەغدادی پایتەختی لە

هێرشی دەوڵەتانی دراوسێ و جوڵانەوەی کورد پێویستن، ئەبێ لە قەڵەمڕەوی حوکمی زاتی دابڕێن و، لە کورد چۆڵ بکرێن.

بیانوەکەی ئەوەیە: پاراستنی عیراق ئەرکی دەسەڵاتی ناوەندیە، لە بەر ئەوە ئەبێ ئەو ناوچانە بە دەس حکومەتی ناوەندیەوە بێ.

٣. هەموو ئەو ناوچانەی بە کەڵکی کشتوکاڵ دێن لە ناوچەکانی نێوان کورد و عەرەب دا، ئەبێ لە قەڵەمڕەوی حوکمی زاتی دابڕێن و، لە کورد چۆڵ بکرێن.

بیانوەکەی ئەوەیە: دابینکردنی گوزەران بۆ ئەو جوتیارانەی لە خواروی عیراق زەوییەکانیان ئەبێتە شۆرەزار، ئەرکی حکومەتی ناوەندیە.

٤. بۆ ئەوەی ژمارەی کورد لە چاو عەرەب دا کەم ببێتەوە، لە سەرژمێری گشتی و ڕەفتار لە گەڵ کردن دا، فەیلی بە ئێرانی و، یەزیدی و کلدانی، بە عەرەب دابنرێن.

بە گوێرەی ئەم سەرەتایانە هەر زو ناوچەکانی بەدرە، جەسسان، مەندەلی، خانەقین، کە کەوتونەتە داوێنی چیاکانی پشتکۆوە و، درێژبونەوەیەکی سروشتیی ناوچەی ئیلامن و، بە درێژایی مێژو شوێنی ژیانی کوردی لوڕ و فەیلی بوە، لە کورد چۆڵ کرد. ئەم ناوچانە بۆ پاراستنی بەغداد لە هێرشی ئێرانی پێویستن.

بۆ ئەوەی ناوچەی حوکمی زاتی سنوری لە گەڵ بەغداد نەمێنێ محافظەیەکی تازەی دروست کرد. تکریت کە ناحیەیەکی دواکەوتوی پچوکی سەر بە قەزای سامەڕا بو، کرد بە ناوەندی و، ناوچە کوردنشینەکانی گەرمیانی لە کەرکوک و دیالە دابڕی و نوسانی بە تکریتەوە.

هەرچی ئەخشەیەکیان دانا بۆ تەعریبی کەرکوک، بە تەواوی وەکو ئەیانویست سەری نەئەگرت، چونکە زۆرایەتی دانیشتوانی قەزا و ناحیەکانی کورد بون. لە بەر ئەوە محافظەی کەرکوکی پارچە پارچە کرد. هەندێکی خستە سەر تکریت و، هەندێکی خستە سەر سلێمانی. شاری کەرکوک و لەدەورپشتەکەشی دا بە لای سلێمانی دا قەرە هەنجیر و، بە لای هەولێردا ئالتون کوپری و دوبزی هێشتەوە، ئەویش بۆ دابینکردنی مەیدانی دیفاع و هەردو ناوچەشی تەعریب کرد.

محافظەی دهۆک کە ١٩٦٩ دروست کرا بو. هەر لە سەرەتاوە هەندێ لە ناوچە کوردنشینەکانی موسڵی ئەخرابوە سەر. سنجار، و شێخان مەڵبەندی مێژویی کوردانی یەزیدی لێ جیا کردەوە. ناوچە تێکەڵاوەکانی تەلەعفەر، زومار، سمێڵی لێ دابڕی و، لە سەر داوای جاشەکانی زێباری ئاکرێ یش خرایە سەر موسڵ.

سنوری ناوچەی حوکمی زاتی ئەوەندە خوار و خێچ بو، هەر بە

تەماشاکردنێکی سەرپێیی هەست بە دەسکاری کرانی نابەجێ نەکرا. جارێکیان ئەم مەسەلەیەم بۆ د. قاسملو باس نەکرد و، لە سەر نەخشە بۆم ڕون کردەوە. کردی بە پێکەنین و ئەم نوکتەیەی گێڕایەوە:

«سەربازێک ئەچێ بۆ حەمام. خۆی ڕوت ئەکاتەوە و جلوبەرگ و کەلوپەلەکانی لە ژوری خۆگۆڕین دائەنێ. ئەچێ بۆ ژوری گەرماو خۆی بشوا. دوای خۆشتن دێتەوە ژوری خۆگۆڕین. ئەڕوانێ جلوبەرگ و کەلوپەلەکانی نەماوە. بە تەنیا نیتاقەکەی پشتی و پۆستاڵەکانی ماون. ئەویش پۆستاڵەکانی لە پێ ئەکا و، نیتاقەکەش ئەبەستێ و، ئەچێتە بەردەمی کابرای حەمامچی بەو جۆرە ڕائەوەستێ و ئەڵێ: «من ناڵێم شتەکانیان دزیوم، بەڵام تو شەرەفت کە من هاتم ئاوەها بوم؟»

ئینجا وتی: «ئێوەش بچن ئەم خەریتەیە پیشانی صەددام بدەن و، لێ ی بپرسن: ئێمە ناڵێین کوردستان تەعریب کراوە، بەڵام تو شەرەفت کوردستان پێش ئەوەی حوکمی زاتی بدرێتێ وەها بو؟»

*

(الحكم) و (الخصم)

پەیامنێرێکی ڕادیۆی مۆنت کارلۆ و پەیامنێرێکی حەفتەنامەی (الطليعە العربيە)، کە لە لەندەن بە پارەی عیراق دەرئەچو، چوبون بڕ سورداش بۆ وتوێژ لە گەڵ مام جەلال. مامجەلال لە وەڵامدانەوەی پرسیار دا، زیاد لە پێویست درێژە بە قسە ئەدا، لە باسەکە دەرئەچێ، باسی تر ئەهێنێتەناو وەڵامەکەیەوە کە هیچ پەیوەندی لە گەڵ پرسیارەکە نیە. گوێ ناداتە دەنگدانەوە و ئەنجامی قسەکانی. هەندێ جار قسەکانی پێچەوانەی قسەی پێشوی خۆین. ئەمە یەکێکە لە نوقتە لاوازەکانی. گفتوگۆکان درێژ بون. هەردو پەیامنێر هەمویان وەکو خۆی بڵاو نەکردەوە، بەڵکو بە ئارەزوی خۆیان ئەو ڕستانەیان لێ هەڵبژارد بو کە خۆیان مەبەستیان بو.

مامجەلال لە یەکێ لە کۆبونەوەکانی بەغدادا لە سەر یەکێ لە مەسەلە گرنگەکان، لە کاتێک دا کە ئەبێ بە کێشە لە نێوان ئەم و وەفدی حکومەت دا. وەفدی حکومەت ئەیانەوێ صەددام بکەن بە بەهانە بۆ توند گیری خۆیان و، مامجەلالیش بۆ ئەوەی صەددام لەو کێشەیەدا بێلایەن بکا، وت بوی: «ئەوە کێشەی نێوان ئێمە و حکومەتە، بەڵام ئەو سەرۆکی عیراق لەو کێشەیەدا (خصم) نیە بەڵکو (حكم) ە». بێگومان ئەمە جۆرێکە لە دیپلۆماسێتیەکی زیرەکانە. مام جەلال ئەم ڕوداوەی بۆ کابرای ڕۆژنامەوان گێڕابوەوە. ئەویش بۆ سەرباسی وتووێژەکە

لە زمـانی مـامـجەلالەوە ئەو رسـتـەیەی هەڵبـژارد بو کە ئەڵێ: «صـدام هو الحکم ولیس الخصم» و گفتوگۆکەی بەم ناونیشانە لە ژمارە ٦٥ ی ٦ ی ئابی ٨٤ دا بلاو کـردبوەوە. ئەمـە لە ناو ناحەزەکـانی یەکـێتی دا، بە تایبـەتی لایەنەکـانی جـود، بە خراپ وەرگـیرا و، هەرایەکی زلیان لە سەر دروست کرد. لە ناو بنکەکانی یەکـێتی یش دا دەنگی دایەوە، رەخنە لە مامجەلال ئەگیرا لە سەر ئەم قسەیە.

رێکخـراوەکـانی دەرەوە بە نـاوی مـام جـەلالـەوە (تکذیب) یان کـرد و، بە فـراوانی بلاویان کـردەوە. بەلام نە (الطلیـعـه العـربیـه) و نە هـیچ رۆژنامـەیەکی تر (تکذیب) ەکەیان بلاو نەکردەوە.

*

هەوڵێکی تر بۆ ئاشتبونەوە

رۆژی ١٦ / ٨ / ٨٤ وەفـدێکی دەسـەلاتداری یەکـێـتی کـە پێـک هات بو لە: جەبار فەرمان، ئازاد هەورامی، د پێشەوا تالەبانی لە گەڵ فەرەیدون دارتاش، چون بۆ چیای شیرین بۆ بینینی نوێنەرانی م س حشع.

لەم کـۆبونەوەیەدا نوێنەرانی یەکـێـتی ئامـادەیی یەکـێـتـیـیـان دەربری بۆ دەسپێکردنی گفتوگۆ و ئاشتبونەوەی گشتی لە گەڵ هەمو لایەنەکانی جود و، رێگە دان بە هێـزەکـانیـان بۆ گـەڕانەوە بۆ ناوچەکـانی ژێر دەسەلاتی یەکـێـتی بەو مـەرجەی رێزی بڕیاری شـەڕ ڕاگـرتن بگرن و، تا ئەو کـاتەی لە نێـوان یەکـێـتی و هێـزەکـانی حکومەت دا ئاگربڕ هەیە لە ناوچەکانی یەکێتیەوە هێرش بۆ سەر هێزەکانی عێراق نەکـەن. نوێنەرانی حـشـع بەوپەڕی لە خـۆبایی بونەوە ئەڵێن: «بۆ هاتوچۆی ناو کوردستان ئێمە ئیزن لە کەس وەرناگرین و بۆ پەلاماردانی هێزەکانی عێراقیش ئێمە هیچ ئیلتـیـزامێکمان بە بڕیاری یەکـێتیەوە نیە، خۆمان ئازادین چی ئەکەین و چی ناکەین.» بۆ دەسپێکردنی گفتوگۆیش لە گەڵ یەکێتی کردبویان بە مەرجی پێشەکی کـە: «ئەبێ یەکـێـتی بەیانێک دەربکا ئیـدانەی هەڵوێـسـتی خۆی بکا لە شـەڕی پشتـئـاشان و، گـفـتـوگـۆی بە تەنیا لە گەڵ حکومەت و، ئەبێ یەکـێـتی کـۆتایی بە گفتوگۆ بهێنێ و، شەڕ دەس پێ بکاتەوە، ئەوسا ئەوان گفتوگۆی لە گەڵ ئەکەن.»

نوێنەرەکـانی یەکـێـتی پێـیـان ڕاگەیەنن مـادەم ئەوان ئیلتـیـزام بە ڕاگـرتنی شـەڕەوە ناکـەن کـەوابێ، هەتا لە نێـوان یەکـێـتی و لایەنەکـانی جـودا ڕێککەوتنی سیاسی نەبێ، چاک وایە هێزەکانیان نەنێرنەوە ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی یەکێتی، ئەگینا ڕێگەیان نادەن و، ئەگەر پێویست بکا بۆ ڕێ لێ گرتنیان هێز بە کار ئەهێنن.

کۆبونەوەکە بەم جۆرە بە (تحدی) کردنی یەکتری تەواو بو.

حشع بۆ ئەوەی هەڕەشەکەی خۆی بباتە سەر و، (تحدی) ی ئاگربڕەکەی نێوان یەکێتی و بەعس بکا، هێزێکی گەورەی خۆی نارد بۆ خۆشناوەتی. هێزەکانی یەکێتی لە چیای سەفین دەوریان گرتن. بە کارەساتێکی خوێناوی کۆتایی هات و، زۆری هێزەکەیان فەوتا.

*

ڕۆژی ٢٦ ی ئاب عەلی حەسەن مەجید بە کاروانێکی درێژی ئۆتۆمۆبیل هاتە سورداش. لە گەڵ خۆی زۆری کاربەدەستە گەورەکانی دەزگای (ئەمن) ی هێنا بو. مەبەستی لە هاتنەکەی وەکو خۆی وتی پیشاندانی دۆستایەتی و ڕێزی تایبەتی بو بۆ یەکێتی لە بەر چاوی خەڵک.

*

دیسان گرژی

وردەشەڕی جاش و پێشمەرگە دیسان کەشی سیاسی کوردستانی ئاڵۆزاند، لە لایەکەوە توندڕەوەکانی ناو یەکێتی و لە لایەکی ترەوە جود دەستیان لە خۆشکردنی ئاگری ئەم بەزمەدا هەبو. ڕادیۆکانی پدک و حشع بە خۆشیەکی زۆرەوە هەواڵەکانی بە زلکراوی بڵاو ئەکردەوە و تیژی ئەکردن لە یەکتری.

لەم گرژیەدا سەید کەریم، لە گەڵ ٢ پێشمەرگەی تر: ئەهرۆ عەبدوڵلا سەلیم و سەلاح خۆشناو، ڕۆژی ١٥ ی ئەیلولی ٨٤ بە ئۆتۆمۆبیل لە سلێمانیەوە گەڕابوەوە سورداش، ئاگای لەوە نابێ لەو نزیکانە هەندێ جاش کوژراون، ئەکەوێتە بۆسەی جاشەکانی تاسڵوجەوە، هەمویان کوژرا بون. ئۆتۆمۆبیلەکەشیان ئاگری گرت بو زۆریان لە ناوی دا سوتا بون.

سەید کەریم خەڵکی هەودیان و بە ناوی باوکیەوە ناو نرا بو، چونکە ئەم هێشتا لە سکی دایکی دا بوە کە باوکی مردوە. دوای ڕێککەوتنی ئازار چو بوە (الكلية العسكرية) و بو بو بە ئەفسەر و، لە ٩٧٤ دا چو بوە ڕیزی شۆڕشەوە لە هێزی سەفین دا بو بو بە فەرماندەی بەتالیۆن. پیاوێکی گورجوگۆڵ و لەش سوک و لە شەڕدا هەتا بڵێی ئازا و چاو نەترس بو. ڕاوکەرێکی دەسڕاست و ئەنگێوە و شاخەوانێکی وریا بو. لە سوریاوە پێکەوە گەڕا بوینەوە کوردستان و، پێشمەرگەی مەفرەزە سەرەتاییەکانی ئەم شۆڕشە و، یەکێ لە هاوڕێ نزیکە خۆشەویستەکانم بو. لە ناو داوودەزگاکانی یەکێتی دا چەندین لێپرسراویتی بەرزی وەرگرت بو، سەرکردایەتی دەیان شەڕی سەرکەوتوانەی کرد بو. کوژرانی سەید کەریم بەم جۆرە خەمێکی زۆری لە ناو هەمو هاوڕێکانی و پێشمەرگە و ئەندامەکانی یەکێتی و

خەڵک دا خوڵقاند. م س بەم بۆنەیەوە بەیانێکی دەرکرد.

هەر لە سەرەتاوە بەعس کە زانی یەکێتی لە سەر لێدانی جاش لە پێشمەرگەکانی خۆی ناپێچێتەوە، ئەویش دەستی جاشەکانی خۆی بۆ پێشمەرگە کوشتن، ئاوالە کرد بو. لە ڕاستی دا لەمەیش دا بەعس سودمەند و یەکێتی زەرەرمەند بو. جاش و پێشمەرگە هەردوکیان کورد بون و ئەو کوشتارەیش ناکۆکیەکانی ناو کوردی قووڵتر ئەکردەوە و، ئەو جاشانەی ئەکوژران لە چاو پێشمەرگەکانی یەکێتی دا کە لە تۆڵەی ئەوان دا ئەکوژرانەوە، کەسانی نزم و بێ نرخ بون.

*

لە نێوان عیززەت دوری و مامجەلال دا، هەروەها لە نێوان عەلی حەسەن مەجید و مامجەلال دا چەند نامە و پەیام ئالوگۆڕ کرا. ڕۆژی ٣ ی ئەیلول بۆ دەربڕینی نیازپاکی و سوربون لە سەر درێژە پێدانی گفتوگۆ، عیززەت دوری و عەلی حەسەن مەجید بۆ سەردانی مامجەلال و سەرکردایەتی یەکێتی هاتن بۆ سورداش و، کۆبونەوەیەکی درێژ کرا. یەکێ لەو مەسەلانەی لەم کۆبونەوەیەدا باس کرا مەسەلەی جاش بو. عیززەت دوری بە ڕاشکاوی وتی: «ئێمە ئەوانەمان بۆچیە؟ بۆ شەڕی ئێوە ڕامان گرتون، ئەگەر شەڕمان لە گەڵ ئێوە نەمێنێ، ئەوانەمان بۆچیە، هەڵیان ئەوەشێنینەوە.»

داوامان لێ کرد ئەمەمان بۆ بنوسێ. وتی: «ئێمە هێشتا پێک نەهاتوین، ئەوە ناخەمە سەر کاغەز چونکە ئێوە بە کاری ئەهێنن بۆ ترساندنیان و ڕاکێشانیان بە لای خۆتان دا.»

عیززەت دوری مامجەلالی دەعوەت کرد بۆ بەغداد بۆ تەواوکردنی گفتوگۆ.

لەو ماوەیەدا بەعس بە تەما بو، هەڵبژاردنی (المجلس الوطنی) بکا. ئەیانویست یەکێتی یش بەشدار بێ.

بۆیە هەردولا وا پێک هاتن کە ئەم جارەیان دوایین خولی گفتوگۆ بێ، بەڵگەکان ئیمزا بکرێن و بەیانێکی ڕەسمیی دەربچێ. لە بەر ئەوە داوایان کرد کە ناوی هەمو ئەو کەسانە لە گەڵ خۆیان ببەن بۆ بەغداد، کە یەکێتی ناودێریان ئەکا بۆ وەزارەت و، ئەندامەتی (المجلس الوطنی).

لەدوا حەفتەی مانگی ئەیلول دا، مامجەلال چو بۆ بەغداد و، هەندێ لە ئەندامانی سەرکردایەتی چون بۆ سلێمانی، هەولێر، کەرکوک، دهۆک بۆ قسەکردن لە گەڵ هەندێ کەسایەتی ناسراو، پرسوڕایان پێ بکەن لە سەر دیاریکردنی ئەو

ناوانەی بۆ وەزارەت و ئەندامەتی ئەنجومەنی نیشتمانی دیارییان ئەکەن.

لە کۆتایی ئەیلول، هەموویان لە بەغداد یەکیان گرتەوە، ناوەکانیشیان ئامادە کرد بو. زۆری ئەوانەی ناودێر کرا بون، کەسایەتی سەربەخۆ بون، پێشمەرگە و کادریان تێ دا نەبو. وەفدی یەکێتی: مامجەلال، د. فوئاد مەعصوم، فەرەیدون عەبدولقادر، عومەر عەبدوڵلا، عومەر عەزیز، ئازاد هەورامی، سەربەست بامەڕنی، بە کۆمەڵ چون بۆ دانیشتن لە گەڵ عیززەت دوری لە کۆشکی (المجلس الوطنی). مامجەلال بە عیززەت دوری وت بو: «ئەوا ئێمە هاتوین بۆ ئیمزاکردنی ڕێککەتنەکە و، بلاو کردنەوەی بەیان.»

عیززەت دوری لە سەرەتادا پێخۆشحالییەکی زۆر پیشان ئەدا و، ئامادەیی خۆیان دەرئەبڕێ بۆ ئیمزاکردن و ئیعلانکردنی. عیززەت هەڵئەسێ بە تەلەفۆن ئەم هەواڵە خۆشە بە صەددام ڕائەگەیەنێ. کە دێتەوە بە چروچاوی ترشاوەوە دێتەوە، بە مامجەلال ئەڵێ: «هێشتا مەوزوعی جەبهە و میثاق تەواو نەبوە، ئەبێ ئەویش ببڕێنینەوە.» مامجەلال ئەڵێ: «لە دانیشتنێکی پێشودا سەرۆک وتی: ئێمە گفتوگۆمان لە سەر جەبهە و میثاقەکەی لە گەڵ حشع بە ٣ ساڵ تەواو کرد، با لە گەڵ ئێوەش ئەوەندە بخایەنێ، لە سەر ئەوە ڕێککەوتنەکە دوا مەخەن.» عیززەت دوری سور ئەبێ لە سەر هەڵویستی خۆی. مامجەلال ئەڵێ: «دیارە تورک نیشەکەیان تێک دا!»

لەم کاتەدا سەرۆکی ئەرکانی جەیشی تورکی لە بەغداد بو. هەمو ئارەکان یەکی کەوت و بەعس کەوتە بەهانە هێنانەوە بۆ دواخستنی تێکڕای کارەکە. وەکو دوایی بیستمان سەرۆکی ئەرکانی جەیشی تورک بۆ تێکدانی ڕێککەوتنی کورد و عیراق هات بو، بە بیانوی ئەوەی ئەمە ئەبێ بە هۆی هاندانی کوردەکانی ئەوان و، لە ئەنجام دا ئەمە ئەبێ بە هەڕەشە لە ئاسایشی نەتەوەیی تورک. ئەوسا عیراق لە دو لاوە پێویستی بە تورکیا بو:

یەکەمیان، بۆ دابین کردنی مەسرەفی جەنگی ئێران. لەو کاتەدا تەنیا ڕێگای ناردنی نەوت لولەکانی تورکیا بو. لولەکەی سوریا لە مێژ بو داخرا بو، هێشتا لولەکەی سعودییەش تەواو نەبوبو.

دوەمیان، تورکیا ڕێگایەکی گرنگی ترانزیتی کەلوپەلی ئەوروپا بو. هەرچەندە تورک هەم لە نەوت و هەم لە ترانزیتی بازرگانی قازانجی زۆریان ئەکرد بەلام ئەیانتوانی بەم دو ڕێگەیە (ئیبتیزاز) ی صەددام بکەن.

ڕۆژی ٣٠ ی ئەیلول وەفدی یەکێتی جارێکی تر لە گەڵ وەفدی حکومی کە

پێک هات بو لە: عیززەت دوری، فاضیل بەڕراک، مونذیر شاوی، عەبدولفەتاح ئال یاسین، عەلی حەسەن مەجید، مەحمود شوکر، کۆبوەوە.
بابەتی کۆبونەوەکەیان گۆڕی بۆ باسی هەڵبژاردنی (المجلس الوطني) و، بۆ یەکەمین جار باسی بەشی حیزبە کارتۆنیەکانیان هێنابوە ناو باسەکەوە. بێگومان ئەمە بۆ تەگەرەدان بو لە ڕەوتی گفتوگۆ.
ڕۆژی ٦ ی تشرینی یەکەم وەفدەکە صەددامی بینی. صەددام قسەی گشتی کرد بو، ئامۆژگاری کرد بون، کە شەڕ نەکەنەوە و، دان بە خۆیان دا بگرن.
ڕۆژی ١٣ ی تشرینی یەکەم جارێکی تر وەفدەکە لە گەڵ عیززەت دوری، نەعیم حەداد، عەلی حەسەن دانەنیشن، بێ ئەوەی بگەن بە هیچ ئەنجامێکی دیاریکراو.
ڕۆژی ١٤ ی تشرینی دوەم وەفدەکە بە نائومێدی گەڕانەوە بۆ کوردستان. ئەمە نیتر سەرەتای دەس شێن بو لە ڕێککەوتنی سیاسی لە گەڵ بەعس. بەعس ئەیویست درێژە بە ئاگربڕ بدا، بێ ئەوەی هیچ دەسکەوتێ بە کورد بدا. یەکێتی یش ئەیویست درێژە بە ئاگربڕ بدا، چونکە هێشتا ئامادە نەبو بۆ شەڕ. هەردولا وەختیان ئەکوشت.
سەرکردایەتی ئەو دەسکاریيانەی بە پێویستی ئەزانی لە میثاقەکەدا بکرێ، بە نوسین ناردی بۆ سەرکردایەتی بەعس. عەلی حەسەن بە تەلەفۆن ئاگاداری عومەر عەزیزی کرد بو لە کەرکوک، کە بە سەرکردایەتی یەکێتی بڵێ:
١. تێبینیەکانی لە سەر میثاق نارد بوتان، هەندێکی ئەکرێ جێبەجێ بکرێ، بەڵام هەندێکی نوسراوە بۆ ئەوەی ڕێککەوتنەکان هەڵتەکێنێ.
٢. دیارە بەرەو شاخ ئەڕۆنەوە.
٣. پێ ئەچێ لە گەڵ کوڕانی مەلا ڕێک بکەون، موبارەکتان بێ.

*

ڕاوونانی گەرم
پ ک ک کەوت بوە چالاکی هەندێ لە بارەگاکانی خۆی لە ناوچە سنوریيەکانی تورکیا - عیراق دانا بو. تورکیا ڕێککەوتنێکی لە گەڵ عیراق ئیمزا کرد، ناوی لێ نا بو (ڕاوونانی گەرم)، بە پێ ی ئەم ڕێککەوتنە تورکیا بۆی هەبو بۆ ڕاوونانی چەکدارەکانی پی کا کا ٥ کیلۆمەتر بێتە ناو خاکی عیراقەوە. ئۆردوی تورک یەکەمین هێرشی بۆ سەر بادینان دەس پێ کرد. یەکێتی لە بەیانێکی درێژدا ئامادەیی خۆی دەربڕی بۆ ناردنی هێز بۆ بەرپەرچدانەوەی هێرشی تورک. لە مەش



بەغدا – کانونی یەکەمی ١٩٨٣ ، لە راستەوە بۆ چەپ : تاریق عەزیز ، عزەت دوری ، دکتۆر خدر



بەغدا - هاوینی ١٩٨٤ - لە راستەوە بۆ چەپ : علی حەسەن مەجید ، ملازم عومەر ،



سورداش ، ئەیلولی ١٩٨٤ – لە راستەوە بۆ چەپ : فریدون عبدوالقادر ، نەوشیروان مستەفا



سورداش، ئەیلولی ١٩٨٤ – وەفدی یەکێتی، لە چەپەوە بۆ ڕاست: مام جلال، نەوشیروان مستەفا

زۆرتر مەبەستی دڵنەوایی پدک بو. بەڵام پدک نەک هەر پێشوازی لەم پێشنیارە نەکرد و، نەک هەر بەرگری ئۆردوی تورکی نەکرد، بەڵکو کردی بە بیانویەکی تر بۆ هێرشی ڕاگەیاندن دژی یەکێتی.

*

کۆتایی هێنان بە گفتوگۆ

کۆبونەوەیەکی کۆمیتەی سەرکردایەتی کرا بۆ لێکۆڵینەوە لە ڕەوتی گفتوگۆ و هەلومەرجی کوردستان، زۆری ئەندامانی سەرکردایەتی کەوت بونە ژێر کار تێ کردنی پرۆپاگەندەی دوژمنانەوە. هەندێکیان قسەی نالەباریان نەکرد و نەیان وت ئەمە جاشایەتیە ئێمە نەیکەین، لە کاتێک دا ئێمە هیچ شتێکی خراپمان نەکرد بو تەنیا شەڕمان ڕاگرت بو. بە هۆی ئەو ساڵەوە:

- هێزەکانی یەکێتی حەسا بونەوە، بە ژمارە زۆر زیادیان کرد بو، دەستیان گەیشت بوە هەندێ جێگە کە لە سەردەمی شەڕدا دەستیان نەیگەیشت بویە. هەلومەرجی ژیانیان بوژابوەوە.

- کۆمەڵانی خەڵک بۆیان دەرکەوت کە یەکێتی هێزێکی سەربەخۆیە لە بڕیاردانی سیاسی دا، بەرژەوەندی کورد لە بەرچاو ئەگرێ، نەک هاوپەیمانێتی و دۆستایەتی لە گەڵ دەوڵەتان.

- دەوڵەتانی ناوچەکەش، بە تایبەتی ئێران و سوریا، بۆیان دەرکەوت کە یەکێتی، هێزی سەرەکیە لە سەر ئەرزی کوردستان، دوای ڕاگرتنی شەڕ، جگە لە بادینان لە هیچ شوێنێکی تر چالاکی پێشمەرگانە نەمابو.

لەم کۆبونەوەیەدا بە گشتی دەنگ بڕیار درا کۆتایی بە گفتوگۆ بهێنرێ و، هێزەکان ئامادە بکەین بۆ دەس پێ کردنەوەی شەڕ.

بڕیاری شەڕ دوا خرا بۆ ئەوەی خەڵک و خۆمان بە ئاسودەیی زستان بە سەر بیەین و لە بەهار نزیک بکەوینەوە، بەڵام بڕیار درا کە کۆتایی هێنان بە گفتوگۆ ڕابگەیەنرێ.

بڕیاری شەڕکردنەوە بڕیارێکی حساب نەکراو و هەڵەیەکی گەورە بو. بەڵام کەسێ زاتی نەئەکرد بڵێ: درێژە دان بە ڕاگرتنی شەڕ و گفتوگۆیەکی پچڕ پچڕ باشترە لە شەڕێکی نابەرامبەر لە گەڵ دوژمنێکی دڕندەی وەکو بەعس، کە لەو کاتەدا خاوەنی ٥٠ فیرقە سەرباز و ٥ هەزار تانک و ٦ سەد فڕۆکەی جەنگی و خاوەنی چەکی کیمیایی و بایۆلۆجی و، سەدان هەزار جەیشی شەعبی و جاشی کورد بو. چونکە تاوانبار ئەکرا بە بەزین و کۆڵدان و ڕوخان.

مام جەلال نامەی بۆ عیززەت دوری نوسی و ، سەرکردایەتی یەکێتی یش لە ١٥ / ١ / ٨٥ دا بەیانێکی دەرکرد (کۆتایی هێنانی وتوێژ) ی ڕاگەیاند ، لە بەیانەکەدا ڕونی کرد بوەوە کە دوای دەیان کۆبونەوە و دانیشتن و سەدان سەعات گفتوگۆ، گفتوگۆ بە ئەنجام نەگەیشت و ، ئۆبالی ژێرکەوتنی گفتوگۆکەشی خستە سەر بەعس.

لەو کاتەدا یەکێتی هیچ جۆرە پەیوەندیەکی لە گەڵ ئێران نەبو، تەنانەت سەرەپردێکیشی دروست نەکرد بو، لە گەڵ جودیش هیچ جۆرە پەیوەندیەک کە بۆنی ئاشتبونەوەی لێ بێ دروست نەکرا بو. یەکێتی هێشتا لە ناو ئە دابڕانە سیاسیەدا بو کە تێ ی کەوت بو.

ڕۆژی ١٦ ی کانونی دوەم، واتە یەک ڕۆژ دوای بلاوکردنەوەی بەیانەکە، سەعدی مەهدی صالح بە هالیکۆپتەر هاتە مەرگە. داوای کرد گفتوگۆ دەستی پێ بکرێتەوە، لە کوێ دا پچڕاوە لەوێوە دەس پێ بکەینەوە. بەڵام سەرکردایەتی یەکێتی بۆ دەمکوتکردنی دوژمنەکانی گفتوگۆ، کە لە ناوخۆی یەکێتی و لە دەرەوەی دا بەوپەڕی توندوتیژیەوە لە قسە و چالاکی دا بون، ئیتر ئەم داوایەی بەعسی دایە دواوە.

بەمەیش جارێکی تر جولانەوەی کورد لە ناو بازنە داخراوەکە دا کەوتەوە خولانەوە: داوای مافی نەتەوەیی، سەرکوتکردن، شەڕی چەکدار، پێوەندی ژێر بە ژێر، گفتوگۆی ئاشکرا، گرژی، دیسانەوە شەڕی چەکدار.....

*

*

## ٢ . دیسانەوە شەڕ

دوای ئەوەی کۆمیتەی سەرکردایەتی ی ن ک بەیاننامەی پچڕاندنی گفتوگۆی ڕاگەیاند، ئیتر لە ناو یەکێتی دا هیچ ئومێدێ بە گفتوگۆ نەمابو، بەڵام ئەمانویست جارێ خۆمان لە شەڕ لابدەین تا چلەی زستان تێ ئەپەڕی و هەوا کەمێ خۆش ئەبێ، چونکە دڵنیا بوین لەوەی ئەمجارەیان شەڕێکی سەخت ئەبێ و، کاربەدەستانی عیراق دەس لە دانیشتوانی لادێکانیش ناپارێزن.

کوژرانی ڕیشە

ڕۆژی ٢٥ ی کانونی دوەمی ٨٥ هەواڵ هات مامە ڕیشە کوژرا. ڕیشە ناوی نەجمەدین شوکر و خەڵکی گوندی تاڵەبان بو. لە بەر ئەوەی ڕیشی هەبو بە مامەڕیشە ناوی دەرکرد بو. ماوەیەک لە گەڵ فیدائییەکانی فەلەستین کاری کرد بو. خوێندەواری نەبو، بەڵام کوڕێکی وریا و چالاک و گورجوگۆڵ و لەش سوک بو، لە هەڵبژاردنی چالاکیەکانی دا، نیشانەی سەرکەوتوانەی هەڵئەبژارد. هەمیشە لە گەڕان و سوڕان دا بو. سەرەتا کە هات بو بۆ پێشمەرگایەتی لە بەر ئەوەی نەیان ناسی بو، ماوەیەک باوەڕیان پێ نەکرد بو، بە پێشمەرگە وەریان نەگرت بو. پاشان کە بو بە پێشمەرگە لە ماوەیەکی کەم دا لێوەشاوەیی خۆی سەلماند و دەرکەوت کە پێشمەرگەیەکی هەڵکەوتوە. زۆری نەخایاند بو بە فەرماندەی مەفرەزە ئینجا بە فەرماندەی کەرتی جەباری. کەرتەکەی ڕیشە یەکێ بو لە ئازاترین و چالاکترین کەرتەکانی پێشمەرگە و، هێزەکانی بەعس داخ لە دڵ بون لێ ی.

لە کاتی گفتوگۆ دا لە گەڵ تەحسین شاوەیس پەیوەندی کرد بو. داوای لێ کرد بو دەس لە خراپە هەڵبگرێ و، هاوکاری پێشمەرگە بکا. تەحسین بە قسەی لوس ڕیشەی تەفرە دا بو، گوایە هاوکاری لە گەڵ ئەکا. ئێمە هەر کە بەمەمان زانی زۆر زو سەرنجمان ڕاکێشا و، وریامان کردەوە کە باوەڕ بە تەحسین نەکا و، لێ ی نزیک نەبێتەوە. فەرماندەی تیپەکەیشی، ئازاد حەمە غەریب، بە هەمان توندی وریای کرد بوەوە. بەڵام ئەو گوێ ی نەدابویە ئەم وریاکردنەوانە. تەحسین، ڕیشەی دەعوەت کرد بو بۆ وتووێژ و نان خواردن، لە کاتێک دا لە گەڵ ٢ پێشمەرگەی هاوڕێ ی: سەردار حەمە شەریف، موحسین مەجید سەلیم، چو بو بۆ بینینی، تەحسین لە سەر داوای

ئیستیخبارات بۆسەی بۆ دانان وهەر سێکیانی کوشت. ڕیشە لە ناو خەڵک دا ببو بە قارەمانێکی ئەفسانەیی و، بە کەسێکی لە شکان نەهاتو. تەنانەت لە یەکێ لە خۆپیشاندانەکانی سلێمانی دا هاواریان کرد بو: «بە هێزی مامە ڕیشە، صەددام نەکەین بە شیشا».

کوژرانی ڕیشە زەرەرێکی مەعنەوی بو لە پێشمەرگەکانی یەکێتی. مەکتەبی سیاسی بەم بۆنەیەوە بەیانێکی لە سەر دەرکرد و، پێشمەرگەکانی تیپی ٥٧ ی سەگرمە لە تۆڵەی هاوڕێکەیان دا، چەند بۆسەیەکیان لە سەر ڕێگەی باوە، لە سەر ڕێگەی چەمچەماڵ ـ سەنگاو و، لە نزیک گوندی خدرێ و گوندی مەلا حەسەن دانا. بۆ ئەوەی لە ناوەخت دا شەڕەکە بێ بەرنامە هەڵنەگیرسێتەوە، شەڕی تۆڵەسەندنەوەمان لێرەدا ڕاگرت.

قەرەسرد

لە مانگەکانی گفتوگۆدا، سورداش گەرەکێ خانوی چۆڵکراوی لێ بو، چاک کرا بون و کرا بون بە بارەگای م س. من نەمویست جێ لە خۆم بشێوێنم، ماڵ و بارەگاکەم هەر لە نێروانی ئاوەژێ مایەوە. لەو ماوەیەدا خانوی تریشمان هەر لە بناری ئاسۆس لە سێروان دروست کرد. هەر کات پێویستی بکردایە ئەچوم بۆ سورداش و ئەگەڕامەوە ئاوەژێ. هەمو جار بە قەرەسردا ڕائەبوردم. جادەیەکی عەسکەری کە بنگردی بە دوکانەوە ئەبەست بە سەر سەری شاخەکەدا ئەڕۆیشت. تەپڵە سەری قەرەسرد تەختاییەکی بەرز بو، چاوئەندازێکی یەکجار جوان و خۆشی هەبو. زۆری چیاکانی کوردستانی عیراقی لێ دیار بو. دیوێکی بە سەر شاری دوکان و دامەزراوەکانی دا و دیوێکی بە سەر بنگرد و مەرگەدا ئەیڕوانی و، گۆماوی دوکانیش کەوت بوە لای ڕۆژئاوای، بە شەویش ڕوناکایی کارەبای سەدان شار و ئاوایی نزیک و دوری لێوە دیار بو. دەورو‌پشتەکەیشی بە سەدان ڕەزی مێوی دێمی لێ ڕوێنرا بو. ئەکرا ئوتێلی توریستی خۆش لە سەر تەختایی سەر شاخەکە دروست بکرێ. بەڵام ئێرەیش وەکو هەمو شوێنە جوانەکانی تری کوردستان جەیشی داگیرکەری بەعس پیسی کرد بو. چەندین ڕەبیەی تێ دا دانا بو، چوار دەوری بە مین چاند بو.

ئازادکردنی چەرماوەند

کە بارودۆخی کوردستان ئاڵۆز بو، ئەندامانی م س سورداشیان چۆڵ کرد و گوێزیانەوە سێروان. بناری ئاسۆس ئەگەرچی شاخاوی بو، ئەو دیوەی ئێمەی لێ بوین، نزیک بون لە شوێنەکانی هێزەکانی حکومەتەوە. بۆ پەلاماری ئاسمانی

فڕۆکە و بۆ تۆپباران کراوە بون. بە ئاسانی زەرەری لێ ئەدرا. جێگەیەکی ئەمینمان نەبو، بارەگاکانی سەرکردایەتی تێ دا دابنێین. دۆڵی جافەتی ناوچەیەکی شاخاوی و لە بار بو. ساڵی ٨٣ یش بارەگاکانی دەزگای ڕاگەیاندن و بارەگای مەڵبەندی ٢ ی لێ دانرا بو، بەڵام ئەویش بە درێژایی شاخی چەرماوەند ڕەبیەی جەیش و جەیشی شەعبی لێ بو. لە هەمو لایەکەوە زاڵ بون بە سەر دۆڵی جافەتی دا. بڕیارمان دا چەرماوەند پاک بکەینەوە بۆ ئەوەی بیکەین بە شوێنی بارەگا سەرەکیەکانی یەکێتی. چەرماوەند زنجیرەیەکی درێژە لە سەرێکیەوە بەستراوە بە شاخی سارای نزیک دوکان و لە سەرێکی تریەوە ئەگاتە ئەزمڕ و گۆیژە و تا نزیک عەربەت درێژ ئەبێتەوە. کونتێلە، دابان، هەلاج، هەژدیها، بوک و زاوا لە لوتکە ناسراوەکانی و کەڵکی قزلەر و کەڵکی پیرکە لە باریکە ڕێگەکانی هاتوچۆکردنین. هەندێ لەم شوێنانە ڕەبیەی قایمی عەسکەری لێ بون.

هێزەکانی مەڵبەندەکانی ١ و ٢ یان لە سەر کۆکرایەوە: بەیانی ڕۆژی ١٥ ی شوباتی ٨٥ سەعات ٤ بەیانی لە هەمو لایەکەوە پەلامار دران و، پەلاماری بارەگای فەوجەکەش درا لە شەدەڵە. سەرەڕای هەڵسانی هالیکۆپتەر و فڕینی فڕۆکەی جەنگی، لە ماوەیەکی کورت دا هەموی پاک کرایەوە و، ڕۆژی ١٦ ی شوبات ناوچەکە کەوتە دەس یەکێتی. لەم شەڕەدا ١ مەقەڕی فەوج و ٣ مەقەڕی سریە و ١٧ ڕەبیئە گیران، هەمو ئەو هێزانەی لەو بارەگایانەدا بون کوژران و ٩٨ کەسیان بە زیندویەتی بە دیل گیران و، هەمو کەلوپەلی فەوج و تفاقی جەنگی دەس پێشمەرگە کەوت. ئەمە یەکەمین شەڕی گەورەی دوای پچڕاندنی گفتوگۆ و سەرەتای ڕاستەقینەی جێبەجێ کردنی بڕیاری دەسپێکردنەوەی شەڕی یەکێتی بو لە گەڵ بەعس.

لەم شەڕە و لە هەندێ وردەشەڕی تردا بە درێژایی مانگی شوبات ٢٢ پێشمەرگە کوژران، لە تیپی ٢١ ی کەرکوک: کەمال مەحمود، زوهێر سەعدون (سەرهەنگ)، شوان حەکیم حەمەڕەش، شامیل حەمە عەلی (ڕێبوار)، کاوە تەیفور ئیبراهیم، سەلیم سەلام ئەحمەد (ڕەوەند)، شەفیق کاکل (هێمن)، فەخرەدین عەلی ڕەزا(هەردی). لە تیپی ٢٥ ی خاڵخالان: سەید ئیبراهیم، ئیسماعیل عەزیز سالح. لە تیپی ٣٧ ی شارباژێر: فاروق محەممەد ڕەزا. لە تیپی ٥٥ ی قەرەداخ: والی باریکەیی. لە تیپی ٥٧ ی سەگرمە: عوسمان عەلی محەممەد. لە تیپی: ٥٣ ی شیروانە: ئیسماعیل عەبد محەممەد. لە تیپی ٣٣ ی سلێمانی: عوسمان محەممەد مەحمود (شەهاب). لە تیپی ٣١ ی پێنجوین: محەممەد عەزیز، عەبدولخالق عەزیز

(ئاسو) ، لە تیپی ۹۳ ی کۆیە: ئەحمەد عوسمان، هەمزە خدر، ئومێد ئەحمەد، عەزیز شەوگەڕی، هادی عەبدول.

مەترسی هێرشی گەورەی ئێران بۆ سەر عیراق نەڕەوی بوەوە. دوای ئەم شەڕەش عیراق هەوڵێکی تری دا بۆ ڕاگرتنی شەڕ. ڕۆژی ۱۸ ی شوبات سەعدی مەهدی سالح بە بێتەل قسەی لە گەڵ مام جەلال کرد بۆ ڕاگرتنی شەڕ و، داوای بەردانی گیراوەکانی لێ کرد. بەلام لە لای یەکێتییەوە ئیتر کار لە کار ترازا بو. بەرەو شەڕی سەرانسەری ئەچو.

شەڕی تەعریب

دەس پێ کردنەوەی شەڕ بە پەلاماردانی هەندێ لەو ئاواییانە دەستی پێ کرد کە حکومەت بۆ عەرەبی دروست کرد بو لە جێگەی جوتیارانی کورد. لە چەند جێگەی کەرکوک، هەولێر، گەرمیان، ئەم هێرشانە کرا. ئەو ئاواییانە هەمو چەکدار بون. بەرگرییان ئەکرد بەلام چالاکیەکان سەرکەوتو بون. هەندێکیان شوێنەکانیان چۆڵ کرد. یەکێ لەو تیپانەی ئەم چالاکیەی بە سەرکەوتویی ئەنجام دابو، تیپی ۲۱ ی کەرکوک بو. جەیش لە تۆڵەی ئەمەدا هێرشێکی گەورەی کردە سەر گوندی گۆیتەپە کە بنکەیەکی گەڕۆکی تیپی ۲۱ ی کەرکوکی لێ بو. لەم هێرشەدا تانک، تۆپ، هالیکۆپتەریان بە کار هێنا، بەلام سەرکەوتو نەبون. گوندەکەیان بۆ داگیر نەکرا. پێشمەرگەکان شەو کشانەوە.

گەرم بونی شەڕ

بە درێژایی مانگی مارتی ۸۵ لە چەند جێگەی کوردستان ۲۸ چالاکی پێشمەرگەیی کرا. لە زۆر جێگە پەلاماری ڕەبیەکانی جەیش ئەدرا گرنگترینیان لە سەر ڕێگەی هەولێر کۆیە و، لەیلان قادرکەرەم بو.

لە شەڕەکانی مارت دا ۱۳ پێشمەرگە کوژران، لە تیپی ۸٦ ی هەولێر: عەبدولباقی بارزانی، موحسین حەمەد، ڕەمەزان. لاوکۆ کەریم، شێرزاد ڕەسول، صەباح هەمزە سلێمان. لە تیپی قەرەچوخ: نەجات ئەحمەد عەولا. لە تیپی ۱۲ ی سۆران: سەید جەلال ئیسماعیل، جەبار عارف. لە تیپی ۵۷ ی سەگرمە: ڕەمەزان محەمەد عەلی، ئەحمەد نوری ئەحمەد، سەلام حەمید ئەمین، ئەنوەر عەلی سالح.

شەڕ بە سەختیەکی وەها دەستی پێ کردەوە لە مێژوی جەنگی کوردستان دا، ئەوە یەکەم جار بو بەو سنورە فراوان و دڕندانە بێ. بەعس هیچ گوندێکی لە هێرشی ئاسمانی و تۆپباران بێ بەش نەئەکرد.

*

هەڕەشەکانی محەممەد حەمزە زوبەیدی

پاش هەڵگیرسانەوەی شەڕ بە ماوەیەک سەعدی مەهدی صاڵح لە کوردستان گوێزرایەوە و، محەممەد حەمزە زوبەیدی کرا بە بەرپرسی (مکتب تنظیم الشمال). محەممەد ئەندامی (قیادە قطر العراق) ی حیزبی بەعس بو. لە زنجیرەی ئەو (ندوە)انەدا کە لە شارەکانی کوردستان کردی، لە سلێمانی لە ناو کۆڕێکی گەورەدا بۆ ئەوەی بە ئێمە بگاتەوە، وت بو: «لەمەو دوا بە چەکی وەها لێیان ئەدەین کە لە ناو پەناگاکایشیان دا بیانکوژێ.» ئەمە هەڕەشەی بە کار هێنانی چەکی کیمیایی بو.

شەڕی ئەم جارەی بەعس لە گەڵ هەمو کورد و داروبەردی ولاتەکەی بو. ژمارەیەکی زۆر تۆپیان تەرخان کرد بو بەردەوام هەمو دێهاتەکانی دەرەوەی دەسەلاتی بەعسیان تۆپباران ئەکرد. بە هالیکۆپتەر و بە فڕۆکە پەلاماری بارەگاکانی یەکێتییان ئەدا. هەمو جۆرە بۆمبایەکیان بە کار ئەهێنا، لەوانە: ئەوەی پێ ی ئەڵێن هێشویی. دانیشتوانی دێهاتیان ناچار ئەکرد گوندەکانیان چۆڵ بکەن و کۆچ بکەن بۆ ئۆردوگاکان و، چەک بۆ حکومەت هەڵبگرن.

*

گەشتێکی زەحمەت

کۆتایی مانگی مایس لە ناوزەنگ وە بەڕێ کەوتم بە نیازی سماقولی سەروچاوە کە بارەگای مەڵبەندی ٤ ی لێ بو. کۆسرەت لێپرسراوی مەڵبەند بو. ڕێکخراوەکانی ناوشاری هەولێر، عەمارێکی چەکیان بۆ نابوینەوە، بە تەما بوین بە یارمەتی ئەوان دەستی بە سەردا بگرین.

لە کلێسە لامان دا. کلێسە لە سەر لێواری زێ ی پچوکە. خەڵکی کلێسە دۆستی شۆڕش و هەندێکیان ئەندامی کۆمەڵە بون. ماڵی ڕەفیقی حەمەجاف (لە ئەنفال دا شەهید بو) لەوێ بو. داوایان لێ کردین بمێنینەوە و، ڕاوە ماسیەکمان بۆ بکەن. من خۆم ماسیخۆر نیم و زۆرم نارەزوی خواردنی نیە. هەندێ ماسییان گرت بو بە چەشنێکی زۆر بە لەزەت دروستیان کرد بو. هەر لەوێ بە بێتەل لەگەڵ کۆسرەت قسەم کرد و ئاگادارم کرد لە گەیشتنم و، (مەوعید) ێکمان دانا لە بۆگد یەکتری ببینین. ئێمە هەردوکمان لەو مەوعیدە دواکەوتین، من بە هۆی ماسی خواردنەوە و، نازانم ئەو بە هۆی چیەوە. بەڵام فڕۆکە لەو مەوعیدەدا گوندەکەی بۆردومان کرد. ٤ کەسی کوشت. بۆگدیش هەر لە سەر زێ یە، میر محەممەدی میری سۆران قەلایەکی لێ دروست کردوە، تا ئەوساش کەلاوەکانی مابون. دیار بو جەیش کەوت بونە

نەبەفیبی کاروانەکەمان و، بۆ دۆزینەوە شوێن و ڕێگەی ڕۆیشتنمان کەڵکیان لە بیستنی بێتەلەکەمان وەرئەگرت.

*

چیای ماکۆک بە سەر دۆڵەڕەقەدا ئەڕوانێ. هەمو زنجیرەکەش کەوت بوە دەس جاش و جەیش. سەری ماکۆک دوای ئازادکردنی بێتواتە بەشی زۆر و گرنگی کەوتبوە دەس پێشمەرگە. بەلام لەو ڕۆژانەدا بێ شەڕ گیرا بوەوە. تاقمێ پێشمەرگە کە بۆ پارێزگاری لەوێ دانرا بون. ڕۆژێ کتوپڕ تاقمێکی زۆر ئەفسەر و جاش ئەبینن بەرەو ڕویان دێن. پێشمەرگەکان لە باتی ئەوەی دەستیان لێ بکەنەوە، حەپەسا بون و بە شوێنێکی هەزار بە هەزار دا بە ڕاکردن دابەزی بون. دوایی دەرکەوت، یەکێ لە ئەفسەرەکان عبدالعزیز الحدیثی، قائید فیرقەی ٢٤ ناسرا بە (قواتی معتصم) و، هەیئەتی ئەرکانی فیرقەکەی و، هەندێ لە سەرانی جاشی خۆشناو بون، بە نیازی (استطلاع) چوبون و، هێزی شەڕیان لە گەڵ نەبوبو. ئەوانیش چاوەڕێیان نەکرد بو، لەو شوێنەدا پێشمەرگە هەبێ. ئەگەر پێشمەرگەکان بهاتنایەتە دەس لەوانە بو زەرەرێکی زۆریان لێ بدانایە و، پلانی گرتنی شاخەکەش سەری نەگرتایە. یەکێ لە گرنگترینی لوتکەکانی ماکۆک (کلاوی دێوانە) یە گیرا. مەڵبەندی ٣ هەوڵی گرتنەوەی دابو، بەلام سەرکەوتو نەبون. دوای کلاوی دێوانە، جەیش و جاش شاخی (شیشار) یشیان گرت. شیشار ئەڕوانێ بە سەر دۆڵی بالیسان دا.

لە ماکۆکەوە بەردەوام تەقەیان لە دۆڵەڕەقە ئەکرد و تۆپبارانیان ئەکردن. گەمارۆی ئابوریان دابون و ڕێگەی هاتوچۆیان لێ بەست بون. دانیشتوانی ناوچەکە لە ئەشکەوت و بن بەرد و بن پردەکان دا جێگەیان بۆ خۆیان چاک کرد بو. لە گەڵ ئەوەش دا زۆر ڕۆژ خەڵکیان لێ بریندار ئەبو یا لێ ئەکوژرا. ڕۆژێکیان کابرایەک بن بەردێکی خۆش کرد بو خێزانەکەی تێ دا حەشار بدا. بەردەکە تلی دابو. بە بەرچاوی خۆیەوە هەندێ لە منالەکانی فلیقاند بوەوە. لە بەر ئەوەی خەڵک لە ژێر گوشارێکی سەخت دا بون، بە تەنگ هات بون و ورەیان بەردا بو. لێپرسراوەکانی مەڵبەندیش ڕەفتاریان لە گەڵ پێشمەرگەکان باش نەبو، لێیان نارازی بون و زۆر جار شکاتیان لێ کرد بون. دانیشتوانی ناوچەکە و پێشمەرگەکانیان وردە وردە تەسلیم ئەبونەوە.

*

ئێمە گەیشتینە سماقولی. خەریکی کۆکردنەوەی زانیاری و دانانی نەخشە بوین. مەکتەبی سیاسی ئاگاداریان کردم باری دۆڵە ڕەقە خراپە، بە پەلە بچم بۆ ئەوێ. هەندێ لە هێزەکانی سلێمانی و کەرکوک و هەولێرم لە گەڵ خۆم برد و

ڕۆیشتم.

لە چیای هەورێ کە دابەزین بۆ دۆڵی بالیسان، تۆپباران دەستی پێ کرد. لە سەر چیای ماکۆک و شیشارەوە کاروانەکەی ئێمەیان دی بو. سەرانسەری ناوچەکەیان بە خەستی تۆپباران کرد. بارەگای مەڵبەندی ٣ لە دۆڵە ڕەقە بو. بەڵام ماڵی د. کەمال خۆشناو و ژمارەیەکی زۆر بارەگای پێشمەرگە لە دۆڵەکەدا بو. لە ژێر گوشاری تۆپ دا دانیشتوانی ناوچەکە هەمویان ئاواییەکانیان چۆڵ کرد و ڕویان کردە شاخەکان. منیش چومە توتمێ بۆ بارەگای ڕێکخراوەکەی کۆمەڵە کە عەبدورەزاق محەممەد بەرپرسی بو (لە ئازادکردنی کەرکوک دا شەهید بو). شەو بە شاخەکەی پشتی توتمەدا هەڵگەڕاین بەرەو مەلەکان. شارەزاکەمان، کە گەنجێکی توتمەیی بو، لە بەر تاریکی ڕێگەی هەڵە کرد، لە ناو کۆمەڵێ تاشەبەردی زبردا عاسی بوین. شوێنەکەمان ڕوبەڕوی شیشار بو نەمانئەتوانی لایت لێ بدەین یان جگەرە دابگیرسێنین. هەر پزیسکێکیان ئەدی ئەیاندایە بەر تۆپ. من زۆر ماندو بوم و پشتم ئازاری ئەدام. چومە پەنای گابەردێ ویستم جگەرەیەک دابگیرسێنم. کە چەرخەکەم لێ دا. پێشمەرگەکان نەیان ئەزانی منم بە توڕەبونەوە زیاتر لە ١٠ کەس قیڕاندیان: «چەرخ لێ مەدە!».. «جگەرە مەکێشە!».. «ئاگر دامەگیرسێنە!»...

منیش بە توڕەبونەوە وتم: «تو خوا ئەمە شۆڕشە؟ شۆڕشگێڕانی ڤیەتنامی لە پاش ١٠ ساڵ چونە ناو هانۆی پایتەختی ڤیەتنامی خوارووەوە و گرتیان، کەچی ئێمە لە پاش ١٠ ساڵ تازە لەم شاخەدا عاسی بوین و نایشتوانین جگەرە بکێشین!» دیارە گلەییەکە لە خۆم و سەرکردایەتی جوڵانەوەکە بو، نەک لە پێشمەرگەکان. عەلی مام ڕەسوڵ (لە ڕاپەڕین دا شەهید بو)، کە خۆی شاخەوان و کوڕی قەندیل بو، بە ناو تاشە بەردەکان دا دابەزی ڕێگەیەکی بۆ داکشانی ئێمەش دۆزییەوە. سەرلەنوێ دابەزینەوە بناری شاخ و بە ڕێگایەکی ترا سەرکەوتینەوە. دەمەو بەیانی، پاش ماندوبونێکی زۆر، گەیشتینە مەلەکان. مەلەکانیش لە ژێر ئاگری تۆپباران دا بو.

*

چەند ڕۆژێ لە مەلەکانماینەوە، هێزەکانی مەڵبەندی ٣ مان لە هەڵوەرین دا بون. ئەو تیپە پێشمەرگەیەی بەرپرسی پاراستنی ماکۆک بون و بە دەستەوەیان دابو، سەرتیپەکەیان هاتە لام، بە توندی سەرکۆنەم کرد و، داوام لێ کرد بۆ ڕێکخستنەوە و هەڵساندنەوە و حەساندنەوەی تیپەکەی پێشمەرگەکانی لە شوێنێکی نزیک خۆمان دابنێ، تا ئاگاداری ئەکەمەوە. بەڵام ئەم پێشمەرگەکانی ترساند بو، بۆ شەو بە کۆمەڵ تەسلیم بونەوە.

بۆ ئەوەی لە ناوچەکە زیاتر نزیک بکەومەوە چومە زینی ئەستێرۆکان بە نیازی ئەوەی بچم بۆ دۆڵەڕەقە هەوڵێکی گرتنەوەی ماکۆک بدەین. سەیر ئەوە بو پێش گەیشتنی خۆم، لە ناو هێزەکانی دۆڵەڕەقەدا بلاویان کرد بووەوە، کەوا بە هێزێکی گەورەوە ئەچم بۆ دۆڵەڕەقە. پێشمەرگەکانیان چەک ئەکەم و هەندێکیشیان بە تاوانی (تقصیر) ئەکوژم. لەو ترسە هەمو دابویانە شاخ. دوان لە ئەندامەکانی مەڵبەند پێش گەیشتنی ئێمە ڕایان کرد بو بۆ ئێران و، لەوێوە بڕۆن بۆ ئەوروپا. لە بەر ئەوە لە باتی دۆڵەڕەقە چوم بۆ وەرتێ. ناردم بە شوێن فەرمانده‌کانیان دا. هەمویان هاتن و هەوڵێکی زۆرم دا خاویان بکەمەوە و باوەڕیان بهێنمەوە جێگەی خۆی. هەندێکیان نەیانشاردەوە، کە ورەیان بەرداوە و باوەڕیان بە پێشمەرگایەتی نەماوە، چونکە سەرکردایەتی یەکێتی کەسانی لێنەهاتوی کردۆتە فەرماندە و لێپرسراویان. پێ ئەچو بڕیاری خۆیان دابێ.

گەڕانەوە دۆڵە ڕەقە. بە کۆمەڵ دەستیان کرد بە تەسلیم بونەوە. سوار ئاغای ئاکۆ، کە فەرماندەی هەندێ لە هێزەکانی ئەوێ بو. بێتەلەکەی و دۆشکا و هەندێ چەکی تر کە لە یەکێتی وەرگرت بو، لە گەڵ چفرەی بروسکە تەسلیم عەزیز صدیق کرد بو. وت بوی: «من عەشیرەتەکەم هەموی تەسلیم بۆتەوە، خۆم بە تەنیا ماومەتەوە. بە تەنیاش هیچ سودێکم نیە. نامەوێ شتی یەکێتی ببەم، ئەوە کەلوپەلەکانی یەکێتی و، من خۆم ئەچم تەسلیم ئەبمەوە.» دۆڵەکە کەسی تێ دا نەما جگە لەو پێشمەرگانەی من لە گەڵ خۆم بردبومن بۆ ئەوێ کە خەڵکی ناوچەکانی تر بون.

*

ئەم هەرەسەی توشی هێزەکانی م ٣ بو، سەرەڕای ئەوەی جەزرەبەیەکی مەعنەوی بو لە پێشمەرگەکانی یەکێتی، ناوچەیەکی زۆر گرنگی کوردستانیشی لە دەس چو.

بۆ ئەوەی پاشماوەی هێزەکانی مەڵبەندەکە بە تایبەتی تیپەکانی سۆران، باڵەکایەتی، کاروخ، کۆدۆ، لەم دەردە بپارێزین، خۆم و هێزەکانی تر لە ناوچەکەدا ئەبو بمێنینەوە.

لە وەرتێ لە سێبەری دارگوێزێکی زۆر گەورەدا دانیشت بوین، خەریکی چاخواردنەوە بوین. دو فڕۆکە بە ئاسمانی ناوچەکەدا فڕی. هیچی نەکرد پێ ئەچو هی نۆڕین و ناسینی ناوچەکە بێ. بەڵام دوای ئەوە بە چەند دەقیقەیەک لە قەسرێ وە دایانینە بەر تۆپ. خۆمان دامانە شاخ و، بە خەڵکی دێیەکەمان وت، ئەوانیش خۆیان قایم کەن. یەکێ لە تۆپەکان لە دارگوێزێکی پیری دا بو، لە بن دەری هێنا بو.

خاوەنەکەی زۆری پێ ناخۆش بو، لە بەر خۆیەوە جنێوی ئەدا. فڕۆکەی جەنگیی بۆ ڕۆژی دوایی هاتەوە سەر وەرتێ و، ناو دێیەکەی بۆردومان کرد. ناودێ چۆڵ بو لە بەر ئەوە زەرەری گیانی نەبو، بەڵام لە کوخێکی سەروتری دابو. چەند کەسێکی کوشت بو.

وەرتێ شاخاوی و سەختە. ئێمە چوینە گەرەکی بەرۆژ، هەندێ ئەشکەوت و کونە بەردی لێ بو، پێشمەرگەکان جێگایان بۆ خۆیان چاک کرد. ئەو ماوەیە بە جۆرێکی نائاسایی بەردەوام بون لە سەر تۆپبارانی ئەو دۆڵەی ئێمەی تێ دا بوین. لە هەندێ شوێن، دەزگا جاسوسیەکان، بڵاویان کردبوەوە کە بە کیمیایی لێیان داوین. زۆر لە بێتەڵەکان ڕاستیی ئەم هەواڵەیان ئەپرسی. ئێمە خۆمان هەستمان بە هیچ نەئەکرد. بەڵام تۆپبارانەکە ئەوەندە خەست بو، هەر کەس لە کونەکەی دەربهاتایە، ژیانی لە مەترسی دا بو.

مانەوەمان ئیتر سودێکی ئەوتۆی نەمابو. لێشاوی تەسلیم بونەوە وەستا. ناوچەکە بە هۆی ئێمەوە گوشارێکی زۆری لە سەر بو. وەکو نیشانەی هەڵسانەوە لەو تێشکانە بڕیارمان دا، چالاکیەکی گەورە بنوێنین. فەوجێکی جاش لە ئاکۆیانی ڕەواندز بو. سەیر ئەوە بو موستەشاری فەوجەکە ناوی (کوردۆ) بو. چەند کەسێک چون بۆ (استطلاع) و، بۆ ئەوەی ئێمەش کەمێ لە تۆپباران خۆمان بدزینەوە، تا ئەوان لە (استطلاع) ئەبنەوە، سەرکەوتین بۆ سەر کاروخ.

کاروخ کە لە دورەوە سەیری ئەکەی شاخێکی قوچە، وا ئەزانی تەپڵە سەرەکەی تەسکە بەڵام کە سەرئەکەوی، ئینجا ئەبینی چەند فراوانە. لە باری پانی یا لە باری درێژی بە هەر لایەکی دا بڕۆی ڕۆژە ڕێیەک ئەبێ. لە هەندێ شوێنی دا چاڵەبەفری زۆر گەورە و، لە هەندێ شوێنی تری دا لێرەواری لێیە. هیچ کانیەکی لێ نیە.

*

چەندماڵێکی خۆشناو لە سەر کاروخ ڕەشماڵیان هەڵدا بو. مێگەلەکانیان هێنا بو بۆ لەوەڕ. لای ئەوان ماینەوە. بۆ ئەوەی دەزگای (استمکان) ی عیراقی نەماندۆزێتەوە ئەو یەکدوڕۆژە بێتەلمان بە کار نەهێنا. پاش دو ڕۆژ دابەزین و چوین بۆ دۆڵئاکۆ. لە دۆڵێک دا خۆمان مەڵاس دا.

پێشمەرگەکانی کە دانرابون بۆ ئەنجامدانی چالاکیەکە دابەشکران. هەمو کارەکان بە ڕێکوپێکی کران. بەڵام هەڵەیەک بەشێکی نیشەکەی تێک دا. چەند ڕەبیەیەک لە پشتی دێیەک بو، ئەبو پێشمەرگەکانی گەرمیان بیگرن، بۆ ئەوەش

ئەبو بە تاریکی بچنە ناو دێیەکە و، لەوێوە بەرەو ڕەبیەکان بەڕێ بکەون. لە چون دا پێش وەخت توشی تەقە بون و یەکێکیان لێ کوژرا. کارەکەیان بۆ نەکرا و گەڕانەوە. وایان زانی بو جاشی لێ دامەزراوە. تومەز ئەمانە تاقمێ پێشمەرگەی یەکێتی بون، بە ئیجازە لە ماڵەکانی خۆیان دا بون. لە بەر ئەوەی هیچ پێشمەرگە لە ناوچەکەدا نەبو، وایان زانی بو ئەمانە جاشن و بو سەر ئەوان ئەچن. دابویاننە بەر دەسڕێژ. شەوی ٢ - ٣ ی تەمموز پەلاماری فەوجەکە درا و بارەگاکەی و زۆری ڕەبیەکانی گیران. هەندێ لە جاشەکان هەلاتن و هەندێکیان کوژران و هەندێکیشیان گیران. بەلام لەم شەڕەدا مەحمودی حاجی فەرەجی کۆکۆیی، فەرماندەی تیپی خاڵخالان کوژرا، کە یەکێ لە سەرتیپە چاکەکانی یەکێتی بو.

*

دوای ئەم شەڕە هێزەکانم ئیزن دا هەر یەکە بۆ ناوچەی خۆی و، منیش بەرەو سماقولی بە ڕێ کەوتم. ماوەیەک لە باخەکانی سماقولی سەرۆچاوەدا لە گەڵ مەڵبەندی ٤ مامەوە. دوای چەند ڕۆژێ بەرەو دۆڵی جافەتی بە ڕێ کەوتمەوە.

لە تۆپزاوای کۆیەوە بە سەر جادەی کۆیەدا بە لای هەرموتەدا تێ پەڕین بۆ چەمی سورقاوشان. لە چەمی سورقاوشان هەندێ ماڵە جوتیاری لێ بو کشتوکاڵیان کرد بو. لامان دایە کەپری یەکێکیان، بە کۆمەڵ دانیشت بون، توتنیان بە شریتەوە ئەکرد. بە دەموچاو منیان نەئەناسی. هەندێ میوەیان بۆ هێناین. کابرای جوتیار شەپقەی لە سەرا بو. لێم پرسی: «دەنگوباس چیە؟» کابرا وتی: «دەنگوباس چیە؟ ئەڵێن فلان - ناوی منی هێنا - چوە مەڵبەندێکی بە تەسلیم کردنەوە داوە و هاتۆتەوە.» پێکەنیم و لە سەری نەڕۆیشتم. باسەکەم گۆڕی بۆ شتێکی تر.

*

تۆپباران و بۆردومانی فڕۆکە بەری مەرگە و ئاواییەکانی بناری ئاسۆسی پەرێشان کرد بو. مام جەلال لە سێروان نەمابو گوێزابویەوە یاخسەمەر. هەندێ خێوەت و کەپریان ڕێک خست بو. فەرەیدون ماڵەکەی لە ناو دێ بو. منیش لە سەر کانیەک لە ناو باخێک دا کەپرێکم کرد. دوای ماوەیەک چومە هەڵەدن. ئەولقادر هەڵەدنی، باوکی غەریب، ماڵەکەی خۆی بۆ چۆڵ کردم. بەلام ناو دێ بە کەڵکی من نەئەهات بڕیارم دا بچمە بەرگەڵو. لەوێ سەرلەنوێ کەوتمەوە خانو دروست کردن. بۆ خۆپاراستن لە تۆپ و بۆردومان ئەبو پەناگایش دروست بکەین.

*

*

٣ تەجروبە

لێرەدا بە پێویستی ئەزانم ٣ روداوی ئەو رۆژانە تۆمار بکەم، کە خۆمیان وەکو ئینسان ئێشاند و زەرەریان بە رێکخراوەکەمان و جولانەوەکەیش گەیاند. مەبەستم لە گێرانەوەیان ئێشاندنی هیچ کەس نیە، بەڵکو وەرگرتنی تەجروبە و پەندە.

*

*

تەجروبەی یەکەم: (موزایەدە)

هەندێ لەوانەی کە نوێنەری شۆرشگێران بون لە سەرکردایەتی یەکێتی دا، لە کاتی لێکۆڵینەوەی رەوتی گفتوگۆدا زۆر جار (موزایەدات) ی بێ جێیان ئەکرد و، ئەیانوت: ئەمە جاشایەتیە ئێمە ئەیکەین (مەبەستیان لە درێژە پێدانی مفاوەزە بو) و، داوایان ئەکرد هەرچی زوتر کۆتایی بە گفتوگۆ بهێنرێ و، شەر دەس پێ کرێتەوە.

جاروبار وایان دەرئەخست کە ئەگەر ئێمەی لایەنگری درێژە پێدانی گفتوگۆ توانای خەباتمان نەماوە، ئەوا ئەوانی دژی گفتوگۆ درێژەی پێ ئەدەن. کەچی کە شەر دەستی پێ کردەوە و گەرم بو، هێرشەکانی بەعس تا ئەهات توندوتیژتر ئەبو، ئەمانە یەکە یەکە تەسلیمی ئێران بون بۆ ئەوەی لەوێوە بە یەکجاری برۆن بۆ ئەوروپا. لەو کاتەدا ئێران هەڵوێستی لە یەکێتی دوژمنانە بو، ئەمانەی گرت و خستنیە ژێر گیروگازی لێکۆڵینەوە و لێپرسینەوەی سەختەوە. دوای ئەوەی بە وردی هەمو ناگاداریەکیان سەبارەت بە یەکێتی لێ وەرگرتن و سوکایەتییەکی زۆریان پێ کردن، ئینجا رێگەیان دان سەفەر بکەن.

*

تەجروبەی دوەم: سەنگەر گۆرین

لە جەنگەی ئەو روداوە سەختانەدا چەند کەسێ لەو فەرماندەی کەرتانەی کە لە کاتی گفتوگۆدا گیروگرفتی زۆریان دروست ئەکرد و شەریان بە جاش ئەفرۆشت و، هەندێ جار تاوانی زلیان ئەکرد، لەوانە: سەلاح شینە لە هەولێر، هەڵۆ و پشتیوان (هەردو ناو هی خۆیان نەبو) لە کەرکوک، عومەر عەرەب لە سلێمانی، هەر یەکەیان لە لایەکەوە لە گەڵ تاقمێ پێشمەرگە تەسلیم بونەوە و بون بە جاش و، دواتر بە جۆری جیاواز و لە شوێنی جیاوازدا لە شەری پێشمەرگەدا کوژران.

ئەمانە چەند نمونەیەک بون لەو چەکدارە بەرەڵلایانەی لە ریزەکانی یەکێتی دا

بون و، بە هۆی دەستەگەری و ململانێ ی ناوخۆی ناو یەکێتیەوە نەنەتوانرا بهێنرێتە ژێر باری دیسیپلینی پێشمەرگایەتیەوە و، هەندێ جار گیروگرفتی گەورەیان بۆ یەکێتی دروست ئەکرد..

*

لە هەموی سەیرتر، لە ناو جولانەوەی کوردا دیاردەیەکی دزێو هەیە: هی وا هەیە چەندین ساڵ پێشمەرگەیەکی گیانفیدا بوە کەچی لە پڕ لە بەر هۆیەکی پچوکی (سەخیف) هەڵئەگەڕێتەوە، ئەچێتە ڕیزی دوژمنەکانی دوێنێ یەوە و پێشیان ئەکەوێ بۆ شەڕی هاوڕێکانی دوێنێ ی و، گەرمتر و جددیتر لەوان، تا خۆی بە کوشت ئەدا، شەڕی هاوسەنگەرەکانی پێشوی ئەکا.

ئەگەرچی ئەم دیاردەیە لە هەمو شۆڕشەکانی کوردستانی عیراق و، لە هەمو قۆناغەکانی دا و، لە ناو هەمو حیزب و ڕێکخراوەکانی دا، دوبارە بۆتەوە، بەڵام تا ئێستا هیچ لێکۆڵینەوەیەکی لە سەر نەکراوە، ئەم دیاردە دزێوە ئەهێنێ لێکۆڵینەوەی کۆمەلایەتی، سیاسی، نەفسی... قوڵی لە سەر بکرێ.

*

تەجروبەی سێیەم: "ئالای" کام "شۆڕش"

لە کۆنفرەنسی یەکەمی کۆمەڵەدا هەندێ لە سەرکردەکانی لە هەڵبژاردن دا دەرنەچون و، ئەمەیان لە دڵ گرت و، بە ناڕەزاییەوە دەستیان لە کار هەڵگرت. جەعفەر سەفەری کرد بۆ دەرەوەی وڵات و، سالار لە گوندێکی شارباژێڕ دانیشت. پارەزانی کرد بە بنکەی خۆی. ناڕازییەکانی ناو کۆمەڵەیان هان ئەدا و لە خۆیان کۆ ئەکردەوە. ئەمانە ناڕەزایی و گلەیی و ڕەخنەکانی خۆیان نەئەشاردەوە و، زۆربشی ڕوی لە مام جەلال و من بو. کورتەی ناڕەزاییەکانیان ئەوە بو:

- کە مام جەلال دیکتاتۆرە، پشت بە ئاغا و کوێخا ئەبەستێ و، شۆڕشگێڕان لە سەر حسابی کۆمەڵە بەهێز ئەکا و، کۆمەڵەی کردوە بە دەسکەلای خۆی.

- کە من جگە لەوەی مارکسیی نیم، قسەم ڕەقە و لە پەیوەندی کۆمەلایەتی دا وشکم، موجامەلە نازانم و خەڵک تەریق ئەکەمەوە، بە خۆڕایی ئەچم بە گژ کادرەکان دا و ئەیانشکێنم. (فەردی)م و پرس بە کەس ناکەم. کۆمەڵەم کردوە بە دەسکەلای مام جەلال.

- کە سەرکردایەتی کۆمەڵە لە خەتی شەهید ئارام و لە مارکسیزم لای داوە، بۆتە بورجوازی پچوکی ناسیۆنالیست. لە ناو یەکێتی دا سەربەخۆیی ئایدیۆلۆجی و

سیاسی نەماوە.

راستییەکەیشی هۆی نارەزایی ئەوانە زۆرتر شەخسی بو، تا جیاوازی بیروباوەر. ئەیانویست خۆیان کاربەدەستی یەکەمی ناو کۆمەڵە بن.

ئەمانە لە هەر جێیەک بیان بیستایە کادرێ یان پێشمەرگەیەک نارازییە یان سزا دراوە، ئەوان پێوەندیان پێوە ئەکرد و، هەوڵیان ئەدا بیکەن بە هاودەنگی خۆیان. ئەگەرچی بە ئاشکرا ئەدوان و هاتوچۆ و جموجوڵیان ئەکرد و پێوەندییان لە گەڵ ئەم و ئەو ئەبەست، بەڵام هێشتا خۆیان لە رێکخراوێکی تایبەتی دا رێک نەخست بو. ئێمەیش تەنگمان پێ هەڵنەئەچنین و پێمان وابو جیاوازی بیر و بۆچون شتێکی ئاساییە، لە بەر ئەوە هیچ کام لەمانە لە ریزی کۆمەڵە و یەکێتی و پێشمەرگایەتی دەر نەکران. بە رێزەوە رەفتاریان لە گەڵ ئەکرا. یارمەتی مانگانەیان وەکو هەمو لێپرسراوەکانی تر وەر ئەگرت و، مەفرەزەکانی خۆیان لە گەڵ خۆیان هێڵرا بوەوە و، لە مەسەلە گرنگەکانیش دا پرسیان پێ ئەکرا و، بیروڕایان وەرئەگیرا.

کە گفتوگۆ دەستی پێ کرد، هەمویان خۆیان وا پیشان ئەدا لایەنگری گفتوگۆن. مەلا بەختیار لە دو خولی گفتوگۆدا هاوبەشیی کرد و، بۆ رازیکردنی نارازییەکانی دەرەوە گەشتێکی ئەوروپای کرد و، ئەو بو خاوەنی تیۆریی (گوشینی گفتوگۆ هەتا دوا چۆری) بو.

هێشتا گفتوگۆ نەپچڕا بو، چالاکیەکانی ئەم تاقمە شێوەیەکی تری بە خۆیەوە گرت و، هەندێ بەیان و بلاوکراوەی نهێنییان بە چاپ دژی گفتوگۆ و سەرکردایەتی کۆمەڵە و یەکێتی دەرکرد و، تاوانباریان کردن بە خۆبەدەستەوە دان و، ئەوانەی هاودەنگی ئەمانەیش بون لە دەرەوە کەوتنە چالاکیەکی زۆرتر دژی یەکێتی، بە تایبەتی دوای ئەوەی کە سالار، لە سەر داوای خۆی و بە یارمەتی یەکێتی چو بۆ دەرەوە.

هەتا پێوەندییەکانی یەکێتی و بەعس گرژتر ئەبو، هێرشی ئەمانیش بۆ سەر یەکێتی و کۆمەڵە توندتر و چالاکیەکانیان دژی زیاتر ئەبو. کە شەڕ دەستی پێ کردەوە ئەمان وایان زانی یەکێتی توشی تەنگوچەڵەمەیەکی قوڵ بوە و هەلێکی لە باریان بۆ هەڵ ئەکەوێ، یەکێتی تێک بدەن و، ئەوان ببن بە میراتگری سەروەریەکانی. چەند بەیانێکیان لە دەرەوە بە ناوی کۆمەڵەوە دەرکرد و، لە ناوەوەیش دەستیان کرد بە دەرکردنی بلاوکراوەیەکی دەوری بە ناوی ئاڵای شۆڕش (ئا. ش) ەوە.

ئاش لە ناوەوەی کوردستان چەند کاری زەرەربەخشیان ئەنجام ئەدا، لەوانە:

١. پرۆپاگـاندەیەکی فـراوان بە نوسین و بە قـسـە بۆ سـوکـکردنی یەکـێتی و کۆمەڵە و سەرکردەکانی و، بۆ ڕوخاندنی وورەی پێشمەرگە و هاندانیان بۆ وازهێنان و خۆبەدەستەوە دان بە بیانوی بێهودەیی خەباتی شاخ و کۆبونەوەی پرۆلیتاریا لە شارەکاندا.

٢. لە بەر ئەوەی نە خۆیان وازیان لە پلە و پایەکانی ناو کۆمەڵە و یەکێتی هێنا بو، نە کۆمەڵە و یەکێتی یش لە ڕیزەکانی خۆی دەری کرد بون، ئاگاداری هەمو نەخشە و پلان و بڕیارەکانی یەکێتی بون. بەو پەڕی نائەمینیەوە (سوئی ئیستیفادە) یان لەم بونەی خـۆیان ئەکـرد لە ناو ڕیزەکـانی یەکـێـتی دا، بۆ ئاشکراکـردنی نهێنیەکانی.

٣. بە (ئوسلوبی مونامەرە) کاریان ئەکرد و، لە ڕو بە جۆرێ قسەیان ئەکرد و بە نهێنی بە جۆرێکی تر و، بە ئاشکرا بە جۆرێ هەڵسوکەوتیان ئەکرد و لە پەناوە بە چەشنێکی تر. سوێند خواردنی درۆ و دوڕوویی و دوزمانییان کرد بو بە پیشە.

ئاش لە دەرەوەی وڵاتیش چەند کارێکی خراپی ئەنجام دا، لەوانە:

١. بۆ شێـواندنی ناوبانگی سـیاسـیی یەکـێتی و سـەرکـردەکـانی، هەرچی ئاگاداریەکیان لە سەر یەکێتی هەبو، دایان بە حکومەتەکانی ئێران، سوریا، لیبیا، فەلەستینیەکان.

٢. بۆ دوا خـسـتنی ئاشـتـبونەوەی یەکـێـتی و لایەنەکـانی جـود، هەوڵێکی زۆریان دا تەگەرەی تێ بخەن، بەوەی سەرکردایەتی لایەنەکانی جود قانیع بکەن کە بەو نزیکانە یەکێتی هەڵئەوەشێ و، ناچار ئەبێ بچێتەوە باوەشی بەعس.

بەم کـارانە ئاش ئاژاوەیەکی فـیکری و، گـیـروگـرفـتـێکی سـیـاسـیی و، کـێشـەیەکی ڕێکخـراوەییان لە ناو یەکـێـتی و هێزەکەی دا و، لە پاڵ ئەوانەیش دا مەترسییەکی (ئەمنی) یان بۆ سەر سەلامەتی یەکێتی دروست کرد بو، لە کاتێک دا کە یەکێتی لە شەڕی مان و نەمان دا بو لە گەڵ دڕندەترین ڕژێمی ناوچەکە کە خاوەنی پێنجەمین هێزی زلی دنیا بو:

ئەبو ئیـتـر ڕادەیەک بۆ ئەم ئاژاوەیە دابنرێ و چارەیەکی بۆ بدۆزرێتـەوە. بۆ ئەوەی بگەین بە چارەسەرێکی گونجاو، کەوتینە هاویشتنی هەنگاوی یەک لە دوای یەک:

هەنگاوی یەکەم، بە ڕێگەی گفـتـوگۆی ڕاسـتـەوخۆ لە گەڵ مـەلا بەخـتـیـار و چەند کـەسـێکی تر لە هاوڕێ و هاوبیـرەکـانی بۆ ئەوەی جـۆرێ لە (لەیەک گـەیشتن) بدۆزینەوە و کـێشـەکە بە خۆشی چارەسـەر بکرێ. دوای چەندین خـولی گفـتـوگۆی

(صریح) و (جدی) درێژ ئەم هەوڵە سەری نەگرت.

هەنگاوی دوەم، کە گفتوگۆ کەڵکی نەگرت و، ئەوان ئەمەیان بە لاوازی هەڵوێستی سەرکردایەتی کۆمەڵە لێک ئەدایەوە و، لە هێرشەکانیان دا درتر بون، ناچار بوین بۆ بەرپەرچدانەوەی ئیتیهام و پروپاگاندەکانیان زنجیرەیەک وتار لە گۆڤاری (کۆمەڵە) دا بنوسین و، بنچینە فیکرییەکانیان هەڵبتەکێنین.

هەنگاوی سێیەم، کە گفتوگۆی ڕاستەوخۆ و، دیالۆگی ئایدیۆلۆجی کەڵکی نەدا، ئەبو ڕێگەی چارەسەرێکی تر بگرین، کەوتینە کۆکردنەوەی ئاگاداری لە سەر ئاش و سەرکردایەتی و چالاکەکانی و داوودەزگای چاپەمەنیەکەی، دەرکەوت: ئەمانە بە کەڵک وەرگرتن لە ئەندامەتی خۆیان لە ناو یەکێتی و لە ناو کۆمەڵە دا، بە نهێنی لە ناو یەکێتی دا، حزبێکیان دامەزراند بو، خاوەنی کۆمیتەی سەرکردایەتی، لق و، شانەی ئەندامان و، خاوەنی بەرنامەی تایبەتی خۆی و، خاوەنی ئۆرگان و بلاوکراوەی تایبەتی خۆیان بون. ئەمەش هەموی بۆ ئەوەی کۆمەڵە لە ناوەوە کلۆر بکەن و بیروخێنن.

م س لە کۆبونەوەیەکی خۆی دا بڕیاری چەککردن و گرتنی سەرکردایەتیەکەی دان. جێبەجێ کردنی کارەکەیش سپێردرا بە هەندێ لە فەرماندەکانی پێشمەرگە، بە یارمەتی مەڵبەندی ١ ئەگەر پێویستی کرد، شەوی ١ - ٢ / ١١ / ٨٥ هێزێک چوە سەر ماڵەکەی مەلا بەختیار لە گوندی تەکیە و بە بێ شەڕ و تەقە خۆی و هاوڕێکانی گیران و، دەزگای چاپەکەیشیان کە لە ماڵەکەی ئەودا حەشار درا بو دەستی بە سەردا گیرا و، دوایین ژمارەی ئاش و بەڵگەکانیان کەوتە بەردەس. جگە لە مەلا بەختیار و، شێخ عەلی و، پشکۆ، ئەوانی کە هەمویان ئازاد کران و، ڕێگە دران بۆ کوێ ئەچن بچن. بەم کارە گیروگرفتی ئاش لە ناو کوردستانی عیراق و لە ناو یەکێتی دا کۆتایی هات. ئەگەرچی ئەوانەیان کە لە ئەوروپا بون و، ئەوانەیان کە چون بۆ ئێران درێژەیان بە کارەکانیان دا، بەڵام هیچ تەئسیرێکیان لە سەر ڕەوتی ڕوداوەکان ئەما.

زەرەری ئاش لە کۆمەڵە و یەکێتی زیاتر لەوەی مادی بێ بەر لەشی ڕێکخراوەیی کۆمەڵە و پێشمەرگەیی یەکێتی بکەوێ، زەرەری ئەخلاقی بو بەر مۆراڵ و مەعنەویاتی کەوت، چونکە ئەو بەها پاکە سیاسییانەی کۆمەڵە گەرەکی بو لە جولانەوەی کوردا بیچەسپێنێ، ئەمان بەم کارە هەڵیان تەکاند.

*

*

پیرۆزبایی بەعسییانە لە سالّی نوێ

لە مانگی کانونی یەکەم دا کە بەرەو سالّی تازە ئەچوین، چەندین شەڕی قورس قەوما و جەیش لە چەند جێ ی دور لە یەکتر هێرشی گەورەی ئەکرد. لە ١١ ی مانگ دا هێرشی بۆ سەر گمۆ (چوارتا) و، لە ١٥ ی مانگ دا بۆ سەر سماقولی (شەقلاوە) و، لە ٢٦ ی مانگ دا بۆ سەر سەید جەژنی، فەتاح هۆمەر، هۆمەربل (کفری) و، لە ٣٠ ی مانگ دا بۆ سەر گۆبان و سەید خەلیل (کەلار).. کرد. لەم شەڕانەدا ٩ پێشمەرگە کوژران.

سەعات ١٢ ی نیوە شەوی ٣١ / ١٢ / ٩٨٥ کە ئەچوینە ناو ڕۆژی ١ / ١ ی ١٩٨٦ ەوە، لە گەلّ عەبدوڕەحیم عەبدوللا کە هەتا بلێ ی قسەخۆش و نوکتەزان بو (دوایی‌تر شەهید بو)، موحسین عەلی ئەکبەر، دلێری سەید مەجید، دانیشت بوین دەمەتەقێمان ئەکرد، بارەگاکانیان لە بەرگەلّو تۆپباران کردین. ئەگەرچی تۆپبارانەکەیان خەست بو بەلاّم زەرەری گیانیی لێ نەکەوتەوە. ئەمە پیرۆزبایی بەعس بو بۆ سالّی نوێ.

*

*

## ٣ . پێکهاتنی یەکێتی لە گەڵ ئێران

کە شەڕ دەستی پێ کردەوە بەعس کەسوکاری پێشمەرگە : گەنجەکانیان گرتن و، پیرووپەککەوتەکانیان لە سورداش فڕێ دان بێن بۆ لای کورەکانیان. ڕێگەیان بە منالی پێشمەرگە نەئەدا لە قوتابخانەکان دا بخوێنن و، لە نەخۆشخانەکان دا تیمار نەئەکران. فەرمانێکی بۆ دادگاکان دەرکرد کە هیچ دادگایەک شکاتی کەسوکاری پێشمەرگە نەپرسێ. لەوەیش سەیرتر ژنی پێشمەرگەیان هان ئەدا لە دادگادا واز لە مێردەکانیان بهێنن. چەند جارێکیش لە شارەکان دا (منع التجول) یان کرد و، ماڵ بە ماڵ ئەیان پشکنی و، چەند جارێ لە سەر (وێنە) یەک گەنجێکیان گوللە باران ئەکرد.

شەڕ زۆر بە گەرمی لە کوردستان دا بەردەوام. بەعس کەوتبوە جێبەجێکردنی هەڕەشەکانی. ئاوایییەکانی کوردستانی بەوپەڕی دڕندایەتییەوە بۆردومان ئەکرد. بارودۆخێکی خەمناک باڵی بە سەر هەمو لادێکان دا کێشا بو، چونکە هیچ دێیەک و هیچ خێزانێک لە ژیانی خۆی ئەمین نەبو، هەمیشە لە ژێر مەترسی تۆپباران و پەلاماری هالیکۆپتەر و فڕۆکەدا بون، کە کوێرانە خەڵکیان ئەکوشت. دانیشتوانی هەندێ لە گوندەکان ناچاربون ئاوایییەکانیان چۆڵ ئەکرد و، لە شاخ و داخ یان لە دەشت و دەر پەناگایان دروست کرد بو. تیرۆر و تۆقاندن سەرانسەری کوردستانی داگرت بو. گەمارۆی ئابوری هەمو ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی یەکێتی درا بو، نەیانئەهێشت خواردەمەنی و سوتەمەنی بۆ بچێ، تەنانەت هاتوچۆکردنیشیان لە گەڵ بڕی بو. ٤ شوفێری خەڵکی دۆڵی جافەتییان هەڵواسی لە سەر ئەوەی بە ئۆتۆمۆبیل لە نێوان دۆڵەکەدا و سلێمانی دا هاتوچۆیان کرد بو.

لەم هەلومەرجە سەختەدا، زۆر جار دانیشتوانی دێهاتەکان لە گەڵ کادر و لێپرسراوەکانی یەکێتی دا بە ڕاشکاوی ئەدوان و، ئەیانوت: «ئەمەی ئێوە ئەیکەن شێتییە. لە گەڵ لایەک ڕێک بکەون ئێران بێ یان عێراق!» ئەمە قسەی ناخی دەرونیان بو. بێگومان ئەمە بۆ ئەوە بو لەو ئابلۆقەیە دەربچن و، دەرویەکیان لە ڕودا بکرێتەوە بەڵام ئێمە لە ڕوویەکی ترەوە بۆ ئەم مەسەلەیەمان ئەڕوانی کە چەند لایەنی هەبو، بەڵام دوانیان گرنگترینیان بون:

١. دەرچونی بەعس لەو شەڕە بە سەلامەتی، واتە جێبەجێکردنی هەڕەشەکەی طاریق عەزیز و لە ناوبردنی گەلەکەمان. تەجروبەی دوەمین جەنگی جیهانی دەری خست بو کە ئەڵەمانیای نازی و ئیتالیای فاشی کە تێکەڵاوی شەڕ بون هەردوکیان ڕوخان، بەڵام ئیسپانیا و پورتوگال چونکە خۆیان لە شەڕ دور گرت، ڕژێمەکانیان سەرەڕای دڕندایەتییان هەر مایەوە. من خۆم و زۆر لە هاوڕێکانم لە (موعارەزەی عیراقی) نائومێد بوین و، پێمان وا بو تەنیا ڕێگەی ڕوخاندنی بەعسیش هەر ئەو شەڕەیە.

٢. لە ئەنجامی پێوەندیەکانی چەند ساڵی ڕابوردودا لە گەڵ هەمو لایەنەکانی جود بە کردەوە تێ گەیشت بوین هەتا لە گەڵ ئێران نەگەینە ڕێککەوتنی سیاسی، ناتوانین لە گەڵ لایەنەکانی جود ئاشت ببینەوە و، شەڕی ناوخۆ هەر درێژە ئەکێشێ. ئێران تەنیا لایە ئەتوانێ کۆتایی بەم شەڕە بهێنێ.

*

حەڵاڵ و حەرام

حکومەتی عیراق، هەر کات ئێران، تورکیا، سوریا ئامادە بوبن هاوکاری و هاوئاهەنگی سپایی لە گەڵ بکەن بۆ تێکشکاندنی جوڵانەوەی کورد، بە پەرۆشەوە بێ دودڵی کردویەتی . لوا رکن وفیق السامرائی، لە (ل ٥٠) کتێبەکەی دا: «حطام البوابه الشرقیه» شایەتی ئەدا و ئەنوسێ:

«.. وشاهدت تلك التحصینات ایضا فی قاعده مهراباد (طهران) الجویه خلال زیارتی الرسمیه الی ایران عام ١٩٧٥ وفی العام ١٩٧٨ ضمن عملیه الفرسان الشجعان التی نفذتها قوات الفیلق الاول بقیاده الشهید اللواء الرکن ولید محمود سیرت (الذی اعدم عام ١٩٧٩ بتهمه التامر) وقد کلفت بمهمه الارتباط والتنسیق مع فرقه المشاة الثامنه والعشرین الایرانیه فی مناطق: بانه ومریوان، من اجل اغلاق الحدود الایرانیه، ولحصر قوات البیشمرکه الکردیه بین زحف القوات البریه العراقیه من الامام واغلاق القوات الایرانیه للحدود من الخلف.»

(عملیه الفرسان الشجعان) هەمان لەشکرکێشی ی فەیلەقی یەکە بۆ سەر بارەگاکانی یەکێتی لە شێنێ لە زستانی ١٩٧٨ دا، کە جەنەراڵ بەفر و خۆراگری پێشمەرگەکان، شکاندی.

کارێ کە بۆ حکومەتێکی بەهێز بۆ لە ناوبردنی گەلێکی بچوک (حەڵاڵ) بێ، بۆچی بۆ گەلێکی بچوک کە لە مەترسی لە ناو چون دا بێ، ئەبێ (حەرام) بێ؟

*

هێزەکانی ئێران گەیشتبونە هەمو ناوچەکانی سەر سنور. بە درێژایی سنوری کوردستانی عیراق - ئێران، هەر لە شنۆوە بەرامبەر سیدەکان هەتا قەسری شیرین بەرامبەر خانەقین بنکە و بارەگای جەنگیی سپای پاسداران و ئەرتەشی لێ هەبو. هەندێ پێوەندی کرا بەڵام ناستەکەی نزم و گفتوگۆکان بێ سود و هەندێ جار نائومێدکەر بون. ئێران خۆی وا پیشان ئەدا بێ منەتە لە کورد و شەڕەکەی.

ئاش کە تازە جیابوبوە لە یەکێتی، ئێران و لایەنەکانی جودی وا تێ گەیاند بو، کە یەکێتی هێزەکانی لاواز بوە و بەو نزیکانە هەڵئەوەشێ یان ناچار ئەبێ خۆی بهاوێتەوە ناو باوەشی بەعس.

پارتی یش، ئێرانی وا تێ گەیاند بو کە شەڕی نێوان یەکێتی و بەعس تەمسیلە، یەکێتی جاشی عیراقە، ئەوە بۆ هەڵخەڵەتاندنی خەڵک و موعارەزە ئەو تەمسیلە ئەکەن.

لە ناو لایەنەکانی جودا تەنیا حسک هەڵوێستی لە یەکێتی جیاواز بو، هانی ئێرانی ئەدا لە گەڵ یەکێتی پێک بێ و، هانی یەکێتی ئەدا لە گەڵ ئێران دۆستایەتی بکا و، یەکێتیان وەکو هێزێکی شەڕکەری سەرەکی ناو مەیدانی کوردستانی عیراق بە ئێرانیەکان، ناساند بو. حسک لە سەر ئەم هەڵوێستەیان توشی هەندێ تەنگ پێ هەڵچنین و سەغڵەت کردن بوبون. محەممەدی حاجی مەحمود و شێخ محەممەدی شاکەلی، کە بنکەکانیان لە سورێن بو، لەوانە بون هەوڵێکی زۆریان دابو لە گەڵ ئێرانیەکان بۆ ئەوەی بیروڕایان لە سەر یەکێتی ڕاست بکەنەوە. هیچ ئێرانیەک نەیئەوێرا بێتە ناوچەکانی یەکێتی چونکە وا تێ گەیشتبون یەکێتی ئەیانگرێ و تەسلیمی عیراقیان ئەکا. بۆ بە درۆخستنەوەی ئەم چاوڕاوە محەممەدی حاجی مەحمود چەند جارێک هەندێ فەرماندەی مەیدانی پلەی خوارەوەی پاسدارانی هێنان بۆ شارباژێڕ. شێخ محەممەدی شاکەلیش بۆ ئاڵوگۆڕی بیروڕا جارێک خۆی بە تەنیا هات و، چەند ڕۆژێ میوانی م س بو.

*

دەس پێ کردنی پێوەندی

لەو ماوەیەدا چەند کەس لە بەرپرسەکانی یەکێتی: لە سەرەتا دا دلێری سەید مەجید و دوای ئەو، د فوئاد مەعصوم، ئازاد هەورامی، جەبار فەرمان، دارای شێخ جەلالی حەفید، ڕەفعەت عەبدوڕەحمان، عەلی پچکۆل، شێردڵ حەویزی، جەلال عەبدولقادر، بە کۆمەڵ و بە جیا سەردانی ئێرانیان کرد لە سەردەشت، ورمێ، کرماشان لە گەڵ کاربەدەستی ئێرانی، لە (اطلاعات) و (سپای پاسداران) دانیشتن

و، له کاربەدەستانی ئێرانیش چەند کەس هاتن بۆ گەلاڵەی شینکایەتی، یاخسەمەر، بەرگەڵو. ئێرانیەکان وەکو ئەوەی لە خەباتی ژێرزەمینی دا بن، هەمیشە ناوی ڕاستەقینەیَ خۆیان ئەگۆڕی و بە ناوی وەهمی و نهێنیەوە قسەیان لە گەڵ ئەکردین.

*

زۆری ئەم هاتوچۆیانە ئەنجامێکی ئەوتۆی نەبو، بەڵکو وەڕزکەر و ناخۆش بون. لە ناو ئەوانەدا دو سەردان گرنگییان هەبو، کاریان لە پێوەندیەکانی ئێران و یەکێتی کرد

یەکەمیان، سلێمان قەصاب، کە یەکێ لە کادرەکانی حسک بو، یەکێ لە کاربەدەستانی (اطلاعات) ی لە گەڵ خۆی هێنا. هەم گفتوگۆی سیاسی لە گەڵ کرا و هەم خۆیشی حەزی کرد گەشتێکی خێرا بە هەندێ ناوچەی ژێر دەسەڵاتی یەکێتی دا بکا. لە یەکێ لەو گفتوگۆیانەی لە نێوان ئەم و هەندێ لە ئەندامانیَ م س کرا، ئەم نوێنەرە قسەیەکی کرد وتی: «ئێوە تازە گفتوگۆتان لە گەڵ عیراق بڕیوە، ضەمان چیە ئەم پێوەندیەی لە گەڵ ئێرانی دروستی ئەکەن، بە کاری ناهێنن بۆ ئەوەی هەڵوێستتان بە هێز بکا لە گفتوگۆی داهاتوتان دا لە گەڵ عیراق؟»

ئێمەیش وتمان: «ئەی ضەمان بۆ ئێمە چیە، ئێوەیش لە سەودای داهاتوتان دا لە گەڵ حکومەتی عیراق، ئەم پێوەندیەی لە گەڵ کوردی عیراق دروستی ئەکەن، وەکو عامیلێکی زەغت بۆ بە بەدەستهێنانی دەسکەوتی زۆرتر بە کاری ناهێنن؟»

وتی: «ضەمانی ئێمە ئیمام خومەینیە. ئیمام تا ڕوخاندنی ڕژێمی بەعس شەڕ لە گەڵ عیراق ڕاناگرێ!»

وتمان: «ئیمام خومەینی بەشەرە، وەکو هەمو بەشەرێکی تر مردنی لە ڕێگەدایە، ئەگەر ئیمام مرد؟»

وتی: «هەر کەس دوای ئیمام بێ، ئەبێ پێڕەوی لە ڕێبازی ئەو بکا و، درێژە بە شەڕ بدا.»

وتمان: «ئەگەر یەکێ هات و شەڕی ڕاگرت؟»

وتی: «ئێمە موسوڵمانین، ئەگەر دوای ئیمام یەکێ بێت و پێڕەوی لە ڕێبازی ئەو نەکا، بۆ ئێمە جائیز نیە نوێژی لە پشتەوە بکەین.»

وتمان: «ڕەنگە ئەوە بۆ ئێوە بەس بێ، بەڵام بۆ ئێمە کافی نیە!»

پرسی: «بۆ لە گەڵ پارتی ڕێک ناکەون؟»

وتمان: «ئێمە ئەمانەوێ لە گەڵیان ڕێک بکەوین، هەتا ئێستەیش چەند

جاری جەولمان داوە، بەلام ئێوە نەتان هێشتوە ئێمە و ئەوان رێک بکەوین!»
پرسی: «ئامادەن لە سەر چی لە گەلیان رێک بکەون؟»
وتمان: «هەر لەوەی مەرحەبای یەکتری بکەین و پێکەوە چایی بخۆینەوە تا ئەوەی هەمو داوودەزگاکانمان بکەین بە یەک و پێکەو شەڕی بەعس بکەین!»
دوەمیان، دوای ئەمیش وەفدێکی ۹ کەسی هات، تێکەلاو بو لە نوێنەری چەند وەزارەت و دەزگای جیا جیای ئێرانی. وەکو دوایی دەرکەوت، سەرۆکی وەفدەکەیان، سەرۆکی دەزگای (اطلاعات) ی سپا بو. ئەم وەفدە، لەم سەردانەی دا، چەند کارێکی ئەنجام دا:
١. لە گەل مام جەلال گفتوگۆیان کرد و، ئاگاداریان کرد کە ئێران بڕیاری هاوکاری و دۆستایەتی یەکێتی داوە.
٢. گەشتێکی خێرایان بۆ ناوچەکانی کەرکوک و گەرمیان کرد و، لەم گەشتەدا هەتا نزیک دامەزراوەکانی نەوتی کەرکوک چون.
٣. لێکۆلینەوەی ئەوەیان کرد بو، کە یەکێتی:
ئەلف، رەفتاری لە گەل مزگەوت و مەلاکان چۆنە؟ مزگەوتەکانی داخستوە و مەلاکانی دەرکردوە و نوێژ و خواپەرستی قەدەغە کردوە، وەکو ناحەزەکانی یەکێتی ئەوانیان تێ گەیاند بو، یا نە؟
ب، بونی بنکەکانی یەکێتی لە ناو جەرگەی کوردستانی عیراق و، لە نزیک بنکەکانی جەیشی عیراق دا، ئەگەڕێتەوە بۆ هاوکاری ژێر بە ژێری سەرانی یەکێتی و هێزەکانی عیراق، وەکو ناحەزەکانی یەکێتی لە وانیان گەیاند بو، یان ئەگەڕێتەوە بۆ گیانی فیداکارانەیان؟
ئەم وەفدە کە گەڕانەوە بۆ ئێران بیروبۆچونی ئیجابییان دابو بە کاربەدەستانی ئێران و، ئێران ئیتر بڕیاری دا لە گەل یەکێتی پێوەندی رەسمیی دابمەزرێنێ و هاوکاری بکا، یەکێتی لە ئێران و ئێران لە کوردستانی عیراق دەفتەر (مەکتەب) بکاتەوە. دەفتەری سەرەکی یەکێتی لە ئێران لە کرماشان کرایەوە و، دەفتەری سەرەکی ئێران لە یاخسەمەر.
کێشەی موعارەزەی ئێرانی
لە سەرەتاوە یەکێ لە گرێ سەختەکانی گفتوگۆی یەکێتی و ئێران مەسەلەی جۆری رەفتار بو لە گەل حدکا و هێزە ئێرانیەکانی تر. ئێران داوای لە یەکێتی ئەکرد: دان بە هەلەی خۆی دا بنێ لە سەر ئەوەی یارمەتی حدکای داوە لە شەڕدا دژی ئێران و، پێوەندی خۆی لە گەل ببڕێ و، لە کوردستانی عیراق دەریان بکەن. ئەم کارە بە

یەکێتی نەئەکرا و پێچەوانەی بیروباوەڕی بو. ئەم داوایە هەر لە سەرەتاوە ڕەت کرایەوە و، چەندین مانگ پێوەندی هەردولای دوا خست.

ئێران لەو کاتەدا پێویستی بە گەرمکردنی شەڕ هەبو لە کوردستان، بۆ ئەوەی لە جەبهەی ناوەڕاست و خواروودا بتوانێ نەخشەکانی جێبەجێ بکا. (اولویات) ی سیاسەتیشی گۆڕا بو، سەردەمێ پاکتاوکردنی موعارەزەی ناوخۆی لە پلەی یەکەم دا دانا بو، دوای ئەوەی ئەو ئامانجەی بە جێ هێنا بو، بردنەوەی شەڕی عیراقی لە پلەی یەکەم دا دانا بو، بە تایبەتی لەو قۆناغەدا ئیتر موعارەزەی، بە هەمو لایەنەکانیەوە، لە ئێران کز کردبو، بارەگا و بنکەکانی لە دەرەوەی ئێران بو. کاریگەرییان بۆ سەر ڕژێمەکەیان زۆر کەم بوبوەوە. ئێران، کە دڵنیا بو لەوەی یەکێتی ناچێتە ژێر باری ئەو مەرجەوە، سەرەنجام وازی لەو داوایە هێنا، تەنانەت چاوپۆشییان لەوە کرد کە بنکەکانی حدکا لە گەورەدێ و بنکەکانی کۆمەڵە لە چۆخماخ بو، بنکەی ئەوانیش لە یاخسەمەر بو. بنکەکانیان نزیکی یەکتری بون و، هەندێ جار لە ڕێگاوبان توشی یەکتری ئەبون. بەڵام هەمویان بەڵێنیان دابو کە ڕێزی ئەرزی کوردستانی عیراق بگرن و، هیچ کارێ لە سەر ئەرزی کوردستانی عیراق دژی یەکتری نەکەن. هەردو لا: هەم ئێرانیەکان و، هەم موعارەزەی ئێرانی بەڵێنەکانیان بە جێ هێنا.

لێدانی دامەزراوەکانی نەوت

یەکێ لەو کارانەی کە ئێرانیەکان بە لایانەوە گرنگ بو بکرێ لێدانی دامەزراوەکانی نەوتی کەرکوک بو. لە نزیک کەرکوک بە تەنیا هێزی یەکێتی لێ بو. هێزەکانی یەکێتی ئەیانتوانی بگەنە ناو بیرەکانی نەوت و، بگەنە نزیک دامەزراوە سەرەکیەکانی.

تەنیا سەرچاوەی دەرامەتی دارایی عیراق بۆ دابینکردنی خەرجی جەنگیی شەڕی ئێران و خەرجی جەنگیی شەڕی کورد هەر نەوت بو. نەوتی کەرکوکیش گرنگترین سەرچاوەی ئەم دەرامەتە بو. هەمو ڕۆژێ زیاتر لە ١ ملیۆن بەرمیل نەوت لە ٢٢٢ بیر نەوتی بابەگوڕگوڕ و ئاڤانە و داودگورگە هەڵئەهێنجرا و بە ناو لولەدا ڕەوانەی تورکیا ئەکرا.

ئێمە خۆمان چەند ساڵێ بو بیرمان لە لێدان و تێکدانی کرد بوەوە و زانیاری زۆرمان لە سەر کۆکردبوەوە، بەڵام جێبەجێ کردنی لە توانای ئێمەدا نەبو، بە تایبەتی چەک و تفاقی جەنگیی ئێمە زۆر سادە و دواکەوتو بو بۆ ئەنجامدانی کارێکی لەو بابەتە، بە کەڵک و کاریگەر نەبو. نەوتی کەرکوک لە هەڵهێنجانەوە تا ناردنی بە

لوله دا بۆ تورکیا به چەند قۆناغێک دا ئەڕوا. له سەر دەمی هەر بیرێک یەک درەختی کریسمس دروستکراوە، کە دەرهێنانی نەوتی خاو له بیرەکە ڕێک ئەخات و له کاتی پێویست دا ئەتوانێ بیگرێ، هیچی لێ دەر نەیەت. له دەمی بیرەکەوە بە لوله ئەگوێزرێتەوە بۆ ئیستگەیەک کە گاز له نەوتی خاو جیا ئەکاتەوە، دوای ئەم کارە بە لوله ئەگوێزرێتەوە بۆ چەند منارەیەکی بەرز کە نەوتەکەی تێ دا ئەکولێنرێ و له هەندێ مادەی زیاد خاوێنی ئەکاتەوە، ئینجا لێرەوە ئەکرایە ئەو لوله سەرەکیەوە کە بەرەو تورکیا ئەچو.

*

کەرکوک، سەرەڕای ئەوەی دامەزراوەکانی نەوتی کۆمپانیای نەوتی سەروی تێ دا بو، بارەگای (فەیلەقی یەک) و، بارەگای (مکتب تنظیم الشمال) و، بارەگای (منظومە استخبارات المنطقە الشمالیە) ی لێ بو. ئەمانە قایم گیرا بون و، هێزێکی گەورە له ناو کەرکوک دا بو. هەروەها فرۆکەخانەی هالیکۆپتەر و یەکێ له بنکە گەورەکانی هێزی ئاسمانی لێ بو. هێزێکی تایبەتی بەرپرسی پارێزگاری دامەزراوەکانی نەوت بو. ناوچەکەیش بە سەدان ڕەبیەی عەسکەری تێ دا بو.

*

سەرکردایەتی یەکێتی له بەر گرنگی کارەکە، دانان و جێبەجێکردنی پلانی هەمو چالاکیەکەیان بە من سپارد و، من ڕۆژانە ئەبو خەریکی وردەکاری پلانەکە بم. ئێرانیەکان ئەم کارەیان بە لاوە زۆر گرنگ بو، تەنانەت بە مەرجی جدی بونی یەکێتی له شەڕی عیراق و، هاوکاری پاشەڕۆژیان دانا بو.

له ڕوی ئامادەکردنی شەرکەری شارەزای ناوچەکە و لێوەشاوەوە یەکێتی گیروگرفتی نەبو. هەروەها له ڕوی هەبونی زانیاری ورد له سەر دامەزراوەکانی نەوت و شوێنەکانیان و له ڕوی زانیاری له سەر هێزەکانی دوژمن له ناوچەکەدا، بەلام یەکێتی بەو چەکانەی هەیبو کارێکی گرنگی پێ نەئەکرا و، ئەیشینەزانی بۆ کارێکی وەها چ جۆرە چەکێک بە کەڵک و کاریگەرە. ئەم کارە بە پسپۆڕەکانی ئێران سپێردرا. مەفرەزەی تێکەڵاوی سپا و پێشمەرگە بە وردی (استطلاع) ی سنوری کارەکەیان کرد و، ئەوی پێویست بو بە دەستیان هێنا.

*

پاش لێکۆڵینەوەیەکی زۆر له سەر نەخشەی عەسکەری و له سەر ئەرزی چالاکیەکە و پاش گفتوگۆی زۆر دور و درێژی بەرپرسەکانی یەکێتی و ئێران، ئێرانیەکان پلانەکەیان بەوە ساخ کردەوە کە چەند هاوەنێکی ١٢٠ ملم و چەند

کاتیۆشایەک ببرێتە نزیک مەیدانی دەرهێنانی نەوتەکە و بەوە ئاگرباران بکرێ و تێک بدرێ. جۆری لێدانەکە و چەند و چۆنی چەکەکانی ئەوان دیارییان کرد. ئێران دەوڵەت بو، بەڵام ئەویش وەکو تاقمێکی جەنگی پارتیزانی ڕەفتاری ئەکرد. لە ناو ئەو هەمو چەکە جۆراوجۆرانەی دەوڵەتان ئەتوانن بۆ ئەنجامدانی کارێکی وەها گرنگ بە کاری بهێنن، وە لەو سەردەمەدا کە ئێران هەیبو و لە شەڕی عیراق دا بەکاری ئەهێنا، یا لە بازاڕی چەکفرۆشتن دا هەبو ئەیتوانی بۆ ئەم کارە بیکڕێ، ئەوان تەنیا هاوەن و کاتیۆشایان هەڵبژارد بو، کە هەم مەداکەیان کورتە و ئەبێ بۆ بەکارهێنانی ببرایەتە شوێنێکی زۆر نزیک بۆ ئەوەی گوللەکانی بگاتە ئامانج و، هەم لە پێکانی ئامانج دا ورد و مەزبوت نیە. بێگومان ئەم هەڵبژاردنەی ئەوان، بە دو جۆر لێک ئەدرێتەوە:

یەکەمیان، ئەزانی و ئەشارەزایی ئێران لە کاروباری جەنگیی دا. یان،

دوەمیان، (محدود) بونی کارەکە و، جدی ئەبونی ئێران لە جێبەجێکردنی تەواوی ئەخشەکە، واتە تێکدانی تەواوی دامەزراوەکانی نەوتی کەرکوک.

ئێران لە کاروباری جەنگی دا ئەشارەزا نەبو، بە تایبەتی دوای تێپەڕینی زیاتر لە ٥ ساڵ بە سەر شەڕەکەدا، کارەکەیش شتێ نەبو، چەند فەرماندەیەکی مەیدانی سەر سنور هەڵیان بژارد بێ، بەڵکو لە بەرزتری ناوەندی دەسەڵاتی بڕیاردان دا لە ئێران، باس و پەسند کرا بو.

*

پلانەکە بەم جۆرەی خوارەوە دانرا:

١. هێزێکی بە سەرکردایەتی شەوکەتی حاجی موشیر ئاگر بارانی زەمبور بکەن.

٢. هێزێکی تر بە سەرکردایەتی ئازاد حەمە غەریب ئاگربارانی جەبەل بۆر بکەن.

٣. هێزێکی تر کە هێزی سەرەکی و هەرە گەورەی یەکێتی بو، بە سەرپەرشتی خۆم، ئاگربارانی بابەگوڕگوڕ بکەن.

٤. هاوزەمان لە گەڵ دەسپێکردنی ئەم ٣ هێرشەدا، پەلاماری داوودەزگاکانی بەعس لە ناو چەندین شار و ئۆردوگا و شوێنی دیاردا بدرێ.

*

گوێزانەوەی تفاقی جەنگی

ئەو تفاقەی بۆ ئەم کارە پێویست بو کە بریتی بو لە: ١٠ هاوەنی ١٢٠ ملم،

کاتیوشا، ٤٥٠تەن گوللەی هاوەن و کاتیوشا، چەند دانەیەک سامی ٧ ی دژی فرۆکە، چەند دانەیەک ساروخی دژی تانک و، هەندێ فیشەکی کلاشینکۆف. ئەمانە پێشتر، بە سەرپەرشتی جەبار فەرمان لە زەردەکانیەوە لە ئێرانەوە بە کۆڵی ئێستر گوێزرابونەوە بۆ دۆڵی جافەتی. گوێزانەوەی کارێکی یەکجار دژوار و سەخت بو. ئەبو جارێک لە زەردەکانی بار بکرێ و لە سەر چەمی کەڵوێ دابگیرێ و بە گوریس لە ڕوبار بپەڕێتەوە، جارێکی تریش لە ئێستر بار بکرێ تا ئەگەیشتە یەکێ لە عەمارەکانی دۆڵی جافەتی و لە ئەشکەوتەکانی گوێزیلە و یاخسەمەر و هەڵەدن ئەشاردرانەوە. عیراق ئەیزانی چەک و تفاقی جەنگی ئەگوێزرێتەوە، لە بەر ئەوە بەردەوام تۆپبارانی ناوچەکەی ئەکرد و فرۆکەی جەنگی ئەهاتە سەری و بۆردومانی ئەکرد. بەڵام کاروانەکان بە شەو ئەگوێزرانەوە و ئەشکەوتەکان قایم بون، ئەیانتوانی هیچ زەرەرێکی لێ بدەن.

*

بۆ کاتی جێبەجێکردن ئەبو هەمو ئەو بارە قورسانە ببرێنە نزیک شوێنی ئەنجامدانی چالاکیەکە. ئەمەیش دیسان کارێکی دژوار و پڕ مەترسی بو. ئەم قۆناغەیان ئەبو بە لۆری و تراکتۆر ئەنجام بدرێ. ئازاد و شەوکەت هەر یەکەیان بەشی خۆی، بۆ جیا کرایەوە.

کاتی جێبەجێکردن دیاری کرا. ئازاد و شەوکەت هەر یەکەیان بەشی خۆی بە شەو لە لۆری بار کرد و بە دابان دا بردیان بۆ خڕی زێویە و پەڕاندیانەوە نزیک شوێنی کارەکانی خۆیان. ئێمەیش بەشی خۆمان، کە لە هی هەردوکیان زۆرتر بو، بە ٣٢ تراکتۆر و ٤ لۆری لە خڕی زێویە و گردەبۆرەوە گوێزایەوە کەڵەشێرە و ڕۆژی دوایی بردمانە گوندی مۆڕخواردە لە نزیک شاخی خاڵخالان. بنکەی فەرماندەیی هێزەکەی خۆمم لە مۆڕخواردە دانا. دوری مۆڕخواردە لە کەرکوکەوە لە ٤٠ کلم کەمتر بو.

*

ئەوسا لە ناو هەمو هێزەکەی ی ن ک دا چەند کەسێکی کەم بە کار هێنانی هاوەنیان ئەزانی و، کەسێکی تێ دا ئەبو کاتیوشا و، سامی ٧ و، ساروخی دژی تانک بزانێ، لە بەر ئەوە ئەبو ئێران وەستای بە کارهێنانی ئەم چەکانەیش دابین بکا. بۆ ئەنجامدانی کارەکە لە هەر ٣ قۆڵی بابەگوڕگوڕ، جەبەل بۆر، زەمبور، نزیکەی ١٥٠ کەسیان تەرخان کرد بو. پێشمەرگەکانی یەکێتی یش ئەوانەی کە دانرا بون لەم چالاکیەدا بەشداری بکەن بە هەمویان نزیکەی ٣ هەزار کەس بون.

ئێـرانیـەکـان، چەند کـەسـێکیـان فـەرمـاندەی عـەمـەلیـات، بەڵام زۆریان تەکنککار (فنی) بون، وەستای تەقاندنی هاوەن و کاتیۆشا و، ئامادەکردنی سام و ساروخەکان و دەزگای بێتەل بون. ڕاستیەکەیشی هەندێکیان لە کارەکانی خۆیان دا شارەزا و لە جێبەجێکردنیدا ئازا بون.

*

کارەکەی ئێمە چەند قۆناغێ بو:

١. ئەبو هەمو ناوچەکە بە وردی لە هێرشی پیادە و تانـک و فڕۆکەی دوژمن بپارێزرێ بۆ ئەوەی تاقمی عـملیاتەکە بە سەلامەتی و ئاسودەیی کارەکەیان ئەنجام بدەن.

٢. ئەبو چەک و تفاقەکانی لە شوێنی کارەکە نزیک بخرێتەوە.

٣. ئەبو لە هەنگاوی یەکەم دا هەندێ لە ڕەبیەکانی کەلی سێکانیان بگیرێ بۆ ئەوەی هاوەن و کاتیۆشاکان ببرێنە بن کەلەکە و لە ئامانجەکانی بە ئەندازەیەک نزیک بخرێنەوە کە گوللەکانیان بیگاتێ.

٤. ئەبو پڕکردنەوەی هاوەنەکان و کاتیۆشاکان بە جۆرێک ڕێک بخرێن کە لە ماوەی چەند دەقیقەیەک دا، بێ ئەوەی ئاگری چەکەکان بکوژێتەوە، کارەکەیان تەواو بکەن. بۆ ئەمەیش هەر هاوەنێک و هەر کاتیۆشایەک لۆریەکی تایبەتی بۆ تەرخان کرا بو، کە پڕ کرا بو لە گوللە و، پێشمەرگەکان فێر کرا بون کە وەکو چیمەنتۆکاری سـەربان بەڕیز لە ناو لۆریەکـەوە دەسـتـاودەست گـوللەکـان بدەن بە یەکـتـری بۆ پڕکـردنەوەی کاتیۆشاکان و هاوەنەکان، یەک لە دوای یەک. هەر کاتیۆشایەک ١٢ گـوللەی ئەخـوارد و، بە هەمـوی ٤ کـاتیـۆشـامـان پێ بو. وەها ڕێک خـرا بون تا کاتیۆشای چوارەم خالی ئەبوەوە، کاتیۆشای یەکەم پڕ ئەکرایەوە.

*

جێبەجێ کردن

عـەسـری ڕۆژی ١٠ / ١٠ / ٨٦ کـە بۆ نیـوەشـەوەکـەی دەس ئەکـرا بە جێبەجێکردنی لە مـالی یەکێ لە جـوتیـارەکانی مۆڕخـوارده خـەریکی دابەشکردنی هێزەکان بوین، هەندێ کـامێرامانی ئێرانی لەوێ بون، وێنەی کۆبونەوە و کارەکانیان ئەگرت. من ڕوم کردە یەکێ لە ئێرانیەکان، کە ئەو دەم فەرماندەی سپای پێنجەمی پاسداران بو، وتم: «ئێرە مۆڕخواردەیە ٤٠ کلم لە کەکوکەوە دورە کە گەورەترین حقلی نەوتی دنیـای تێ دایە. لە سـالی ١٩٢٧ ەوە نەوتی لێ دەرئەهێنرێ، ئاخـۆ هیـچ نیـشانەیەک بەم دێیەوە دیارە کـە دینارێکی ئەو نەوتە بۆ پێشکەوتنی تێدا سەرف

کرابێ؟» وتی: «نەا» وتم: «عیراق بە دەرامەتی ئەم نەوتەیە دەیان ساڵە گەلەکەمان لە ناو ئەبا، هەر لە بەر ئەوەیە ئێوەمان هێناوە پێکەوە تێکی بدەین!»

ئینجا تاقم تاقم هێزەکانمان بە رێ کرد هەر یەکەیان بۆ ئەنجامدانی کارەکەی خۆی و، ئێمەیش ئێوارەکەی سەرکەوتینە سەر خاڵخالان بۆ ئەوەی لە دورەوە سەرپەرشتی رووداوەکان بکەین. لە سەعات ١٢ ی نیوەشەودا ئاگاداری هەمو تۆڵەکان کرا: (چرا هەڵکەن!) کە نیشانەی دەس پێکردن بو.

لە هەمو لایەکەوە زرمە هەستا و کارەکانیان بە رێکوپێکی ئەنجام دا. بۆ ئەوەی هیچ پارچەیەکی چەکەکان بە جێ بهێڵن، پێشمەرگەکان گەڕانەوە و بڵاوەیان لێ کرد. هەمان شەو من هەواڵەکەم بە مام جەلال و م س گەیاند و، ئێرانیەکانیش بە (قەرارگای خاتم الانبیا)، کە سەرکردایەتی هاوبەشی هێزە چەکدارەکانی ئێران بو. لە گەڵ ئێرانیەکانی کە لە گەڵم بون، بۆ بە سەربردنی رۆژێکی نەزانراو، چوینە دێ ی شێخانی چەمی رێزان بە هیوای ئەوەی شەوی داهاتو بگەڕێینەوە دۆڵی جافەتی.

کاردانەوەی عیراق ئەو شەوە و رۆژی دوایی شتێکی ئەوتۆ نەبو. ئەگەرچی هەندێ فڕۆکەی جەنگی هەستا و، هەندێ بۆمبی روناککردنەوەیان لە ئاسمان دا تەقاند. بەلام هیچیان بە دی نەکرد. چونکە پەلامارەکە ئەوەندە کوتوپڕ و چاوەڕێنەکراو بو و، جگە لە دامەزراوەکانی نەوت، بارەگاکانی فەیلەق، ئیستخبارات، حیزبی بەعس و فڕۆکەخانەکانیش لە هەمان کات دا، بۆ ئەوەی ئەپەرژێنە سەر دەسکردنەوە، ئاگر باران کرا بون، لە پێش دا وایان زانی بو هەڵگەڕانەوەیەک لە ناو خۆیان دا رووی داوە. بۆ رۆژی دوایی کەوت بونە لێکۆڵینەوە.

*

بڵاوکردنەوەی هەواڵەکە

رۆژی دوایی دەزگاکانی راگەیاندنی ئێران، بە هەرا وهوریایەکی زۆرەوە هەواڵەکەیان بڵاو کردەوە کە هێزەکانی ئێران ئەو کارەیان ئەنجام داوە. ئەمەیش پێچەوانەی ئەو رێککەوتنە بو لە گەڵیان کرا بو. ئەبوایە ئێران چالاکیەکەی بە ناوی یەکێتی و بە یارمەتی ئێران بڵاو بکردایەتەوە، نەک بەو جۆرە. مام جەلال بە توندی نارەزایی دەربڕی بو، هەروەها لە لای ئێمەیشەوە وا رێککەوت بوین، بە هەمان چەک و کەرەستەی پێمان بو، زنجیرەیەک چالاکی تر بنوێنین، هەمویان راگیران و جێبەجێ نەکران، ئێوارەکەی بەرەو بەرگەڵو کەوتینە رێ.

یەکێتی و ئێران لەم کارەدا هاوبەش بون، بەڵام دو ئامانجی جیاوازیان هەبو:
- یەکێتی ئەیویست بە ڕاستی زەرەر لە دامەزراوەکانی نەوتی کەرکوک بدا، کە لەو کاتەدا سەرچاوەی سەرەکی دەرامەتی دارایی ڕژێمی بەعس و داوودەزگاکانی بو.
- هەرچی ئێرانیش بو، لەم چالاکییە و، لەم هەراو هوریا ئیعلامییە مەبەستێکی سیاسی هەبو. لەو کاتەدا کۆبونەوەی ئۆپێک هەبو، ئەیویست هەندێ لە داواکانی خۆی بسەپێنێ بەوەی تێیان بگەیەنێ هەر کات بیەوێ ئەتوانێ زەرەر لە نەوتی عیراق بدا و، بەوە پشێوی بخاتە بازاڕی جیهانیی نەوتەوە.

*

فەتح و نەصر

ئەم عەملیاتە کەئێرانیەکان ناویان لێ نا: «عەمەلیاتی فەتحی یەک» سەرەتای دەسپێکردنی هاوکاری جەنگیی ئێران و یەکێتی بو، عەمەلیاتەکانی تریشیان ناو نا فەتحی ١ و ٢ و ٣ ... هتد. لە گەڵ پارتی یش هەندێ عەمەلیاتی هاوبەشیان کرد بو ناویان نابو عەمەلیاتی نەصری ١ و ٢ و ٣ ... هتد. هەر بەم دو ناوەوە ئەو بنکانەی پاسداران کە ئیشەکانی یەکێتیان لە ئێران دا ئەنجام ئەدا ناویان نابون (قەرارگای فەتح) و، ئەوانەی ئیشەکانی پارتییان ئەنجام ئەدا ناویان نابون (قەرارگای نەصر).

*

ڕێککەوتن لە گەڵ ئێران

دوای فەتحی یەک ئیتر ئێران لە گەڵ یەکێتی نزیک کەوتەوە و لە توانای جەنگیی یەکێتی و نفوزی لە ناو کورد و ئاگاداری لە سەر هێزە چەکدارەکانی عیراق، باشتر تێگەیشتن. پێویستیەکی زۆریان بەوە هەبو، جەبهەی کوردستان گەرم بکەن، یا هیچ نەبێ وای لێ بکەن بەشێکی گرنگی جەیشی عیراقی خەریک بکا.

لە تشرینی یەکەمی ٨٦ دا مام جەلالیان دەعوەت کرد. مام جەلال لە گەڵ وەفدی یەکێتی کە پێک هات بو لە: فەرەیدون عەبدولقادر، د. کەمال خۆشناو، دارا حەفید، ڕەفعەت عەبدورەحمان، شێردڵ حەویزی، چون بۆ ئێران، لە سنورەوە پێشوازیەکی ڕەسمیی و گەرمیان کردن. لە تاران، جگە لە موحسینی ڕەزائی، جێگری فەرماندەی گشتی سپای پاسداران و، موحسینی ڕەفیقدۆست، وەزیری پاسداران و، سەرانی سپا، هاشمی ڕەفسنجانی یشی بینی بو، کە ئەو دەم سەرۆکی مەجلیسی ئیسلامی ئێران و، لە هەمان کات دا فەرماندەی کاربەدەستی قەرارگای

خاتم الانبیا و، بەهێزترین کەسایەتی سیاسی ئێران بو. زنجیرەیەک گفتوگۆی لە گەڵ کردن و ئەنجامی گفتوگۆکان لە گەڵ ئێران ڕێککەوتنێک و، بە ناوبژی ئێران لە گەڵ ئیدریس بارزانی ڕێککەتنێکی تری ئیمزا کرد.

ڕێککەوتن لە گەڵ ئێران، لە باتی یەکێتی نیشتمانیی کوردستان مام جەلال و، لە باتی جمهوری ئیسلامیی ئێران محەممەد باقر زولقەدر، کە ماوەیەک بو بە سەرۆکی ستادی سپای پاسداران، ئیمزایان کرد بو.

*

کورتەی ڕێککەوتنەکە: هاوکاری سیاسی و عەسکەری و ئیعلامی یەکتری بو، بۆ ڕوخاندنی ڕژێی بەعس و، هێنانە سەرکاری حکومەتێک کە گەلی عیراق خۆی هەڵی بژێرێ. هەروەها پشتیوانی لە تێکۆشانی گەلی کورد لە پێناوی ئامانجە ڕەواکانی دا، بە پشتیوانیکردنی سیاسی و جەنگیی یەکێتی و، بە یارمەتیدانی بە چەک، ئازوقە و، دەرمان. بە تەداوی کردنی بریندارەکانی لە خەستەخانەکانی ئێران دا. بەرێکەدانی ئەندام و لێپرسراوەکانی لە ئێرانەوە هاتوچۆی دنیا بکەن. بە بلاوکردنەوەی هەواڵەکانی کوردستان لە دەزگاکانی ڕاگەیاندنی ئێرانەوە. بە ڕێکەدان بە ڕۆژنامەوانی بێگانە لە ئێرانەوە سەردانی کوردستان بکەن.

بێگومان هیچ ڕێککەوتنێک لە نێوان دو هێزی نابەرامبەردا، لە نێوان دەوڵەتێکی گەورەی وەکو ئێران و گەلێکی بێ دەوڵەتی گەمارۆدراوی وەکو کوردا، هاوسەنگ و هاوتا و بەرامبەر نابێ. لە دوایین حسابی قازانج و زیان دا، کەڵکوەرگری یەکەم لە قازانجەکانی هەمیشە هەر لایەنە بەهێزەکە ئەبێ و، زەرەرمەندی یەکەم لە زیانەکانی هەمیشە هەر لایەنە لاوازەکە ئەبێ.

*

عیراق گرنگی هاوکاری یەکێتی و ئێرانی ئەزانی، هەروەها گرنگی نزیکی و دراوسێیەتی ئەم دو هاوپەیمانە نوێیەی ئەزانی. لە سەرەتای دامەزراندنی یەکێتیەوە سوریا ئەیویست یارمەتی یەکێتی بدا، بەڵام چونکە سنوریان بە یەکەوە نەبو، یەکێتی هەرگیز نەیتوانی، وەکو پێویست، کەڵک لە دۆستایەتی سوریا وەربگرێ.

پێش ئەوەی مام جەلال بچێ بۆ ئێران و، بە درێژایی ئەو ماوەیەی لە ئێران بو، دوای ئەوەی کە گەڕایەوە، عیراق ناوچەکانی چوارتای کرد بو بە مەیدانێکی زۆر گەرمی شەڕ. هێزێکی گەورەی بە سەرکردایەتی قائید فەیلەقی یەک لیوا ڕوکنی قوات خاصە نزار عبدالکریم الخزرجی، کە یەکێ لە باشترین ئەفسەرەکانی جەیشی عیراق بو، لە سەر کۆکردبوەوە. هەوڵی گرتنی ناوچە سنوریەکانی ئەدا بۆ ئەوەی

ڕێگای هاتوچۆی نێوان یەکێتی و ئێران دابخات. هەر بۆ ئەو مەبەستە و لەو ماوەیەدا عیزەت دوری، (نائب) ی سەرۆکی (مجلس قیادە الثورە) و عەبدولجەببار شەنشەل، سەرۆکی ئەرکانی جەیشی عیراق هاتنە سلێمانی.

*

یەکێتی لە دوای هەڵگیرسانی جەنگی عیراق - ئێرانەوە تاکتیکی شەڕی گۆڕی بو، تاکتیکەکانی جەنگی پارتیزانی و جەنگی جەبهەیی تێکەڵاو کرد بو، ئەمەیش یەکێ بو لە ئەنجامەکانی خەریکبونی هێزی سەرەکیی عیراق بە شەڕی ئێرانەوە. لە سەرەتادا هەندێ بنکە و بارەگای دانا و، ساڵ بە ساڵ ئەم بنکە و بارەگایانە فراونتر ئەبون. جگە لە دانیشتوانی دێهاتەکان،ماڵی هەزاران پێشمەرگە و، بارەگای جیا جیای پێشمەرگەیی و ڕێکخراوەیی و کۆمەڵایەتی و، نەخۆشخانە، چاپخانە.. ی تێ دا دامەزراند بو، ئەبو لە بەرامبەر هێرشەکانی جەیش دا بیانپارێزێ. هێزی پێشمەرگە کە لە بنەڕەت دا هێزێکی پارتیزانیێ گەرۆک بو، لەو قۆناعەدا ئەبو ئەرکەکانی جەیشێکی نیزامی، بۆ ئەنجامدانی شەڕێکی جەبهەیی، بە جێ بهێنێ، بە بێ ئەوەی گۆڕین بە سەر پێکهاتن و مەشق و چەکاکانی دا هات بێ. ئەمەیش لە وزەی ئەو هێزە پچوکەدا نەبو، کە لە بەرامبەر جەیشی عیراقی زەبەڵلاحی، خاوەن ئەزمونی درێژی شەڕی پارتیزانی و جەبهەیی و، خاوەن گەورەترین جبەخانەی جەنگیی دا، هەتا سەر ڕابوەستێ. ئەگەرچی پێشمەرگەکان نازایەتی زۆریان ئەنواند بەڵام هەر جێیەکی جەیش بیویستایە بیگرێ سەرەنجام ئەیگرت. لەو ناوچەیەدا جەیشی عیراق هەندێ شوێنی گرنگیان گرت. بەشی زۆری تیپە باش و شەرکەرەکانی یەکێتی لە سەرانسەری کوردستانەوە ئەهێنران بۆ پاراستنی ئەم ناوچەیە، زۆر جار ئەکەوتنە بەر هێرشی توندوتیژ و زیانی گیانییان لێ ئەکەوت، بەڵام داخرانی ئەم دەروە وەکو ئەوە وابو دەس بنێنە بینی جوڵانەوەکە و بیخنکێنن، لە بەر ئەوە ئەبو بە هەر نرخێ بێ بیپارێزن.

*

*

## ٤ . ئاشتبونەوە لە گەڵ لایەنەکانی جود

سەرکردایەتی یەکێتی چەند ساڵ بو هەوڵی ئاشتبونەوەی ئەدا لە گەڵ لایەنەکانی جود، چەند جارێ نامە و نێردراوی نارد بو بۆ لای حشع، پارتی، حسک، بەڵام بەری نەبو. پێوەندی نێوان یەکێتی و لایەنەکانی جود، ئەگەرچی بە هۆی دوری هێزەکانی ئەوانەوە لە ناوچەکانی یەکێتی، شەڕی تێ دا نەمابو، بەڵام گرژ و حاڵەتی شەڕد بەردەوام بو.

رێککەوتن لە گەڵ حسک

تەنیا لایەنی کە بە دەنگ بانگی یەکێتییەوە هات حسک بو. سەرەتا شێخ محەممەدی شاکەلی سەردانێکی مام جەلال و مەکتەبی سیاسی کرد و، دوای ئەویش چەند جارێ محەممەدی حاجی مەحمود هات و گفتوگۆی لە گەڵ مام جەلال و ئەندامانی مەکتەبی سیاسی کرد. ئەم هاتوچۆیانە زەمینەیان خۆش کرد بۆ ئەوەی دەستەی نوێنەرایەتی حیزبەکەیان بۆ گفتوگۆی ڕەسمیی لە گەڵ سەرکردایەتی یەکێتی بێن بۆ یاخسەمەر.

وەفدێکی حسک کە پێک هات بو لە: قادر جەباری، محەممەد شاکەلی، محەممەد ڕەحیم (خاڵە حاجی) ١٨ - ٢٤ ی نیسانی ٨٦ هاتن بۆ یاخسەمەر. لە گەڵ ئەم وەفدە ڕێککەوتنێکی گرنگ ئیمزا کرا. لەو ڕێککەوتنەدا یەکێتی ئازادی کاری سیاسی، پێشمەرگەیی، ڕێکخراوەیی، ڕاگەیاندنی، لە هەمو ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆی دا بۆ حسک سەلماند. حسکیش ئەوەی بۆ یەکێتی سەلماند بو کە حورمەتی واقیع بگرێ و، کادرەکانی دەس نەخەنە کاروباری حوکمڕانی ناوچەکان و کۆکردنەوەی گومرگەوە. یەکێتی لە داهاتی گومرگ بەشێکی بۆ ژیان و خەرجی پێشمەرگە و بارەگاکانی حسک تەرخان کرد.

ئەم هەنگاوەی حسک کارێکی ئازایانە و گرنگ بو، چونکە:

١. ئەگەرچی گفتوگۆ لە نێوان یەکێتی و حکومەتی ئێران دا دەستی پێ کرد بو، بەڵام هێشتا بە هیچ ڕێککەوتنێ نەگەیشت بون، لە بەر ئەوە ئێران پێ ی خۆش نەبو بەر لەوەی خۆی لە گەڵ یەکێتی پێک بێ، هیچ لایەنێکی کوردی لە گەڵی ئاشت ببێتەوە.

٢. لایەنەکانی جود، بە تایبەتی پارتی و شیوعی، پێیان خۆش نەبو، چونکە پێیان وابو ڕێککەوتنی یەکلایەنی لە گەڵ یەکێتی جود لاواز و، هەڵوێستی لایەنەکانی جود لە بەردەم یەکێتی دا لاواز ئەکا.

ئەم ڕێککەوتنە کۆتایی بە شەڕ و کێشەی بێهودەی نێوان ئەم دو حیزبە هێنا و، لاپەڕەیەکی تازەی دۆستایەتی و هاوکاری کردەوە. کادر و پێشمەرگەکانی حسک گەڕانەوە ناوچەکانی سلێمانی، هەولێر، کەرکوک و، بنکە و بارەگایان دانا و، بە ئازادی چالاکی سیاسی، ڕێکخراوەیی، پێشمەرگەیی و ڕاگەیاندنیان ئەنواند.

بۆ پتەوکردنی ئەم ڕێککەوتنە وەفدێکی تری حسک لە ١١- ١٣ ی تەممۆزی ٨٦ هات کە سکرتێری حیزب، ڕەسوڵ مامەند، سەرۆکایەتی ئەکرد. یەکێتی و حسک بەلاغێکی هاوبەشی عەرەبییان دەرکرد، تێ یدا نوسرا بو:

«ینبغی علی جمیع الاطراف السیاسیه فی کردستان جعل مساله التلاحم وانها ء الاقتتال الداخلی فیما بینها حجر الاساس فی سیاستها الراهنه بغیه تحقیق الجبهه الکردستانیه القائمه علی القرار الکردی المستقل فی قیاده ثوره شعبنا ضد نظام بغداد الفاشی الذی یرید اباده شعبنا ومحو الشخصیه القومیه لکردستان وبغیه الوصول الی اهداف حرکه شعبنا الثوریه و تحقیق مبدا حقه فی تقریر المصیر.»

وەفدی حسک لایان وابو کە یەکێتی بەرامبەر ئاشتبونەوە لە گەڵ پارتی دا سارده و، پێویستە جدی تر بێ. لایەنی یەکێتی بۆیان ڕون کردنەوە: کە یەکێتی بۆ ئاشتبونەوە لە گەڵ پارتی جدییە و، بۆ ئەم مەبەستە چەند جارێ نامە و نێردراویان بۆ ڕەوانە کراوە. بەڵام پارتی دەستی ئەکا چونکە نایەوێ بێ ڕەزامەندی ئێران هیچ ڕێککەوتنێ لە گەڵ یەکێتی ئیمزا بکا و، تا یەکێتی لە گەڵ ئێران نەگاتە ڕێککەوتن، پارتی لە گەڵی ڕێک ناکەوێ. وا پێشنیار کرا کە حسک بۆ ناوبژی و کۆبونەوەی هاوبەش و ئاشتبونەوەی یەکێتی و پارتی تێ بکەوێ.

ڕێککەوتن لە گەڵ پاسۆک

وەفدی پاسۆک کە پێکهات بو لە کەریم سەلام، شەماڵ و بێستون، لە ڕۆژانی ١٠ - ١٢ ی مایسی ٨٦ دا سەردانی بارەگای م س یان کرد لە یاخسەمەر بۆ گفتوگۆی دوقۆڵی و ڕێککەوتن. یەکێتی و پاسۆک بەیانێکی هاوبەشیان بڵاوکردەوە و، ڕێککەوتنێکیان ئیمزا کرد. بەمجۆرە شەڕ و کێشەی نێوان ئەم دو لایەش کۆتایی پێ هات و، لاپەڕەیەکی تازەی دۆستایەتی و هاوکاری دەستی پێ کرد. پاسۆک بارەگاکانی هێنایەوە نزیک بارەگاکانی سەرکردایەتی یەکێتی.

ڕێککەوتن لە گەڵ حشع

مەلا ئەحمەدی بانیخێلانی بە نوێنەرایەتی حشع لە حوزەیرانی ٨٦ دا هاتە یاخسەمەر. هەندێ لە بنکەکانی ئەمان کە لە ناوچەی پێنجوین لە سەر سنوری عیراق ئێران بو، کەوت بوە نێوان هێزەکانی ئێران و عیراقەوە. ئێرانیەکان لە باتی کارناسانی تەنگیان پێ هەڵچنی بون. لەو کاتەدا بۆ ئەوەی لەم سەغڵەتیە دەربچن لە هەمو لایەنەکانی کە زیاتر ئەمان پێویستیان بە ئاشتبونەوە هەبو لە گەڵ یەکێتی بۆ ئەوەی هێزەکانیان بە ئازادی بگەڕێنەوە ناوچەکانی یەکێتی.

پاش گفتوگۆیەکی صەریح و درێژ ڕێککەوتنێکی دو قۆڵی لە گەڵ مەلا ئەحمەد ئیمزا کرا. دەقی ڕێککەوتنەکە بە بێتەل نێردرا بۆ سەرکردایەتی حشع لە برادۆست و، وەکو هەواڵێکی سیاسی لە ڕادیۆکەی یەکێتیەوە بلاو کرایەوە. سەرکردایەتی حشع لە ناو خۆیان دا ناکۆک بون، بە بیانوی ئەوەی کە مەلا ئەحمەد لەو دەسەلاتەی پێ ی دراوە تێپەڕیوە، لە باتی ئەوەی ڕێککەوتنەکە-پەسند بکەن، لە ڕادیۆکەیانەوە ڕایان گەیاند کە ئەوان خۆیان بەو ڕێککەوتنەوە نابەستنەوە و هێرشی ڕاگەیاندنیان بۆ سەر یەکێتی دەس پێ کردەوە.

حشع ڕێککەوتنی لە گەڵ یەکێتی دواخست، خستیە دوای ئاشتبونەوەی یەکێتی لە گەڵ هەمو لایەنەکانی جود و، لە شام ڕێکەوتنێکیان لە گەڵ د فوئاد مەعصوم ئیمزا کرد.

ڕێککەوتن لە گەڵ پارتی

هەوڵەکانی حسک لەم مەیدانەدا بێ ئەنجام مایەوە، هەروەکو یەکێتی پێشبینی کرد بو، تا لە گەڵ ئێران بە تەواوی پێک نەهات، پارتی هیچ جۆرە هەنگاوێکی نەنا بۆ ڕێککەوتن لە گەڵ یەکێتی.

لەو سەفەرەدا کە مام جەلال بۆ تارانی کرد و، دوای ئەوەی گفتوگۆکانی لە گەڵ کاربەدەستانی ئێرانی بە ئیمزاکردنی ڕێککەوتنێکی سیاسی، عەسکەری تەواو بو، ئەوسا ئێران لە ڕۆژانی ٧ - ٨ / ١١ / ٩٨٦ دا دانیشتنێکی هاوبەشی بۆ مامجەلال و ئیدریس بارزانی ڕێک خست و، لە ماوەی چەند سەعاتێک دا، ڕێککەوتنێکیان پێ ئیمزا کردن، کە کۆتایی بە یەکێ لە خوێناویترین قۆناغەکانی شەڕی ناوخۆی کوردی - کوردی عیراق هێنا و، بناغەی تەبایی و هاوکاری چەند ساڵەی لە نێوان ئەم دو هێزە دوژمنە دا دامەزراند. ڕێککەوتنی یەکێتی و پارتی، وەکو دو هێزی سەرەکی ناو جولانەوەی کورد، لە چاو ڕێککەوتنەکانی کەدا دو گرنگیی هەبو:

یەکەمیان، لە بەر ئەوەی ئەم ڕێککەوتنە بە ناوبژی و شایەتی کاربەدەستانی ئێران کرا بو، وە لەو کاتەدا هەردولایان هاوپەیمانی ئێران بون، بە ئاسانی نەیانئەتوانی لە ژێر باری جێبەجێ کردنی دەربچن.

دوەمیان، لە بەر ئەوەی شەڕ و ئاشتی لە نێوانی ئەم دو هێزەدا کاری لە لایەنەکانی تریش ئەکرد، ڕێککەوتنی ئەمان کۆتایی بە شەڕی ناوخۆ ئەهێنا.

لقەکانی سلێمانی و هەولێر و کەرکوک و، هێزو بەتالیۆنەکانی پارتی بارەگاکانیان هێنایە ناو کوردستانی عیراقەوە و، یەکێتی یش بۆ یەکەمین جار کۆمیتەی مەڵبەندی ٤ و هێزێکی پێشمەرگەی نارده بادینان.

یەکێ لە هۆ سەرەکیەکانی ناکۆکی و تێکچونی نێوان حیزبەکان هەمیشە مەسەلەی حوکمڕانی و کۆکردنەوەی باج و گومرگ بوە. لە بەر ئەوە لە هەمو ئەو ڕێککەوتنانەدا، ئەو مەسەلەیە لە بەر چاو گیرا بو. هەروەکو لە ماددەی ٥ ی لایەنی عەسکەری پرۆژەی هاوکاری نێوان پ د ک و ی ن ک دا نوسرا بو: «لە مەسەلەی حوکمڕانی ناوچەکان و گومرگ دا تا هەلومەرجێکی لە بارتر نەبێ لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی یەکتردا، واقیعی ئێستە حورمەت بگرن.» واقیعی ئەو کاتە ئەوە بو کە هەمو ناوچەکانی سلێمانی، هەولێر، کەرکوک، گەرمیان لە ژێر دەسەڵاتی یەکێتی دا بو، بەو جۆرەیش مایەوە و هەمو لایەنەکان ڕێزی ئەو واقیعەیان گرت تا کاتی هێرشەکانی ئەنفالی ٩٨٨.

*

*

## ٥ . گەشتی ئەوروپا

مـام جـەلال ڕۆژی ٢٣ ی تشـرینی دوەمی ٩٨٦ لە ئێـران گـەڕایەوە، لەو کاتەدا، شەڕ لە ناوچەی چوارتا گەرم بو. من ماوەیەک بو بە دەس ئازاری پشتـمەوە ئەم نالاند پەرێشـان بوم. مام جەلال داوای لێ کردم کە سەفەر بکەم بۆ دەرەوە. خۆم لەو کـاتەدا سـەفـەرم بە چاک نەئەزانی، بەڵام مـام جـەلال ترسی هەبو بەو نزیکانە ڕێگەمـان لێ بگیـرێ، لە بەر ئەوە پێ ی باش بو بەر لە گـرتنی ڕێگا من بڕۆم. ماوەیەکی درێژ بو کەس لە ئێمە نەیتوانی بو سەفەری دەرەوە بکا-لە گەڵ لێپرسراو و ڕێکخراوەکانی دەرەوە تەنیا بە نامە پەیوەندیان هەبو. بۆ ئاڵوگۆڕی بیروڕا نە کەس لە ئێمـە توانی بوی سەردانی ئەوان بکا و نە کـەس لەوانیش توانی بوی سـەردانی ئێمە بکا. لەم سەفەرەدا ئەبو تەداوی خۆم بکەم، کارە سیـاسیـەکانی یەکـێتی یش ئەنجام بدەم.

پاش هەڵسـەنگاندنی ئەو ڕێککەوتنەی لە گەڵ ئێـران و ئەو ڕێکەوتنەی لە گەڵ پارتی ئیـمزا کرا بون، ئێمە: د. فـوئاد مەعـصوم، د، کـەمـال خۆشناو، مـلازم عـومەر، د. خەسرەو خاڵ، شێرکۆ بێکەس ڕۆژی ٢٧ ی تشـرینی دوەم لە بەرگەڵوەوە بە ڕێگەی شـاخاوی چالاوا، سەفرە، بەرگوردا بە ڕێ کەوتین. ئەبو تا ئەگەینە سنوری ئێـران لە هیـچ لایەک لانەدەین. زیاتر لە ٢٠ سـەعـات بە ڕێگاوە بوین ئینجـا گەیشـتینە زەردەکانی. هەمومان شەکەت بوبوین. لەوێ پشومان دا و بۆ بەیانیەکەی بەرەو سەر جادەی سەردەشت بە ڕێ کەوتین. لە ڕێگە بیسـتمـان وەفدێکی پارتی کە پێک هات بو لە فاضیل مەطنی و فەرەنسوا حەریری چون بۆ سەردانی مام جەلال لە یاخسەمەر. پێشتر بە بروسکە ئاگاداری نوێنەری یەکـێتی مان کرد بو پێویستیەکانی ڕێگەمان بۆ دابین بکا. عەبدوڵلای مام عەلی کارەکانی ئەنجام دابو. ئۆتۆمۆبیل و (برگ تردد) ی واتە پسـوڵەی هاتوچۆی بۆ ئامـادە کـرد بوین. چوینە مـەهاباد و لەوێشـەوە بۆ کرمـاشـان. تازە لە کـرمـاشـان بارەگای یەکـێتی کـرابوەوە. لە کرمـاشـان پشویەکی ترمان دا. ڕۆژی دوایی بەرەو تاران چوین.

لە تاران

یەکێ لە کارەکـانمان بەشداری بو لە (موتمر نصره الشـعب العـراقی). ئێـران

کۆنگرەیەکی فراوانی لە نوێنەرانی هێزە جیا جیاکانی موعارەزەی عیراقی لە ڕۆژانی ٢٤ - ٢٦ / ١٢ / ٨٦ لە تاران ڕێک خــست بو. بۆ نیــشــانداتی بایەخی حکومەتی ئێرانی بەم کۆنگرەیە، سەرکۆمار سەید عەلی خامنەئی، سەرەوەزیران میر حوسەینی موسەوی، وەزیری کاروباری دەرەوە د. عەلی ئەکبەر ولایەتی و چەندین وەکیلی وەزیر و کاربەدەستی تر بەشدار بون و، هەندێ لە کۆمیتەکانی ئەم کۆنگرەیە ئەوان سەرۆکایەتی کۆبونەوەکانیان ئەکرد.

جگە لە وەفدی یەکێتی لە کوردی عیراق وەفدی پارتی و حسک و بزوتنەوەی ئیسلامی و چەندین تاقمی تری دەسکردی ئێران لەوانە: حیزبولڵا و جوندولڵا و ئەنرولڵا... بانگ کرا بون. وەفدی پارتی ئیدریس بارزانی و وەفدی حسک ڕەسوڵ مامەند سەرۆکایەتییان ئەکرد. بۆ یەکەمین جار بو لە مێژوی جولانەوەکەدا نوێنەرانی کورد بە تایبەتی ئەو ٣ حیزبە بە تەبایی و یەککرتویی بەشداری کارەکانی کۆنگرە بین و بۆ هەمو باس و مەسەلەیەک پرس و ڕاوێژ بە یەک بکەن.

کۆنگرەکە زۆرتر بۆ ئەوە بو کە ئێران پیشانی دنیای بدا کارتی موعارەزەی عیراقی لە دەس ئەودایە، موعارەزەی عیراقییش خۆیان بەرنامەیەکی دیار و یەکگرتوی کارکردنیان نەبو، هەر یەکەیان لە ئاوازێکی ئەخوێند و، هەندێکیان هیچ قازانجێکی ڕاستەقینەیان لە ڕوخاندنی ڕژێمی بەعسی عیراقی دا نەبو. من ڕۆژێک پێش تەواو بونی کۆنگرەکە چوم بۆ شام و جەژنەکانی سەری ساڵی ٨٧ لەوێ بوم، بەڵام بە هۆی نەخۆشیەوە هیچ خۆشیەکم لێ نەدی.

لە شام

لە شام چەند کارێکمان پێ سپێردرا بو، ئەبو جێبەجێیان بکەین:

١. لە سەرەتای دەس پێکردنی گفتوگۆی بەعس - یەکێتیەوە، یەکێتی هیچ بنکە و بارەگایەکی لە شام نەمابو، پەیوەندی نێوان سوریا و یەکێتی پچڕا بو. ئەبو لەم سەفەرەدا پەیوەندی ڕەسمیی دابمەزرێنینەوە و سەرلەنوێ بارەگای یەکێتی دابنێینەوە.

٢. هەروەها پەیوەندی لە گەڵ لایەنەکانی موعارەزەی عیراق بە تایبەتی بەعسی عیراقی سەر بە سوریا.

٣. هەروەها دامەزراندنەوەی پەیوەندی لە گەڵ حیزب و ڕێکخراوە کوردیەکانی سوریا.

کارەکانمان بە خێرایی ڕاپەڕاند. سەردانی عبدالله الاحمر، جێگری سکرتێری گشتی حیزبی بەعس مان کرد و پەیوەندی سوریا و یەکێتی گەڕایەوە دۆخی جارانی.

د. خەسرەو خاڵ دانرا بە نوێنەری یەکێتی لە سوریا. هەروەها لە گەڵ نوێنەرانی بەعس، حشع، نوێنەرانی زۆر لە حیزبە کوردیەکان و کەسایەتیە عەرەبیەکانی عیراقی دانیشتین و دۆستایەتیمان نوێ کردەوە.

لە ناوەڕاستی کانونی یەکەمی ۸۷ دا لە گەڵ سامی و لە کۆتایی مانگ دا لە گەڵ حشع ڕێککەوتن ئیمزا کرا.

لە گەڵ ئەنجامدانی کارە سیاسیەکانمان، سەردانی چەند پزیشکێکمان کرد. من چومە لای پزیشکی بڕبڕەی پشت، پاش (اشعە و فحص)، پزیشکەکە پێ ی وتم: «ئەبێ یەک سەعات زوتر پشتت نەشتەرکاری بکەیت چونکە لە دوا قۆناغی خراپی دایە. بە کۆکین، پژمین، کەوتن لەوانەیە (نخاع شوکی) ت بپسێ و توشی (شلل) ببی!»

تا ئەو ساتە بیست بوم مرۆڤ کە بە تەواوی ئەروخێ ئەژنۆی ئەشکێ، لەو کاتەدا هەستم کرد ئەژنۆم شکاوە، چونکە هیچ توانایەکی ڕۆیشتنی تیا نەمابو، لە دڵی خۆم دا وتم: «ئەو هەمو ساڵە بە شاخەوە بوم و ئەو هەمو بەرداوبەردەم کردوە و لەو هەمو مەترسیە بە سەلامەت دەرچوم، ئێستا بەم نەخۆشیە توشی (شلل) ببم و ناچار بم سواری کورسی ویلدار ببم» لە ناخی دڵەوە مردنم بە ئاوات ئەخواست. پزیشکەکە داوای لێ کردم کە بۆ ڕۆژی دوایی لە نەخۆشخانە جێگەم بۆ بگرێ. وتم: «من هەندێ کاری پێویستم هەیە بەو پەلەپەلە ناتوانم بچمە نەخۆشخانە.» مەبەستم ئەوە بو سەری پزیشکێکی تر بدەم بەشکو قسەی ئەم پزیشکە وا دەرنەچێ.

بۆ ڕۆژی دوایی چوینە لای پسپۆڕێکی بە ناوبانگی ئەوێ کە لە زانکۆی دیمەشق کاری ئەکرد هەمان ئامۆژگاری کردم. ڕۆژێکی تر لە گەڵ د. مەحمود عوسمانیش چومە لای پزیشکێکی کە هەمان قسەی کرد. ئیتر بە تەواوی نائومێد بوم و بڕیارم دا بۆ ئەو مەبەستە بچمە ئەوروپا. ئەو کاتە سەفەر بۆ ئێمە بۆ ئەڵەمانیا و ئەمسا ئاسانتر بو لە شوێنەکانی تر. د. کەمال فوئاد هیمەتی کرد لە ماوەیەکی کورت دا ڤیزای ئەڵەمانیای بۆ ناردم.

لە بەرلین

ڕۆژی ۲۱ ی کانونی دوەمی ۹۸۷ لە شامەوە فڕیم بۆ بەرلینی (ڕۆژئاوا). د. کەمال فوئاد و صەلاح ڕەشید وەریان گرتم و لای صەلاح لام دا. لە گەڵ د. کەمال فوئاد چوین بۆ لای پزیشکی پسپۆڕ. دو پزیشکی جیاواز فەحسیان کردم، یەکەمیان کە پرۆفیسۆرێکی بە ڕەچەڵەک ئێرانی بو، هەمان قسەی پزیشکەکانی شامی دوبارە کردەوە و هەمان ڕۆژ بەرەو ڕوی پزیشکێکی پسپۆڕی تری ئەڵەمانی کردمەوە.

پزیشکەکە کە سەیری ئەشیعەکانی کردم و سەیرێکی منی کرد بە پێوە ڕاوەستا بوم، وتی: «بە پێ ی ئەم ئەشیعانە ئەبوایە تۆ ئێستە بە عەرەبانە بهاتیتایە. بۆچی زوتر سەردانی پزیشکت نەکردوە؟»

منیش وتم: «لە شوێنێک ئەژیم نەخۆشخانەی وای لێ نیە و، تا گەیشتومەتە سەر جادەی ئۆتۆمۆبیل ۲۰ سەعات بە پێ ی خۆم ڕۆیشتوم.»

بە سەرسوڕمانێکی زۆرەوە پرسی: «ئێوە چ قەومێکن؟»

وتمان: «کورد!»

ئینجا هەندێ ڕونکردنەوەمان دایە. حەوالەی نەخۆشخانەی کردم و بۆ ڕۆژی دوایی ئەشتەرکاری پشتیان کردم و ۱۰ ڕۆژ لە نەخۆشخانە مامەوە. دوای ئەوەش ماوەیەک لە جێگادا کەوتم.

هاوڕێ و ناسیاوەکانم لە بەرلین: د. کەمال فوئاد، د. حەسەنی حەمە عەلی، د. جەباری عەلی شەریف، صەلاح ڕەشید بەوپەڕی پەرۆش و دڵسۆزییەوە یارمەتییان دام، تەنانەت د. جەبار ئیزنی وەرگرت لە نەخۆشخانەکە و لە گەڵ تیمی عملیات هاتە ژوری عملیاتەوە.

هاوڕێکانی تریشم لە سوید: مەحمودی مەلا عیزەت، د. محەمەد صابیر، عومەری سەید عەلی. لە هۆڵەندا: شازاد صائیب، ئیبراهیم ئەحمەد، لە فەرەنسا: ئەحمەد بامەڕنی، لە نەمسا: سەعدی ئەحمەد بۆ دڵنەوایی و یارمەتیدانم هاتن بۆ لام و، هەریەکەیان ماوەی پێویست بە دیارمەوە مانەوە. هەرگیز چاکەیانم لە بیر ناچێتەوە. پاش ماوەیەک هەڵسامەوە و کەوتمەوە گەڕان و سوڕان.

لە پاریس

پارتی سۆسیالیستی فەرەنسی لە ڕۆژانی ۳ - ٥ / ٤ / ۸۷ لە شاری (لیل) کۆنفرەنسی ئەبەست. یەکێتی ش بۆ ئەو کۆنفرەنسە بانگ کرا بو. بۆ ئەو مەبەستە چوم بۆ پاریس و لە گەڵ ئەحمەد بامەڕنی چوین بۆ لیل. پارتی سۆسیالیست لە ناو ڕێکخراوە کوردیەکان دا حدکایان بانگ کرد بو. د. قاسملو بەشدار بو. وەفدێکی حیزبی بەعسی عیراقیشیان بانگ کرد بو. بەعسیەکان ئیعتیرازیان گرت بو لە سەر ئامادەبونی ئێمە کاربەدەستانی پارتی سۆسیالیست گوێیان نەدایە ئیعتیرازەکەیان. هەلێکی باش بو بۆ بینینی زۆر لە نوێنەرانی پارتیە سۆسیالیستەکانی ئەوروپا، کە ئەو کاتە هەندێکیان لە سەر حوکم بون.

یەکێ لەو شتانەی لە لیل بە سەرسوڕمانەوە بینیم شەمەندەفەرێکی هاتوچۆ بو کە بە ئینفۆرماتیک ڕێکخرا بو، بە بێ سایەق و بە بێ جابی کاری ئەکرد، لە

ئەوانەم دا بۆ کوردستان بۆ چەند کەسێکم باس کرد وابزانم کەسیان باوەڕیان پێ نەکردم، لە بەر ئەوە منیش لێ ی بێدەنگ بوم.

لەم سەفەرەی پاریس دا دو گفتوگۆم کرد: یەکێکیان لە گەڵ ڕاوێژکارێکی سیاسی سەرۆک میتران کە بۆ من زۆر بە سود بو، ئەوی تریان لە گەڵ نوسەرێکی ڕۆژنامەی لۆمۆندی فەرەنسی کە ئاژاوەیەکی زۆری دروست کرد،

دەرسێک لە دەوڵەتداری

لەو ماوەیەدا بە دوقۆڵی لە گەڵ ئەحمەد بامەڕنی ڕاوێژکارێکی سیاسی سەرۆک میترانمان بینی. من قەوانەکەی خۆمم بۆ لێ دا کە لێ بومەوە، ئەو وتی: "من خۆم بە ڕێچەڵەک باسکم لە بەر ئەوە لە گیروگرفتی نەتەوەیی تێ ئەگەم و بە هاودەردیەوە سەیری مەسەلەکەی ئێوە ئەکەم، بەڵام ئێمە و ئێوە ئامانجمان جیاوازە. ئێوە ئەتانەوێ عیراق بڕوخێنن چونکە ئەتان چەوسێنێتەوە، ئێمەش ئەمانەوێ عیراق بمێنێ و پایەدار بێ چونکە یەکەمین سەنگەر و دوایین سەنگەرە لە بەرامبەر لێشاوی شۆڕشی ئیسلامی دا. ئەگەر عیراق بکەوێ بە دوای ئەودا سوریا و سەروی ئەفەریقاش ئەکەوێ. کێشەیەکی گەورە بۆ ئەوروپا دروست ئەبێ وەکو کێشەی سەردەمی عوسمانی کە چەند سەدە ئەوروپای خەریک کرد بوا" بێگومان ئەمە دەرسێکە لە جۆری پاراستنی قازانجی نەتەوەیی و دەوڵەتداری دا.

خەونی چۆلەکە!

لە گەڵ نوسەرێکی (لۆمۆند) دانیشتم بە درێژی باسی هەلومەرجی کوردستانم بۆ کرد. هۆی سەرنەگرتنی گفتوگۆی بەعس - یەکێتی و، هۆی هاوکاری ئێران - یەکێتیم، لە باری سەربجی یەکێتیەوە، بۆ ڕون کردەوە و، باسی ئەگەرەکانی جەنگی عیراق - ئێران و پاشەڕۆژی عیراقمان کرد و، یەکێ لەو ئەگەرانە دابەش بونی عیراق بو بۆ ٣ دەوڵەتی شیعە، سونە و کورد. لێ ی پرسیم: «تۆ خۆت ڕەئیت لە سەری چیە؟» من وتم: «لە ناخی دڵەوە ئەوە بە ئاوات ئەخوازم عیراق لەت و پەت بێ!»

کابرای ڕۆژنامەوان هەمو گفتوگۆکەی بڵاو نەکرد بووەوە، تەنیا ئەوانەی لێ هەڵبژارد بو کە خۆی بە لایەوە گرنگ بون، کە یەکێکیان ئەو تەمەنایەی من بو. ئەمە گەردەلولێکی سیاسی لە ئێران و سوریا و تورکیا خولقاند، وایان ئەزانی (مونامەرەیەکی غەربی) لە گۆڕێیە بۆ دروستکردنی دەوڵەتێکی کوردی.

- ئێران ناڕەزاییان دەربڕی و داوای ڕونکردنەوەیان لە سەرکردایەتی یەکێتی کرد بو کە ئەو قسەیە ڕەئی یەکێتیە یان ڕەئی تایبەتی خۆمە، ئەگەر ئەمە ڕەئی

یەکێتی بێ ئەوا ئەوان پەیوەندی خۆیان لە گەڵ یەکێتی ئەبڕن. هەر لە بەر ئەم هۆیە کاتێ ویستم بگەڕێمەوە بۆ کوردستان تا چەند مانگ ڤیزایان پێ نەدام.

- ڕۆژنامەی (السفیر) ی بەیروتی لە ژمارەی ١٦ / ٤ / ٨٧ دا کە ئەم هەواڵەی لە (لۆمۆند) ەوە وەرگرت بو، سوریەکانی تورە کرد بو. د. خەسرەویان سەغڵەت کرد بو بە ناچاری لە ١٨ / ٤ / ٨٧ دا ڕونکردنەوەیەکی بە ناوی نوسینگەکەی شامەوە بڵاو کرد بوەوە ڕۆژنامەی لۆمۆندی بە درۆ خست بوەوە.

لە ڕاستی دا من ئەم ڕونکردنەوەیەم پێ ناخۆش بو. بێ ئاگاداری منیش بڵاوی کرد بوەوە. کە پێشم زانی بە تەلەفۆن نارەزایی توندی خۆمم پێ ڕاگەیاند، چونکە ئێستاش وەکو ئەوسا لە ناخی دڵەوە لەتویەت بونی ئەو عیراقەی، حەفتا ساڵە کوردی تێ دا ئەکوژرێ، بە ئاوات ئەخوازم.

- تورکیاش لە ڕۆژنامەکانیان دا هەندێ لە قسەکانی منیان وەرگرت بو بە لێدوانەوە بڵاویان کرد بوەوە. تەنانەت هەر لەو ماوەیەدا هەواڵنێرێکی ئاژانسی ئەنەدۆڵ و ڕۆژنامەوانێکی صەباح بۆ گفتوگۆ هاتن بۆ لام.

جگە لەمان، لە ناو کۆڕە شۆڕشێنیەکانی عەرەبیش دا کەوتنە هێرش بۆ سەر من و بیروبۆچونەکانم. کابرایەکی فەلەستینی وتارێکی ناشیرینی دژی من نوسی بو و، هەروەها ڕۆژنامەی (السفیر) بەیروتییش لە ژێر سەرناوی (امبراطوریە الحجل الکردیە) دا وتارێکی درێژی بە قەڵەمی یەکێ لە سەرکردەکانی بەعسی سوریا کە ئەویش هەر (عبدالله الاحمر) ی ناو بو نوسی بۆ. ئەگەرچی ناوی منی نەهێنا بو بەڵام مەبەستی لە من بو. لە مانەش خراپتر بڵاوکراوەی (الغد الدیمقراطی) کە زمانی (الاتحاد الدیمقراطی العراقی) و، ئەمیش ڕێکخراوێکی کارتۆنیی حشع بو بە سەرۆکایەتی صالح دگلە و، بڵاوکراوەی (التیار الجدید) کە لە لەندەن دەرئەچو و، زمانی (حزب الإمە الجدید) بو بە سەرۆکایەتی سعد صالح جبر، هێرشی توندیان هێنا بومە سەر، هەندێکیشیان جنێوی سوکیان پێ دابوم. ڕۆژنامەکەی دوگلە قسەکانی منی سەبارەت بە مافی کورد لە سەربەخۆیی دا بە خەونی چۆلەکە (حلم العصافیر) دانا بو.

یەکێتی لەو کاتەدا تازە ڕێککەوتنی ئاشتبونەوەی لە گەڵ حشع ئیمزا کرد بو. لە سەر ئەو هێرشە یەکێتی هاوکاری لە گەڵ حشع ڕاگرت. مام جەلال لەم هەڵویستەی حشع کە ئەویش وەکو هەڵویستی شۆڕشێنیەکانی عەرەب بو زۆر تورە بو. بۆ داکۆکی کردن لە من و، بۆ بەرپەرچدانەوەی بیانوەکانی ئەوان و بۆ سەلماندنی ڕەوایەتی مافی کورد لە ئازادی بڕیاردانی چارەنوسی خۆی و، دامەزراندنی دەوڵەتی

ـمی دا، کتێبێکی گەورەی نوسی لە ژێر سەرناوی: «اغد دیمقراطی...»
تەنانەت منذر الموصلی، کە نوسەرێکی بەعسی سوریایە و، کتێبێکی لە سەر کورد و کتێبێکی تری لە سەر جەنگی عیراق - ئێران نوسیوە. موصلی خۆی بە شارەزای کاروباری کورد و، لە هەمان کات دا بە دۆستی کورد دائەنێ، لە (ل٢٠٢) ی دواکتێبی دا: «الحیاه السیاسیه والحزبیه فی کردستان: رویه عربیه للقضیه الکردیه، منشورات ریاض الریس، لندن - قبرص، ١٩٩١» لەم بارەیەوە وەهای نوسیوە:

«وما القول اذن فی الطرح الخائن الهجین ضد الامه العربیه، الذی ادلی به امین نوشروان، عندما دعا فی نیسان ١٩٨٧، الی تقسیم العراق دویلات عده، شیعیه وسنیه وعربیه وکردیه کسبیل ثانی له فی بلوغ الاستقلال لشعبه وبلاده؟
فقد رای نوشروان، فی حدیثه لصحیفه لوموند الفرنسیه، ان التقارب بین حرکته (الاتحاد الوطنی الکردستانی) وبین طهران ناجم عن ان الطرفین (عدوا مشترکا هو نظام الحکم البعثی فی بغداد) الذی نامل جمیعا فی زواله.
اننا عندما نعرف بان هذا الکردی "الحصیف"، المخلص لشعبه، هو نائب امین عام الاتحاد الوطنی الکردستانی (جلال طالبانی)، تصبح الامور واضحه، وهی ان الاخ جلال اختبا وراء نائبه هذه المره.»

عەلی حەسەن مەجید

لە کۆتایی مانگی مارتی ٩٨٧ دا، بە فەرمانی صەددام حسێن، عەلی حەسەن مەجیدی ئامۆزای، لە جێگەی محەمەد حەمزە زوبەیدی، کرا بە (مسوول مکتب تنظیم الشمال) و، هەموو دەسەڵاتەکانی (مجلس قیادە الثورە) ی بۆ سەرکردایەتی دەزگاکانی حیزب و جەیش و ئەمن و ئیستیخبارات و موخابەرات و دائیرەکانی تری حکومەت درایە، بۆ ئەوەی ئازادی و دەسەڵات و توانای لە ناوبردنی جوڵانەوەکەی هەبێ. ئەویش بەوپەڕی دڕندایەتیەوە کەوتە جێبەجێ کردنی ئەرکەکەی و، ڕەنگە لە مێژوی ئەم چەرخەدا هیچ کاربەدەستێکی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بە ئەندازەی ئەم کابرایە دڕندایەتی نەنواند بێ و، تاوانی ئەنجام نەدا بێ. بە دانانی ئەم قۆناغێکی نوێ لە جوڵانەوەی کوردا دەستی پێ کرد، کە قۆناغی (جێنۆسایدـ) ە.

داستانی ڕزگاری: یان (الحرب خدعه)

هێزەکانی یەکێتی شەوی ١٣ - ١٤ / ٤ / ٨٧ چالاکیەکی پێشمەرگەیی گەورەیان لە ناوچەی چوارتا ئەنجام دا، لەم کارەدا ئەو شوێنانەی جەیشی عیراقی بە ١٠٢ ڕۆژ گرت بوی لە هەڵمەتێکی کتوپڕدا کە ٥ هەزار پێشمەرگە تیا بەشدار بون،

١١٢ ڕەبینە و ٤ مەقەڕی سریە و ٤ مەقەڕی فەوجیان گرت، کە ١٨٦ کەسی بە زیندویەتی تێ دا بە دیل گیرا. هاوزەمان لە گەڵ ئەم هەڵمەتەی یەکێتی دا ئەبو هێزەکانی ئێران پەلاماری ناوچەی ماوەت بدەن و بیگرن، بۆ ئەوەی ڕێگەی پێوەندی نێوان یەکێتی ئێران بکرێتەوە. ئێران کارەکەی خۆیان نەکرد و، لە لای خۆیانەوە ئەو بەشەی نەخشەکەیان ئەنجام نەدا. هێزەکانی یەکێتی بە تەنیا لە مەیدانی شەڕەکەدا مانەوە.

جەیشی عیراق لە تۆڵەی ئەم هێرشەدا، سەرەتا ڕۆژی١٥ / ٤ / ٨٧ بە خەستی کەوتە کیمیابارانی هەمو ناواییەکانی: بەرگەڵو، هەڵەدن، ئاوەژێ، کانی تو، چنارێ، نۆڵچکە... و، سەنگەرەکانی پێشمەرگە لە شاخەکانی: خەجە لەرزۆک، کوێرەنگ، دوبرا، قەیوان، شاخەسور، قوڵەپوشین... بۆ ئەوەیش کە پشێوی بخاتە ڕیزەکانی پێشمەرگەوە ڕۆژی ١٦ / ٤ / ٨٧ بە فڕۆکە بۆردومانی کیمیایی ئاواییەکانی: توقە، کانی بەرد، بالیسان، زینێ، بلالوکاوا، بێراوا، شێخ وەسان لە خۆشناوەتی و، سەنگەرەکانی پێشمەرگەی لە شاخەکانی ئاراسن، دەرەشیر، ساو سێوەک... کرد. بەشێ لەو پێشمەرگانەی لە داستانی ڕزگاری دا بەشدار بون، خێزان و ماڵەکانیان لەم ناوچەیەدا بو. بەم بۆردومانە هەم تۆڵەی بەشداری ئەو شەڕەی لێ ئەکردنەوە و هەم ناچاری ئەکردن بۆ سەردانی کەسوکاریان بگەڕێنەوە ناوچەکانی خۆیان. دوای بارانی کیمیایی ناوچەکە، جەیشی عیراق هێرشی بۆ شوێنە گیراوەکان کرد و گرتیەوە.

نوێنەرێکی ئێرانیەکان کە ئەوسا لە کوردستان بو، گلەیی زۆری دێتە سەر و تەنگاوی ئەکەن، ئەویش بە بێتەل گلەییەکانی بە فەرماندەکەی خۆی گەیاند بو. کابرای فەرماندە، کە سەردەمێک بو بە فەرماندەی هێزی زەمینیی و سەردەمێک بو بە فەرماندەی هێزێ دەریایی و سەردەمێک بە وەزیری جەنگ، لە وەڵام دا وت بوی: «الحرب خدعە!» دیارە لە بەدیهێنانی مەبەستی دەوڵەتان دا، هەر دەوڵەتێ بێ، گرنگ نیە کێ ئەکوژرێ و کام گەل ئەبێ بە قوربانی.

مام جەلال بەم بۆنەیەوە بانگەوازێکی بۆ نەتەوەی کورد دەرکرد و، سەرنجی ڕاکێشان بۆ مەترسی چارەنوسسازێ ئەم گۆڕانە لە شەڕی کورد و بەعس دا و، لە بانگەکەی دا نوسی بوی لە ئەنجامێ ئەو هێرشانەدا ١٣٠ کەس کوژراو و ٥٠ پێشمەرگە و ٤ سەد هاوڵاتی بریندار بون. بڵاوکراوەیەکی کوردی ئەوسا لە سوید دەرئەچو، بە گاڵتە پێ کردنەوە باسی هەواڵی ئەم بانگەوازەی نوسی بو.

منیش کە لەو کاتەدا هێشتا لە بەرلین بوم، بە ناوی یەکێتیەوە یادداشتێکم

نوسی و، دام به د. بەرهەم صالح تا بیکا بە ئینگلیزی و بینێرین بۆ سەرۆکی ئەمەریکی، ڕۆناڵد ڕێگان. سەرۆکی سۆڤیێتی، میخائیل گۆرباچۆف. سەروەزیرانی بریتانی، مارگریت تاچەر و، سەرۆکەکانی تری دەوڵەتە گەورەکان.

لەوە بە دواوە بۆردومانی کیمیایی سەرانسەری کوردستانی عیراق، بە تۆپ و بە فڕۆکە لە لایەن جەیشی عیراقیەوە، بە هەمو جۆرەکانی گازی ژەهراوی خەردەل، سارین، تابون.. بو بو بە ڕوداوێکی ئاسایی ڕۆژانە دژی دانیشتوانی بێوەیی ئاواییەکان و، دژی پێشمەرگەی شەڕکەر بە بێ جیاوازی.

یەککرتنەوە

وردە وردە تەندروستیم ئەگەڕایەوە دۆخی جارانی. مانگی مایسی ٨٧ شوعلە و هەر ٣ منالەکانم: نما، چیا، چرا، هاتن بۆ بەرلین بۆ لام. چیا و چرا هێشتا کۆرپەی ساوا بون. دیواری بەرلین هێشتا نەڕوخا بو. ئێمە لە بەرلینی خۆر ئاوا بوین. بەرلین (ورچێکی ڕەش) ی کردوە بە ڕەمزی خۆی. ئەم یەککرتنەوەیەمان هەلێکی باش بو پێکەوە زۆر شوێنی مێژویی و مۆزەخانە و بازاڕ گەڕاین. بە تایبەتی کە ئەو ساڵە ڕێکەوتی تێپەڕبونی ٧٥٠ ساڵی ئەکرد بە سەر دامەزراندنی بەرلین دا. شای بریتانیا و زۆر لە سەرۆکەکانی ولاتان بەم بۆنەیەوە هاتن بۆ بەرلین. ماوەی ٣ مانگ مانەوە و لە حوزەیران دا گەڕانەوە بۆ کوردستان.

لە لەندەن

مانگی تەمموز سەردانێکی لەندەنم کرد. ئەوە یەکەمین جارم بو ئەو ولاتە ببینم. لە گەڵ ئەو کوردانەی لەوێ ئەژیان، بە تایبەتی ئەندامەکانی یەکێتی، کۆبومەوە. ئەوسا کورد بە ژمارە کەم بو. چەند ڕۆژنامەنوسێکم بینی لەوانە گوین ڕۆبێرتس کە ئاگاداری لە سەر دامەزراوە کیمیاییەکانی عیراق کۆ ئەکردەوە و، بەرنامەیەکی گرنگی لە سەر چەکی کیمیایی عیراق بۆ پانۆرامای بی بی سی ئامادە کرد و چەند ئەندامی پارلەمانم بینی و لە سەر کیمیابارانی کوردستان قسەم بۆ کردن. هەژیری تەیوریان گفتوگۆیەکی بۆ بەشی فارسی بی بی سی لە گەڵ کردم. لەو کاتەدا جولانەوەی کورد لە عیراق دا، بە هەمو باڵەکانیەوە، بە هاوپەیمانی ئێرانی ئیسلامی و، ئێرانیش بە مەترسیەکی گەورە لە سەر دنیا دائەنرا. بۆ ئەوەی عیراق لە بەر دەم ئێران دا نەشکێ، پشتیوانی لێ ئەکرا و، چاو لە تاوانەکانی ئەپۆشرا.

لوارکن وفیق السامرائی لە (ل ١١٣ و ١٢٧ - ١٢٩ و ١٩٩) ی کتێبەکەی دا: «حطام البوابە الشرقیە» باسی هاوکاری سیا و ئیستیخباراتی عیراقی ئەکا و، ئەو کە خۆی بەرپرسی پێوەندی بوە لە گەڵیان ئەڵێ لە کۆتایی

مارتی ۹۸۲ ەوە تا ۹۹۰ کە صەددام دەری کردون بە دائیمی تیمێکی سیا بۆ هاوکاری لە بەغداد بون و، لە (ل۱۲۹) دا شایەتی ئەدا و ئەڵێ: «...ولا اعتقد انهم خدموا دوله بالمعلومات كما خدمونا وحتى بالمقارنه مع ما قدموه لاسرائيل»

ئەمەریکا، بریتانیا، فەرەنسا، یەکێتی سۆڤیێتی جاران و، زۆر لە وڵاتانی تری عەرەبی و ناعەرەبی کەم و زۆر ئاگاداری تاوانەکانی بەعس بون، بەڵام بۆ شکاندنی ئێران لە لایەک و، لەبەر بازرگانیی جەنگیی لە گەڵ عیراق چاوپۆشییان لێ ئەکرد.

لە لەندەن بوم کە بیستم عەبدولی شێخ سالحی قەرەداخی لە ئۆتۆمۆبیل وەرگەڕاوە و کۆچی دوایی کردوە. شێخ عەول هاوڕێ ی کەرەکە و قوتابخانە و کاری سیاسی م بو. بە مردنی زۆر دڵتەنگ بوم بە تایبەتی کە ئەو یەکێ لە بەرپرسەکانی پێشمەرگەی ناوشار بو. ئەوساکە من نەمزانی بەڵام کە گەڕامەوە بەرلین ئینجا زانیم: دەزگا ئەمنییەکان لە سلێمانی کەوت بونە گەڕانی مالان بە دوی شوعلەدا بیگرن. شێخ عەول و ڕەزاقی عارف و مامۆستا ئەحمەد عوسمان (دواییتر شەهید بو) بە دو ئۆتۆمۆبیل شوعلەیان لە سلێمانی گوێزابوەوە خری زێویە بۆ ئەوەی بگەڕێتەوە ماڵەکەی خۆمان لە بەرگەڵو، بەڵام لە ڕێگە ئەو ئۆتۆمۆبیلەی ڕەزاق لێ ی خوڕی بو، کە ئەحمەد لە پێشەکەی دا و، شێخ عەول و شوعلە و نما لە پشتەکەی دا بون، وەرگەڕاوە و دەسبەجێ شێخ عەول گیانی سپارد بو، شوعلە و ڕەزاقیش نیوە مردو بوبون، ئەحمەدیش پەراسوی شکا بو. ئەو سەییارەیەی کە بۆ ئاگاداری بە دوایانەوە ئەبێ فریایان ئەکەوێ و، لە مردن ڕزگاریان ئەکا. شوعلەیان بە یارمەتی یەکێ لە پزیشکە ناسراوەکان بە نهێنی برد بوە ئەخۆشخانەی سلێمانی و، هەمان شەو زنجیرەیەک (عەمەلیاتی گەورە) یان بۆ کرد بو، بەوە لە مردن ڕزگار بو، بەڵام ئەم ڕوداوە ئیتر بۆ تا هەتا کەنەفت و لەش بە باری کرد.

لە لەندەنەوە گەڕامەوە بەرلین و لە بەرلینەوە بۆ فرانکفۆرت بەرەو تاران. لەوێوە بێ ڕاوەستان چومە سەقز. ئەوسا بارەگای سەرەکی یەکێتی برا بوە سەقز و، د. کەمال خۆشناو لێپرسراوی بو. لە سەقز هەندێ لە کاربەدەستانی قەرارگای ڕەمەزانم بینی. ڕۆژی دوایی خۆمم ئامادە کرد بۆ گەڕانەوە. شەوکەتی حاجی موشیر لەو کاتەدا لە سەقز بو، مەفرەزەیەکی شارەزای ئامادە کرد کە حەمەی حەمە سەعیدی هەورامی فەرماندەیان بو، بۆ ئەوەی لە گەڵ من بن تا ئەگەمە بارەگای مەڵبەندی یەک لە قۆپی قەرەداخ. بە ئۆتۆمۆبیل لە سەقزەوە چوین بۆ دزلی. لەوێ مەفرەزەکەی پێشمەرگە ئامادە بو. بە پێ بە ڕێ کەوتین بەرەو دیوی عیراق.

## ٦ . ئەنفال: کۆتایی قۆناغێک

گەڕانەوە بۆ بەرگەڵو

بە شەو لە شاخی سورێنەوە دابەزین بەرەو سەرگەت. بە ناو مەیدانێکی مین دا تێپەڕین کە جەیشی عیراق چاند بوی و، پێشمەرگەیش باریکەڕێگەیەکیان لێ پاک کرد بوەوە. ڕێگەکە بۆ ئەوەی جەیشی عیراق هەستی پێ نەکا و دیسان مینڕێژی بکاتەوە ئەوەندە باریک بو، ئەگەر پێ ی یەکێ ساتمەی بکردایە مین لە هەر چوار دەوری کاروانەکە ئەتەقییەوە پێیان دا. بە سەلامەتی تێپەڕین. لە دەشتاییەکەی بناری شاخەکەدا، ڕەبیەکانی عیراق هەستیان پێ کردین، گوللە هاوەنێکیان پێوە نایین، ئەگەرچی لە ناوی داین، بەڵام کەسمانی نەپێکا. گەیشتینە سەرگەت لەوێ شەوکەت گەڕایەوە دیوی ئێران، ئێمەیش درێژەمان دا بە ڕێپێوان تا چوینە ئاوایی حەمەی کەرەم.

لە ڕۆژانی ١٢ - ١٣ / ٥ / ٨٧ دا لە سەید سادق، خورماڵ، سیروان، هەڵەبجە، دانیشتوانی ناوچەکە ڕاپەڕی بون و هەڵگەڕانەوەیەکی گەورەیش لە ناو ڕیزەکانی جاشەکان دا بوبو، دەسەڵات لە دەس کاربەدەستانی بەعس دەرچوبو، بەڵام زۆر زو دەستیان گرتبوەوە بە سەر ناوچەکەدا. چەند سەد کەسێ لە چەکدار کوردەکانی ڕژیم و، چەند هەزار کەسێ لە دانیشتوانی ناوچەکە هەڵات بون بۆ ئێران.

بە دوای ئەو ڕوداوانەدا ناوچەکە چۆڵ کرا بو، دێهاتەکانیان هەمو ڕوخاند بو. هیچ نوایەکی بە پێوە نەمابو. سەیر ئەوە بو هێشتا سەگەڵ و پشیلەکانی ئاواییەکان، هەر لە ناو کەلاوەکان دا ما بون. ئێمە لە سەر حەوزی مزگەوتە ڕوخاوەکە بۆ حەسانەوە و نانخواردن دانیشتین، چەند سەگ و پشیلەمان لێ کۆ بونەوە. چەندی دەرمان ئەکردن لێمان دور نەئەکەوتنەوە.

بەرەو چەمی زەڵم بە ڕێ کەوتین یەکێ لە سەگەکان دوامان کەوت بو بە هیچ جۆرێ لە کۆڵمان نەبوەوە تا گەیشتینە یەکەم ئاوایی. شەو لە چەمی زەڵم دا ماینەوە مێشولەی شارەزور تێمان وروکا بو، ژیانی لێ تاڵ کردین. دەمەو بەیانی بە لای تەپی سەفادا چوینە نزیک ناوگردان. لە ناو دار و دەوەنی ئەو ناوەدا خۆمان مات کرد تائێوارە. بە شەو چوینە ناو مالوان، کە هێشتا ئاوەدان بو، تراکتۆرێکمان لێ

وەرگرتن گەیاندنیە نزیک جادەی زەڕایەن ـ دەربەندیخان. بە پێ لە جادە پەڕینەوە بەری قەرەداغ و، ئیتر گەیشتبوینە شوێنی ئەمین. ئاگاداری بەرپرسەکانی مەڵبەندمان کرد. شێخ جەعفەری قەرەداخی کە ئەوسا لێپرسراوی کاروباری پێشمەرگەی مەڵبەندی یەک بو، خۆی و چەند ئۆتۆمۆبیلێک گەیشتن. تا ئەو کاتە هەندێ لە پێشمەرگەکانی مەفرەزەکە منیان نەئەناسی، وایان زانی بو میوانێکی لاپرەسەنی ئێرانیم، هەندێکیان لە ڕێگە بە گلەییەوە بە حەمەی حەمە سەعیدیان وت بو، ئەم کابرا تەمەڵە کێیە توشی ئێمەت کردوە، بەلایەکمان بە سەر نەهێنێ با ئیزنی بدەین!

ئەو ڕۆژە حەسراینەوە. مەفرەزەکەم ئیزن دا و، خۆم لە گەڵ بەرپرسەکانی مەڵبەند چوم بۆ قۆپی قەرەداغ. لەوێ لە گەڵ ئەندامانی مەڵبەند، سەرتیپەکان، بەرپرسی کەرتەکانی ڕێکخستنی کۆمەڵە و لیژنەی ناوچەکانی شۆڕشگێران.. کۆبومەوە. باسی هەلومەرجی سیاسی جوڵانەوەی کوردم لە دەرەوە بۆ کردن. گفتوگۆی زۆرمان کرد و پرسیاری زۆریان لێ کردم. لەم کۆبونەوەیەدا دەربارەی ڕوخانی ڕژێمی عیراق و جەنگی عیراق و ئێران، بە ڕاشکاوی بیروڕای خۆمم بۆ ڕون کردنەوە کە ڕژێمی عیراق ناڕوخێ و شەڕی عیراق ئێرانیش ناوەستێ.

لە قۆپی چەند ڕۆژێ مامەوە. بە ئۆتۆمۆبیل لە گەڵ شێخ جەعفەر و مەحمود سەنگاوی و وەهاب چوینە دێ ی ژاڵە و، لە دەربەندی باسەرە ڕاوەماسیەکی کەم دەسکەوتمان کرد و، هەر بە سەیارە چوینە سەر جادەی چەمچەماڵ ـ سلێمانی و بە تاریکیی پەڕینەوە بۆ سەر زێ. لای حەسۆی قادر داود بوین بە میوان. حەسۆ پێشمەرگەیەکی باش و ئازا بو، سەردەمێک فەرماندەی تیپی ٢٥ ی خاڵخالان بو، وازی لە پێشمەرگایەتی هێنا بو، خەریکی کشتوکاڵ بو، لە ئەنفال دا گیرا و بێ سەروشوێن ڕۆیشت. هەمان شەو چوینە گەڕاو و بۆ ئێوارەی ڕۆژی دوایی وەهاب پەڕینەوەی لە جادەی دوکان سلێمانی بە سەیارە ڕێکخست بو. گەیشتینە خری زێویە و مێرگەپان و بە دابان دا گەیشتمەوە سەرگەڵو و، بە پێ شۆڕ بومەوە بۆ بەرگەڵو کە ماڵ و بارەگاکەمی لێ بو.

بە خێرهێنانەوەی بەعسییانە

ئازاد هەورامی کە لێپرسراوی مەڵبەندی بادینان بو، داوای لە بێتەلەکەی من کرد بو کاتێک دیاری بکا بە بێتەل قسەی لە گەڵ بکەم. پێش نیوەڕۆی ڕۆژی ٣ ی ئەیلولی ٨٧ قسەم لە گەڵ کرد. تا ئەو کاتە عیراق نەیزانی بو گەیشتومەتەوە بەرگەڵو، کە دڵنیا بو، لە عەسرەکەی دا تۆپبارانی کیمیاییان کردین. لە ماوەی ٤٥

دەقیقەدا ۷۵۰ بۆمبای ۵۰ کیلۆییان تێ گرتین.

مەحمود سێدەری، کە یەکێ بو لە فەرماندەی کەرتەکانی تیپی ئاسۆس، لە گەڵ کوڕێکی هەرزەکاری، کە ئەویش لە گەڵ خۆی پێشمەرگە بو، هات بون بۆ بەخێرهێنانەوەی من. پاش تاوێ هەستا و خواحافیزی لە من کرد، بگەڕێتەوە بەری مەرگە. لە چونە دەرەوەدا توشی شێخ محەممەد بوبو. شێخ محەممەد پورزای حەمە تۆفیق بو. داوای لێ ئەکا لە گەڵی بچێ بۆ لای حەمە تۆفیق بۆ ئەوەی نامەیەکی بۆ نیشێ بۆ بنوسێ. شێخ محەممەد لە گەڵی ئەچێ. حەمە تۆفیق لەو کاتەدا میوانێکی لە لا ئەبێ. میوانەکە نقیبی شرطە ئەمیری کەریم چاوشین بو. شێخ محەممەد و مەحمود سێدەری و کوڕەکەی ئەچن بۆ لای حەمە و، حەمە بە خێرهاتنیان ئەکا. مەحمود سێدەری کارەکەی بۆ حەمە باس ئەکا و داوای لێ ئەکا نامەیەکی بۆ بنوسێ. حەمەیش بۆ قەڵەم و کاغەز هات بۆ ئۆفیسەکەی من کە بە تەنیشتماڵەکەی ئەوەوە بو. لەو کاتەدا تۆپبارانی کیمیایی دەستی پێ کرد. یەکەمین گوللە لەو ژورەی دا کە میوانەکانی حەمە تۆفیقی لێ دانیشت بو. هەر لەوێ دا نەقیب ئەمیر و مەحمود سێدەری و کوڕەکەی کوژران، شێخ محەممەدیش بە سەختی بریندار بو، پاش یەکدو ڕۆژ بە ئازارێکی زۆرەوە مرد. حەمە تۆفیقیش ڕێکەوت ڕزگاری کرد.

ئەم تۆپبارانە، هەوای بەرگەڵوی وەها بۆگەن و ژەهراوی کرد بو، بە ناچاری هەمو بارەگاکانیان تا چەند ڕۆژێ چۆڵ کرد و، زۆری جلوبەرگ و کەلوپەل و خواردن کە لە بارەگاکانی ئەوێ دا بون، لە بەر ئەوەی ژەهراوی بوبون فڕێ دران.

هێرشەکانی جەیشی عیراق بۆ سەر شاخەکانی چوارتا تا ئەهات بەهێزتر ئەبو. تۆپبارانی کیمیایی ناوچەکە بوبو بە ڕوداوێکی ئاسایی ڕۆژانە. فڕۆکەی جەنگی دەستی لە دێهاتەکانی ناوچەکە نەئەپاراست. پێشمەرگە بەرگرییەکی ئازایانەیان ئەکرد، هێزەکانی عیراق، ئەگەرچی زۆر بە خاوی پێشڕەوییان ئەکرد، بەڵام هەر لە پێشکەتن دا بون.

سەفەری مام جەلال

ئێران مام جەلالی دەعوەت کرد بۆ دیتنی (سەرانی قەوم) لە تاران. لە حەفتەی یەکەمی تشرینی دوەمی ۸۷ دا چو بۆ تاران. گرنگترین ئامانجی ئەم سەفەرە گفتوگۆ بو لە گەڵ کاربەدەستانی ئێران دەربارەی ئیمزا کردنی پەیانێکی سیاسی لە نێوان ئێران و یەکێتی دا سەبارەت بە چەند مەسەلەی گرنگ، لەوانە:

١. پشتیوانی سیاسی حکومەتی ئێران لە خەباتی گەلی عیراق و سەلماندنی

ئازادی گەلی عیراق لە هەڵبژاردنی جۆری ڕژێمی سیاسی حوکمڕانی خۆی دا.

٢. پشتیوانی سیاسی خەباتی گەلی کورد لە عیراق دا بۆ هێنانە دی مافە نەتەوەییەکانی.

٣. ڕەنگدانەوەی پشتیوانی ئێرانی لە خەباتی گەلی کورد و گەلی عیراق لە کۆڕ و کۆمەڵە دیپلۆماسی و دەوڵەتیەکان دا.

٤. بەرامبەر بەوە درێژە بدرێ بە شەڕ و، هیچ لایەک بە تەنیا بۆی نەبێ شەڕ لە گەڵ عیراق ڕابگرێ، یان گفتوگۆی لە گەڵ بکا.

دوای ئەوەی مام جەلال ئەم گفتوگۆیەی تەواو کرد ئەبو بگەڕێتەوە کوردستان. لەو کاتەدا هەندێ لە دەسەڵاتدارانی بڕیار بە دەستی ئێرانی نائومێد بوبون لە سەرکەوتنی سپایی بە سەر عیراق دا و، بۆچونێکی بە هێزیان تێ دا پەیدا بوبو، کە درێژە پێ دانی جەنگی عیراق ئێرانی بە کارێکی بێ هودە دائەنا و، زەمینەیان بۆ ئەوە خۆش ئەکرد کە شەڕ ڕابگرن.

کاربەدەستانی ئێرانی ڕاستەوخۆ پێشنیارەکەی یەکێتییان دەربارەی پەیمانی سیاسی ڕەت نەکردەوە، بەڵام بیانوی زۆریان هێنایەوە بۆ ئەوەی سەر نەگرێ و سەرەنجام بە هیچ نەگەیشت.

مام جەلال درێژەی بە سەفەرەکەی دا، لە تارانەوە بۆ شام و، لە شامەوە بۆ ئەورووپا، بە سەری دا لەشکرکێشیی ئەنفالی ١ دەستی پێ کرد.

سالیۆم

بەعس بە ڕێگای جۆراوجۆر هەوڵی لە ناو بردنی دوژمنەکانی ئەدا، یەکێ لەو ڕێگایانە دەرمانخواردکردن بو بە زەهری (سالیۆم). سالیۆم هەمان زەهرە کە کورد پێ ی ئەڵێ (مەرگەموش) و بۆ کوشتنی مشک بە کار هێنراوە. چەند جارێ لە بەغداد ئەم زەهرەیان دا بوُ بە دوژمنەکانیان و بەوە کوشت بویانن. سالیۆم ڕەنگ و بۆن و تامی نیە، لە بەر ئەوە بە ئاسانی تێکەڵاوی خواردن و خواردنەوە ئەکرێ و، ئەخورێ بێ ئەوەی کابرا بە خۆی بزانێ تا نیشانەکانی دەرئەکەوێ. ماوەیەک لەوە پێش هەر بەم زەهرە کادرێکی تیپی ٢١ ی کەرکوک بە ناوی وریا سوریان دەرمانخوارد کرد و مرد.

بە هۆی دەزگای ئەمنەوە یەکێکیان ڕاسپارد بو زەهر بکاتە خواردنی مستەفا چاوڕەشەوە. ئەو کاتە مستەفا ماڵەکەی لە ناوژێ بو، سەرپەرشتی تیپەکانی پێشمەرگەی ئەو ناوچەیەی ئەکرد و، هەمیشە ماڵەکەی قەرەباڵغ بو. ڕۆژێکیان چەند میوانێکی ئەبێ و فرسەتی لێ ئەهێنن. هەمان ڕۆژ لەوانەی کە لەو سفرە و

خزمەندا بەشداری خواردن و خواردنەوەی ماستاو بون، دایکی مستەفا، بێستونی مەلا عومەر، کچێکی مەلا موحەڕڕەمی مەرگەیی مردن و، مستەفا چاوڕەش خۆی و کچێکی خوشکەزای، د. مەحمود عوسمان و عەدنان موفتی کە بۆ سەردان هات بونەوە کوردستان، لە گەڵ د شوان، سامی شۆڕش، ئەوانیش نیشانەکانی سالیۆمیان لێ دەرکەوت و مردن هەڕەشەی لێ نەکردن.

مستەفا و سامی نێردران بۆ ئێران و دواتر چون بۆ لەندەن بۆ چارەسەر، عەدنان و د شوان لە ئێران و، د مەحمودیش لە بەرگەڵو چارەسەر کران. بەڵام د مەحمود، ئەگەرچی داوای زۆری لێ کرا بۆ تەداوی بچێ بۆ دەرەوە، بڕیاری دا نە بچێ بۆ ئێران و نە بچێ بۆ دەرەوە، بەڵکو لە کوردستان بمێنێتەوە و، داوای کرد ئەگەر مرد (بەیان) ێکی باشی لە سەر دەربکرێ. بۆ خۆشبەختی دەرمانەکانی بۆ پەیدا کرا خۆی تەداوی خۆی کرد و، هەم ئەو و هەم نەخۆشەکانی تر لە مردن قوتار بون.

*

ی ن ک لە شوباتی ١٩٨٨دا

لە شوباتی ١٩٨٨دا ی ن ک بە کردەوە دەسەڵاتداری سەر ئەرزی کوردستانی عیراق بو، دەستی چالاکییەکانی ئەک هەر ئەگەیشتە ناو شارەکانی هەولێر، کەرکوک، سلێمانی، بەڵکو لە ناو موصڵ و لە نزیک تکریت و بەعقوبەش دەستی ئەوەشاند. داوودەزگاکانی بەمجۆرە بون:

مەکتەبی سیاسی،

کە بەرزترین دەسەڵاتی بڕیاردان بو لە ناو یەکێتی دا لە نێوان دو کۆبونەیەی کۆمیتەیەی سەرکردایەتی دا پێک هات بو لە: جەلال تاڵەبانی، سکرتێری گشتی و، نوێنەرانی شۆڕشگێڕان: د فوئاد مەعصوم، ناظم عومەر و، نوێنەرانی کۆمەڵە: فەرەیدون عەبدولقادر و، من.

کۆمیتەی سەرکردایەتی،

کە بەرزترین دەسەڵاتی بڕیاردانی سیاسی بو لە ناو یەکێتی دا و، ساڵی چەند جارێ کۆ ئەبووە بۆ هەڵسەنگاندنی هەلومەرجی کوردستان و، ڕێکخستنەوەی کاروباری یەکێتی و دەزگا سەرکردەیی و، مەڵبەندەکانی پێک هات بو لە ئەندامانی مەکتەبی سیاسی، لە گەڵ:

نوێنەرانی کۆمەڵە: کۆسرەت ڕەسول، جەبار فەرمان، عومەر عەبدوڵلا، قادری حاجی عەلی بەگ، حەمە تۆفیق، ئازاد هەورامی (دواییتر شەهید بو)،

حەسەن کوێستانی (دواییتر شەهید بو) و ئیحتیاتەکانی: عومەر فەتاح، د. خەسرەو خاڵ (دواییتر کۆچی دوایی کرد)، دلێر ئەحمەد شوکری.

نوێنەرانی شۆڕشگێڕان: عەبدوڵڵا عومەر، دارا حەفید، شەوکەتی حاجی مشیر، چەتۆ حەویزی، شێخ عەلی تاڵەبانی، (د کەمال فوئاد و عومەر مستەفا لە ئەوروپا بون) و، ئیحتیاتەکانی: عەبدولکەریم حاجی کاکە حەمە و شێخ محەممەدی سەرگەڵو.

کۆمەڵە و شۆڕشگێڕان، لە کاروباری ڕێکخراوەیی دا هەردوکیان سەربەخۆ بون، هەر لایەک سەرکردایەتی و دەزگای ڕێکخستن و، ڕێکخستنی جیاواز و، (ئۆرگان) ی تایبەتی خۆی هەبو.

دەزگای ڕاگەیاندن،

پێک هات بو لە: ئەرسەلان بایز، یوسف زۆزانی، ئازاد چالاک. مام جەلال خۆی سەرپەرشتی ئەکردن و، جگە لە ڕێنمایی بەردەوام، زۆر جار وتار و لێدوانی بۆ ئەنوسین. دەزگای ڕاگەیاندن کە هۆیەکانی بیستن و خوێندنەوەی بۆ ڕای گشتی خەڵکی کوردستان و عیراق دابین ئەکرد، لە جوڵانەوەکەدا گرنگییەکی تایبەتی هەبو و، کەڵکی لە چەند هۆیەکی ڕاگەیاندن وەرئەگرت، لەوانە:

ڕادیۆی دەنگی گەلی کوردستان، کە هەمو ڕۆژێ، بەیانیان و ئێواران، بەرنامەکانی بە کوردی و عەرەبی بلاو ئەکردەوە. هەواڵەکانی کوردستان و عیراقی بە تەڕ و تازەیی بە گوێگرەکانی ئەگەیاند. هەر بە هۆی ئەم ڕادیۆیەوە هەندێ جار ڕێنمایی نهێنی و وەڵامی پەلەی ڕێکخراوە نهێنییەکانی شارەکان بلاو ئەکرایەوە.

(ڕێبازی نوێ) بە کوردی و (الشرارە) ی بە عەرەبی مانگانە دەرئەکرد. جگە لە نامیلکەی جۆراوجۆر و بەیان و هەندێ جار کتێب.

بنکەی ڕادیۆ و چاپخانە و، هەمو کادر و کارکەر و پێشمەرگەکانی دەزگای ڕاگەیاندن و، ماڵ و خێزانەکانیان، لە بەر گەڵو بو. کادری نوسین و تەکنیکی و پێشمەرگەکانی ڕاگەیاندن بەرەوژوری ٢٠٠ کەس بون. دوژمن سەری کرد بوە سەریان، هەمیشە و لە هەر کوێیەک بونایە، لە بەر بۆردومانی فڕۆکە و تۆپباران دا بون.

دەزگای دارایی،

پێکهات بو لە لێپرسراوی دارایی مەڵبەندەکان، ناظم عومەر سەرپەرشتی ئەکردن. بارەگای سەرەکی لە قاسمەڕەش بو. دەزگای دارایی بەرپرسی ژیاندنی پێشمەرگە و و خەرجی بارەگاکان و شەڕەکان و، ژیاندنی خێزانی هەندێ لە ماڵە

شەهیدان بو. سەرچاوەی سەرەکی داهاتەکانی بریتی بو لە: نوقتەی گومرگی سەر سنورەکانی ئێران و، ئەو باجەی لەو کۆمپانیا بیانییانە ئەسێنرا کە لە کوردستان دا کاریان ئەکرد، لە گەڵ باجی ناوخۆی کوردستانی عیراق و، هەندێ یارمەتی کەمی دەوڵەمەندەکان.

بەشی (موخابەرە)

ڕاستەوخۆ بەسترا بو بە مەکتەبی سیاسیەوە. بەختیار مستەفا بە ڕێوەی ئەبرد و، پشکۆ عەبدولخالق لێپرسراوی (وەرشە) ی چاککردنەوەی بو. ئەم بەشە سەرپەرشتی ٥٢ ئێستگەی بێتەلی ئەکرد کە هەمو دەزگاکان و مەڵبەندەکان و تیپەکانی لە سەرانسەری کوردستانی عیراق دا بە یەکەوە ئەبەست و، هەمو ڕۆژ بە لایەنی کەمەوە ١٦ جار و لە کاتی پێویست دا ٢٤ جار پێوەندییان لە گەڵ یەک ئەکرد. کارکەرانی بێتەل، چونکە کۆدی بروسکەکانیان لە لا بو، ئەبو کەسانی ئەمین و، چونکە دەزگای (استمکان) ی عیراق بە ئاسانی ئەیدۆزینەوە و بۆردومانی شوێنەکانی ئەکردن ئەبو وریا و لە خۆبراو بن. هەر لەو چەند مانگەدا چەند کەسێکیان لێ شەهید بو.

نوێنەرایەتی یەکێتی لە ئێران و سوریا

بنکەی سەرەکی نوێنەرایەتی ئێران، لە کوردستانی عیراق لە یاخسەمەر بو. دانای ئەحمەد مەجید و، شێردڵ حەوێزی، ئەفسەری پێوەندی بون. بنکەی نوێنەرایەتی یەکێتی یش لە ئێران، لە سەقز د. کەمال خوشناو لێپرسراوی و، عەلی کەمال یاریدەدەری و، لە تاران ڕەفعەت عەبدڕەحمان لێپرسراوی و موشیر حەمە غەریب یاریدەدەری بو. د. خەسرەو خاڵ لێپرسراوی بنکەی نوێنەرایەتی ی ن ک بو لە شام.

مەڵبەندەکان

سەرکردایەتی یەکێتی، کوردستانی عیراقی دابەش کرد بو بەسەر ٤ مەڵبەندا. مەڵبەند حکومەتێکی بچوک بو لە سنوری ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی دا.

نەخۆشخانەیەکی ناوەندی لە بەرگەڵو و، هەمو مەڵبەندێکیش نەخۆشخانەی تایبەتی خۆی و دەستەیەک پزیشک و برینپێچی هەبو. داوودەرمان و (اشعە) و ژوری نەشتەرکاریی تێ دا بو. لە نەخۆشخانەکان دا هەمو کەس بەبێ جیاوازی بە خۆڕایی تیمار ئەکرا. لە نەخۆشخانەی ناوەندی بەرگەڵو: د. شوان، د. هەڵۆ، د. هێرش و، د. شالاو و، د. هێمن و، لە نەخۆشخانەکانی م ١: د. فایەق و، د. حەسەن و، د. جەبار، لە نەخۆشخانەکەی م ٣: د. زریان، کاریان ئەکرد.

له هەمو مەڵبەندێ دادگا هەبو بۆ لێپرسینەوەی تاوانکاران، بە تایبەتی تاوانی کوشتن و دزی. دادگاکان لە بڕیارەکانیان دا پێڕەوی قانونەکانی عیراق و، شەریعەتی ئیسلام و عورفی ناوچەییان ئەکرد. ئەندامانی دادگاکان لە دەرچوانی زانستگا قانونیەکانی عیراق بون. بە گشتی لە ناوچە ئازادەکان دا تاوانی کوشتن و دزی کەم بو. لەزیندانەکانی ی ن ک دا هەمو جۆرە ئەشکەنجە و ئازاردان و سوکایەتی پێ کردنێ، بەرامبەر بە هەمو کەس ئەگەر زۆر تاوانباریش بوایە، زۆر بە توندی قەدەغە بو. بۆ لێکۆڵینەوە و بڕیاردان لە تاوانی جاسوسی و خیانەت لە نیشتمان (دادگای بەرزی شۆڕش) هەبو کە پێک هات بو لە ٢ کەسی حقوقی بە سەرۆکایەتی ئەندامێکی م س.

بۆ ئەوەی خەڵک خۆیان کاروباری خۆیان بەڕێوە ببەن و کێشە و گیروگرفتەکانی خۆیان بە لادا بخەن، لە هەمو گوندێک دا بە هەڵبژاردنی ئازاد (ئەنجومەنی ئاوایی) یان هەڵبژارد بو. ئەنجومەن جگە لە بەلاداخستنی کێشەی ناو دانیشتوانی ئاواییەکە، بە هاوکاری لێپرسراوی کاروباری کۆمەلایەتی ناوچەکە، خۆیان مشوری مزگەوت و مەلا، دامەزراندنی قوتابخانە و مامۆستا، شوێنی تیمارکردن و برینپێچ، پرد و ڕێگاوبانیان ئەخوارد. سەرەڕای ئەمانەش بە یارمەتی ی ن ک هێزێکی چەکداریان لە سەرشێوەی ڕێکخستنی پێشمەرگەیی ی ن ک بۆ (پشتگیری) لە هێزی پێشمەرگە لە کاتی بەرەنگاری هێزەکانی حکومەت دا دروست کرد بو.

مەڵبەندی ١

بارەگاکەیان لە قوپی قەرەداخ بو. سنوری مەڵبەندەکەیان لە هەڵەبجەوە بۆ گەرمیانی ئەگرتەوە. ڕێگای سلێمانی کەرکوک ئەبو بە سنوری جیاکردنەوەی سنوری ئەمان و مەڵبەندی ٢. قادری حاجی عەلی بەگ بەرپرسی مەڵبەند و، عومەر فەتاح هی کاروباری دارایی و، شێخ عەلی تاڵەبانی هی سیاسی و، صالح قادر هی کۆمەلایەتی و، ڕۆستەم کەرکوکی، شێخ جەعفەری قەرەداخی، ئاوات قارەمانی، بەرپرسی کاروباری پێشمەرگە بون.

تیپەکانی م ١ و فەرماندەکانیان بریتی بون لە: ت ٥١ ی گەرمیان، محەممەد حاجی شێخ کەریم (حەمەڕەش، دواییتر شەهید بو). ت ٥٣ ی شێروانە، عادل شوکر. ت ٥٥ ی قەرەداخ، ئەحمەد کەلاری (دواییتر شەهید بو). ت ٥٧ ی سەگرمە، مەحمود سەنگاوی. ت ٥٩ ی حەمرین، قەیصەر (هێمن). ت ١١ ی هەورامان، قادر کۆکۆیی (دواییتر شەهید بو). ت ١٥ی شارەزور، جەلال کوڵکنی.

ت ١٧ ی زمناکۆ، جەمیل هەورامی. ت ٣٣ ی سورێن، کەمال شاکیر. ت ٣٥ ی کورەکاژاو، حەمە مۆریاسی. ت ٣٧ ی خەنجەرە، سەرحەدی خەلیفە یونس. تیپی مەڵبەند، عەدنان حەمەی مینا.

ڕێکخراوی ٤ ی کۆمەڵە لە سنوری ئەم مەڵبەندەدا کاری ئەکرد. بەرپرسی ڕێکخراو عومەر فەتاح و، ڕێکخراکەیان پێک هات بولە: جەلال جەوهەر، کۆردۆ قاسم، کاکەڕەش، محەمەد ئەسعەد (پۆلا)، بەختیار محەمەد مەلا عیزەت، سەلاحی کوێخا، محەمەد حەمەمین، حاجی عەلی (لە ئەنفال دا شەهید بو)، کە هەریەکەیان بەرپرسی کاروباری ڕێکخراوەیی سنوری یەک تیپ بون.

شێخ عەلی تاڵەبانی، بەرپرسی مەکتەبێکی ڕێکخستن بو کە سەرپەرشتی ناوچەکانی شۆڕشگێرانی ئەکرد، لە سنوری مەڵبەندەکەدا.

مەڵبەندی ٢

بارەگاکەیان لە سەرگەڵو بو. سنورەکەی لە پینجوینەوە درێژ ئەبووەوە بۆ سەر ئاوی زێ لە نزیک چەمچەماڵ. جادەی کەرکوک - سلێمانی لە م ١ و ئاوی زێ لە م ٣ ی جیا ئەکردەوە. دارا حەفید لێپرسراوی مەڵبەند و، عەبدولکەریم حاجی کاکەحەمە هی کاروباری سیاسی و، دلێری ئەحمەد شوکری هی دارایی و، دلێری سەید مەجید هی کۆمەڵایەتی و، حامیدی حاجی غالی هی کاروباری پێشمەرگە بو.

تیپەکانی م ٢ و فەرماندەکانی بریتی بون لە: ت ٢١ ی کەرکوک، سیروانی کوێخا نەجم. ت ٢٣ی سورداش، غەریب عەسکەری. ت ٢٥ ی خاڵخاڵان ڕەهبەر سەید ئیبراهیم. ت ٢٧ کەڵکە سماق، هاوڕێ ی کاکە حەمە. ت ٣٣ ی سلێمانی، جوامێر. ت ٣٧ ی شارباژێر، جەمال حاجی محەمەد. ت ٤٤ ی چەکوچ، صەدرەدینی شێخ حەسەن. ت ٤٩ ی سارا، عەزیزی حاجی حەمەسەعید. ت ٤٧ ی پیرەمەگرون، جەلال محەمەد محیێدین (دواییتر شەهید بو). ت ٤٣ ی ئاسۆس، عوسمان شارستێنی. ت ٦٣ جوتیاران، محەمەد ڕازانی (دواییتر شەهید بو). ت ٦٧ی مامەندە، قادری مامەند ئاغا. ت ٦١ ی کۆرەش، محەمەدی وەتمان. تیپی مەلبەند، مستەفا سەرگەڵویی.

ڕێکخراوی ٣ ی کۆمەڵە لە سنوری ئەم مەڵبەندەدا کاری ئەکرد. بەرپرسی ڕێکخراو محەمەد تۆفیق و، ڕێکخراکەیان پێک هات بولە: ڕەفعەت عەبدوڵلا، سەیوان محەمەد، بەکر فەتاح، محەمەد سوڵتان (دواییتر شەهید بو)، مستەفا سەید قادر، سەرهەنگ ساحیبقران، بەختیار مستەفا، عەدنان شاسوار، ئەحمەد

عەبدوڵلا عەسکەری، مەحمود محەممەد ئەحمەد (مەلا فەرمان)، باپیر، کە هەریەکەیان بەرپرسی کاروباری ڕێکخراوەیی سنوری یەک تیپ بون.

عەبدوڵلا عومەر، بەرپرسی مەکتەبێکی ڕێکخستن بو کە سەرپەرشتی ناوچەکانی شۆڕشگێڕانی ئەکرد، لە سنوری مەڵبەندەکەدا.

لەبەر گرنگی ناوچەکە کە بارەگاکانی سەرکردایەتی لێ بو، وە بۆ پارێزگاری کردنی لە هێرشی دوژمن، بەکری حاجی صەفەر دانرا بو بە فەرمانده‌ی هێزەکانی بەری کارێزە و، مستەفا چاوڕەش بە فەرماندەی هێزەکانی بەری مەرگە. مستەفا دەرمانخوارد کرا بو، لە جێگەی ئەو عەلی محەممەد عەسکەری (پچکۆڵ) سەرپەرشتی ناوچەکەی ئەکرد.

مەڵبەندی ٣

بارەگاکەی لە سماقولی سەروچاوە بو. سنوری مەڵبەند هەمو هەولێری ئەگرتەوە. کۆسرەت ڕەسول لێپرسراوی مەڵبەند و، چەتۆ حەوێزی هی کاروباری کۆمەلایەتی و، حەسەن کوێستانی (دواییتر شەهید بو) هی دارایی و، عەبدوڕەزاق محەممەد (دواییتر شەهید بو) هی کاروباری سیاسی و، سامان گەرمیانی و جەلال عەبدولقادر هی کاروباری پێشمەرگە بون.

تیپەکانی م ٣ و فەرماندەکانی بریتی بون لە: ت ٨٧ ی قەرەچوخ، مام غەفور. ت ٨٦ ی دەشتی هەولێر، ڕێباز (دواییتر شەهید بو). ت ٧٤ ی باڵەک، ئیبراهیم حاجی کوێخا ئەحمەد (دواییتر شەهید بو). ت ٧٨ ی کاروخ، حسێن مەولود (دواییتر شەهید بو). ت ٩٣ ی کۆیە، بەکر مستەفا. ت ٩٩ ی بیتوێن، تۆفیق کانی وەتمانی. ت ٩١ ی سەفین، سەفینی مەلاقەرە. ت ٩٠ ی باواجی، جەنگی فەقیانی. ت ١٢ ی سۆران، سەعیدی حەمە زیاد. ت ١٩ی کورەک، عەبدوڵلا موصلیح. ت ٨٣ ی هەورێ، کاکەجوان. ت ٨٥ ی بەڕانەتی، تەحسین کاوانی (دواییتر شەهید بو).

لە سنوری م ٣ دا دو ڕێکخراوی کومەڵە کاریان ئەکرد.

ریکخراوی ١ عەبدوڕەزاق محەممەد بەرپرسی و، ڕێکخراوەکەیان پێک هات بو لە: حەیدەر ئیسماعیل (ڕێبوار)، هوشیار کەریم (دواییتر شەهید بو)، طەلعەت خدر، دڵشاد (ناسراو بە حاکم شۆڕش)، سەیفەدین عەلی، بەکر ئەحمەد، کە هەریەکەیان بەرپرسی کاروباری ڕێکخراوەیی سنوری یەک تیپ بون.

ڕێکخراوی ٢ شاخەوان عەباس بەرپرسی و، ڕێکخراوەکەیان پێک هات بو لە: عەبدولکەریم مامەند (مەلا خدر)، بەهرۆز حەمە ساڵح (شوان)، خدر عومەر

(یەسین) ،عەبدولکەریم ئەحمەد (عەول)، دڵشادی مەلا عەلی، کە هەریەکەیان بەرپرسی کاروباری ڕێکخراوەیی سنوری یەک تیپ بون.

چەتۆ حەویزی، بەرپرسی مەکتەبێکی ڕێکخستن بو، کە سەرپەرشتی ناوچەکانی شۆڕشگێڕانی ئەکرد، لە سنوری مەڵبەندەکەدا.

مەڵبەندی ٤

ئەم مەڵبەندە لە دوای ئاشتبونەوە لە گەڵ پ د ک پێک هات. لە مەڵبەندەکانی ترەوە پێشمەرگە و کادریان بۆ ئەنارد. مەڵبەندەکەیان لاواز بو. هێزەکانیان کەم بو. پ د ک یش نەی ئەهێشت پەرە بسێنن و زیاد بکەن. زۆر جار تەنگیان پێ هەڵ ئەچنین. تەنانەت جارێکیان ناچار بوین ئاگاداری لقەکانی سلێمانی و هەولێر و کەرکوک بکەین، ئەگەر لقی بادینانی ئەوان ڕەفتاری خۆیان لە گەڵ م ٤ باش نەکات، ئەوا ئێمە مەڵبەندەکەی خۆمان لە بادینان ئەکێشینەوە، ئەوسا ئەبێ ئەوانیش ئەو ناوچانە چۆڵ بکەن. هێزەکانی پ د ک ئەو زەمانە کەم بون، هەمویان تازە لە ئێرانەوە هات بونەوە.

لە پێش دا ئازاد هەورامی بەرپرسی م ٤ بو، دوای ئەو عومەر عەزیز بو.

پچوکترین یەکەی پێشمەرگە (مەفرەزە) بو. (مەفرەزە) پێک ئەهات لە ٥ - ١٥ پێشمەرگە. هەر ٣ - ٥ مەفرەزەش یەک (کەرت) و هەر ٣ - ٥ کەرتیش یەک (تیپ) یان پێک ئەهێنا. تیپەکانی پێشمەرگە ژمارەی هەندێکیان ئەگەیشتە ٥٠٠ پێشمەرگە. چالاک و کارامە و ئازا بون. کە بانگ ئەکران بۆ شەڕ زۆر بە زویی کۆ ئەبونەوە.

*

هاتوچۆی هالیکۆپتەری ئێرانی

ئەو پەیمانە سیاسیەی کە یەکێتی پێشنیاری کرد بو لە لایەن ئێرانەوە قبوڵ نەکرا. ئێران لە ناو خۆیان دا کێشەیان هەبو، باڵێکی بەهێزی ناو دەزگای بڕیاردان ئەیویست کۆتایی بە شەڕ بهێنێ و، باڵێکی بەهێزی تریان ئەیویست درێژە بە شەڕ بدا و، بۆ ئەو مەبەستە هەوڵیان ئەدا یەکێتی یش لە شەڕەوە بگلێنێ، چ بە هەندێ کاری هاوبەش و، چ بە هەندێ کاری یەکلایەنی یەکێتی.

زستانی ٨٧ - ٨٨ زۆر سەخت بو. بەفر و باران بەردەوام ئەباری. ئەوەیش کاری ئەکردە هاتوچۆ و جموجوڵی پێشمەرگە. ئەو ماوەیە چالاکی کەم بوبووەوە بە تایبەتی زۆر ئەبو هێزێکی گەورەمان لە سەرکردایەتی کۆ کردبووەوە بۆ ئەوەی کارێکی هاوبەش هاوزەمان لە گەڵ هێزەکانی ئێران ئەنجام بدەین و، ئێرانیەکان بە بیانوی

ئاشکرابونی کارەکەوە هەڵیان وەشاندبووەوە و، ئێمەش هێزەکانی خۆمان بڵاوە پێ کرد بو. ئێرانیەکان چەند جارێ ئەیان دا بە گوێمان دا کە ئاخۆ لە بەر هۆی سیاسی چالاکیەکانمان کەم بۆتەوە و ئامادەی کاری هاوبەش نین لە گەڵ ئەوان یان لە بەر سەختی زستان و، دژواریی ئەنجامدانی کارەکەیە؟ چەند جارێ ئەیان دا بە گوێ مان دا کە ئاخۆ ژێر بە ژێر موفاوەزەمان لە گەڵ عیراق دا هەیە. هەمان پرسیاریان لە تاران لە نوێنەری یەکێتی ڕەفعەت عەبدوڕەحمان و لە سەقز لە نوێنەری یەکێتی د. کەمال کرد بو. لە بەر ئەوەی کە بە ڕاستی هیچ جۆرە پێوەندیەکی ژێر بە ژێر یا ئاشکرا لە نێوان ئێمە و عیراق دا نەبو، ئێمە ئینکارمان ئەکرد، ئەوان باوەڕیان نەئەکرد یا نەیان ئەویست باوەڕ بکەن و ئەیانوت گوایە لێیان ئەشارینەوە. وەکو دوایی دەرکەوت، لەو بەینەدا، د موکەڕەم تاڵەبانی هەندێ نامەی لە بارەی گفتوگۆوە بۆ سەرکردەکانی چوار حیزب نوسی بو، بەڵام ئەو کاغەزەی بۆ مام جەلالی نوسی بو، بە دەستی ئێمە نەگەیشتبو و، لێ ی ئاگادار نەبوین. مام جەلال خۆیشی لە کوردستان نەبو کاغەزەکەیشی پێ نەگەیشت بو. بەڵام کۆپی یەکێ لەو کاغەزانەی بۆ سکرتێری یەکێ لەو حیزبانەی نوسی بو دەس ئێرانیەکان کەوت بو. ئەوان کێچەڵی شتێکیان پێ ئەکردین کە ئێمە ئاگامان لێ ی نەبو.

ئەم مشتومڕە گەیشتە ڕادەیەک کە بیرمان لەوە کردەوە نوێنەرایەتی یەکێتی لە ئێران و بریندارەکان بکێشینەوە و داوا لە ئێرانیش بکەین ئەوانیش نوێنەرەکانی خۆیان لە کوردستانی عیراق بکێشنەوە و، پێوەندێ دوقۆڵی ڕابگرین. د. مەحمود عوسمان کە لەو کاتەدا دەرمانخوارد کرا بو، لە بەرگەڵو بو، ئەویش ئاگاداری کێشەکە بو، لە زۆری کۆبونەوەکانی سەرکردایەتی یەکێتی دا بەشدار ئەکرا و پرسی پێ ئەکرا. بۆ باسی ئەم کێشە دروستکراوە فەرەیدون چو بۆ گفتوگۆ بۆ ئێران.

لە پڕ ئاگاداریان کردین کە بە هاڵیکۆپتەر وەفدێکی ئێرانی دێن بۆ گفتوگۆ بۆ بەرگەڵو. ڕۆژی ٣٠ ی کانونی دوەمی ٩٨٨ هالیکۆپتەری ئێرانی لە بەر گەڵو نیشتەوە و وەفدەکەی لێ دابەزی. ئەوە یەکەمین جار بو ئێران هالیکۆپتەر بۆ مەبەستێکی وەها بە کار بهێنێ. کە دانیشتین لە گەڵیان ئێمە کەوتینە گلەیی. ئەوان وتیان ئێمە بۆ گلەیی نەهاتوین، بەڵکو هاتوین بۆ گەرمکردنەوەی پێوەندیەکان.

چەند کەسێ لە بەرپرسەکانیان لە یاخسەمەر مانەوە و، بەڵێنیان دا کە درێخی نەکەن لە یارمەتی دانی یەکێتی دا و، لە بەر ئەوەی هەمو ڕێگاکان بەفر گرت بوی هاتوچۆکردن و گوێزانەوە بە وڵاخ نەئەکرا، بە هالیکۆپتەر کەوتنە هێنان و

خولرانەوەی کەلوپەل و، هەمو رۆژێ چەند جارێ نەهاتن و نەگەڕانەوە. تەنیا سودی ئێمە لەم هاتوچۆیە ڕەوانەکردنی بریندارەکانمان بو. بەڵام هاتوچۆی ڕۆژانەی دەیان هالیکۆپتەری ئێرانی بۆ سەرکردایەتی یەکێتی، کاربەدەستانی عیراقی زۆر ترساند بو. وەکو (عقیدرکن ولید) بەڕێوەبەری بەشی سێهەمی ئیستیخباراتی عەسکەری، کاتی گفتوگۆ لە بەغداد بۆی باس کردم، یەکێ لە هۆکانی پەلەکردن لە هێرشی ئەنفال، ئەو هاتوچۆ زۆرە بو کە هالیکۆپتەرەکانی ئێران بۆ بەرگەڵویان نەکرد. ئەوان وایان زانی بو ئێران چەکی ستراتیجی و گرنگ و کاریگەر و پسپۆڕ و شارەزا ئەگوێزێتەوە بۆ ناوچەکە. ڕاستیەکەیشی ئەوە بو بە زۆری کەلوپەلی بێ نرخی وەکو مەسینە، جزمە، بەتانی، خواردنی قوتو... یان ئەهێنا و، لە هاتوچۆی ڕۆژانەی هالیکۆپتەرەکانیان مەبەستێکی سیاسی و مەبەستێکی سپاییان هەبو.

مەبەستی سیاسییان، تێکدانی (مبادره) کەی د. موکەڕەم تاڵەبانی بو کە هێشتا لە سەرەتادا بو، لە ڕاستی یش دا وەهایان تێک دا هەرگیز هیچی لێ سەوز نەبو.

مەبەستی سپاییشیان، ڕاکێشانی هێزەکانی عیراق بو بۆ ئەو ناوچەیە، لە ڕاستی یش دا زیاتر لە ٢٠ لیوای جەیشی عیراق ڕاکێشران بۆ ئەم مەیدانە.

*

## هێرشەکانی ئەنفال

دەزگا جاسوسییەکانی عیراق دزەیان کردبو بۆ ناو دەزگا دەسەڵاتدارە بەرزەکانی ئێران. بە وردی لە توانا و نیاز و بڕیاری پێشەکی ئێران ئاگادار بون. صەددام و سەرکردایەتی بەعس دڵنیا بون کە: ساڵی ١٩٨٨ ئێران لە مەیدانی جەنگ دا تەواو بوە، لە بەر ئەوە بەشیکی گرنگی تەقەڵای جەنگیی خۆیان بۆ کورد تەرخان کرد و، کەوتنە جێبەجێ کردنی زنجیرەی لەشکرکێشییەکانی (ئەنفال) کە جوڵانەوەی چەکداری کوردیان شکاند.

## بۆسەیەکی سەرنەکەوتو

لە پێش دەس پێ کردنی هێرشەکەدا، لە سەرچاوە تایبەتییەکانی خۆمانەوە هەواڵمان پێ گەیشت بو، کە عیراق لە ڕێگای ناگاداری ئیستیخباراتی خۆیەوە دڵنیا بوە لەوەی ئێران توانای هێرشی گەورەی نەماوە و، نیازی هیچ هێرشێکی گەورەی نیە. بۆیە ئەتوانن بێ ترس بەشێکی هێزەکانیان لە جەبهەکانی عیراق - ئێران بکێشنەوە و، پەلاماری بارەگاکانی سەرکردایەتی ی ن ک بدەن. هەندێ لەو بروسکانەی پێمان ئەگەیشتن ڕاستەوخۆ لە (دیوان الرئاسە) وە ئەنێردران بۆ

سەرکردایەتی هێزەکانی جەیش.

بۆ پەکخستنی هێرشەکانی عیراق زنجیرەیەک چالاکی پێشمەرگەیی لە سەر جادە گشتیەکان ئەنجام درا. لە ناو ئەوانەدا یەکێکیان لە هەمویان گرنگتر بو.

پێش دەس پێ کردنی هێرشەکان هەندێ لە ئەندامانی (القیادە العامە للقوات المسلحە) لە گەڵ چەند قائید فەیلەق و قائید فیرقەیەک کە ئەبو ئەخشەی هێرشەکە جێبەجێ بکەن بۆ دارشتنی دوا دێرەکانی ئەخشەی ئەنفال هاتنە ناوچەکە لە کاتی گەڕانەوەدا لە سەر جادەی دوکان سلێمانی بۆسەیەکیان بۆ دانرا. لە بەر ئەوەی هەمویان ئەفسەری پلە بەرز و، هەر یەکەیان (حمایە) ی خۆی لە گەڵ بو کاروانەکەیان نارێک و پێک بو. بەرایی هێزەکەیان کە ئەگاتە نزیک بۆسەکە، جاشێک لە ڕەبیئەیەکی نزیک جادەکە بە ڕاکردن ئەیانگاتێ و ئەڵێ ٥٠ (مخرب) بۆسەیان بۆ داناون بگەڕێنەوە. کابرای ئەفسەر تا ئاگاداری کاروانەکە ئەکا بگەڕێنەوە بەرایی هێزەکە ئەگاتە ناو بۆسەکە. چەند سەربازێ ئەکوژرێ و لۆریەکیان لێ ئەگیرێ بەڵام کاروانەکە بە سەلامەتی بەر لەوەی بگاتە ناو بۆسەکە ئەگەڕێتەوە دواوە. وەکو لە کاتی گفتوگۆکانی ٩١ دا لە بەغداد عقیدرکن ولید، کە جاشەکە ئەمی وریا کرد بوەوە و، دواتر وەکو فریق اول رکن نزار خزرجی لە سەفەرێکی لەندەنی دا بۆیان باس کردم ئەگەر بکەوتنایەتە ناو بۆسەکەوە لەوانە بو ئەخشەی ئەنفالی ١ بە کوشتنی ئەمانە بە تەواوی پەکی بکەوتایە.

ئامانجی یەکەمین هیرشی ئەنفال پەلاماردانی بارەگاکانی سەرکردایەتی ی ن ک بو. عیراق لە کۆتایی کانونی دوەم و سەرەتای شوباتی ١٩٨٨ەوە کەوتە مۆڵدانی هێزەکانی لە ناوچەکانی بناری گویژە، جادەی سورداش، دەشتی مەرگە، کارێزە. جگە لەوەی (معسکر) ەکانی سەلام و ساردای پڕ کرد بو. بە هەزاران خێوەتی هەڵدا بو. سەدان تانک و لولە تۆپی ساز دا بو.

*

دەس پێ کردنی هێرشەکان

چواردەوری بارەگاکانی سەرکردایەتی کە درێژاییەکەی نزیکەی ٧٢ کلم بو بە سەنگەری پێشمەرگە قایم کرا بون. لە لای ڕۆژئاوایە: شاخی ئاسۆس و گەورە قەڵا و، بەرزاییەکانی سێدەر و شارستێن و قەڵەم پاشا و دۆڵ مازەڵە لە زنجیرەی شاخی ژیلوان، لە لای خوارویەوە شاخەکانی دابان و هەلاج و کەلکی قزلەر و دۆڵەڕوت لە زنجیرەی چەرماوەند و قوولەپوشینە و قوولەسەوز و زێوێ لە شاخی پیرەمەگرون و، لە لای ڕۆژهەلاتییەوە شاخەکانی خەجەلەرزۆک، دوتوێ، دوبرا، پیر بایز، پیر

<watermark: PDF 4 KURD>

سەیاس، کوێرەنگ، قایم کرا بون. جگە لە هێزەکانی سەرکردایەتی و تیپەکانی مەڵبەندی ٢ بەشی زۆری هێزەکانی م ١ و م٣ ش بانگ کرا بون بۆ بەشداری لە پاراستنی ناوچەکەدا، ژمارەی ئەو پێشمەرگانەی لە سەنگەردا دامەزرێنرا بون نزیکەی ٢,٥٠٠ کەس بو.

شەوی ٢٢ - ٢٣ ی شوباتی ٩٨٨ بۆمبارانی خەستی کیمیایی دەستی پی کرد. لە ئەنجامی ئەم بۆمبارانەدا چەند کەسێ کوژران لەوانە خێزانێکی گوێزیلەیی کە پارێزگاری عەمارێکی چەکیان ئەکرد لە ئەشکەوتەکەی گوێزیلە. نزیکەی ٢٠٠ کەسیش لە دانیشتوانی ناوچەکە و پێشمەرگە بریندار بون. د. هەڵۆ بەڕێوەبەری نەخۆشخانەی ناوەندی، بەیانی زو (تەعلیمات) ێکی دا بە هەمو نیستگاکانی بێتەلی بارەگاکان و بە نیستگای ڕادیۆ دەربارەی جۆری خۆپاراستن.و (اسعافاتی اولی) بۆمبارانی کیمیایی.

بە دوای چەند سەعاتێ بۆمباران دا بۆ دوای نیوەڕۆ پیادەی-جەیش دەستیان کرد بە هێرش لە چەند لایەکەوە: هێزێک لە مێرگەپانەوە بەرەو شەدەڵە. هێزێکی تر لە دۆڵە ڕوتەوە بەرەو کەڵکی قزلەر. هێزێکی تر لە قەڵەم پاشاوە بەرەو بەرگەڵو. هێزێکی تر لە دەشتی بنگردەوە بۆ سەر گەورە قەڵا و ناسۆس. هێزێکی تر لە گۆجاڕەوە بەرەو گەورە دێ. هێزێکی تر لە کارێزەوە بەرەو خەجەلەرزۆک...

ئەو هێزەی لە قوولەپوشینە و قوولەسەوز دانرا بون پاش ئەوەی بۆمبارانی کیمیایی کرا بون، خۆیان پێ نەگیرا بو، دوای شەڕێکی کەم سەنگەرەکانی پیرەمەگرونیان چۆڵ کرد بو، کشا بونەوە سەرگەڵو. جەیش ڕۆژی ٢٥ی شوبات گەیشتە ناو شەدەڵە. سەرگەڵو و بەرگەڵو لە گەڵ شەدەڵە ئەم دیو و ئەو دیو بون، تەنیا بەرزاییەکانی دابانیان لە بەین دا بو. هێزێکی دەشتی هەولێر لە شەدەڵە بون ئەوانیش کشا بونەوە مێرگەپان نزیک قزلەر. بێ ئاگا لەم ئاڵوگۆڕانە کۆسرەت موخابیرەکەی خۆی، عەبدوللای نارد بۆ سۆراخی هێزەکەی دەشتی هەولێر. عەبدوللا کەوت بوە ناو جاش و جەیشەوە بە دیل گیرا و بێ سەر و شوێن بزر بو. بۆ گرتنەوەی شەدەڵە شەو پێشمەرگە هێرشێکیان کرد بەڵام بە هۆی ڕەهێڵەی باران و، هەڵسانی جۆگاکەی شەدەڵەوە، هێرشەکە سەرکەوتو نەبو. لەم هێرشەدا محەمەد ڕازانی فەرماندەی تیپی ٦٣ ی جوتیاران کوژرا.

بۆمبارانی کیمیایی بارەگاو ئاواییەکانی ناوچەکە و، تۆپباران و هێرشی ئاسمانی بێ پسانەوە بەردەوام بو. لە زۆری قۆڵەکانەوە هێرشەکانی دوژمن ئەشکێنرا. بەڵام کۆڵیان نەئەداو بە هێزی تازە سەرلەنوێ پەلاماریان ئەدا.

لە قۆڵی مەرگەوە جەیشی عیراق بەردەوام هێرشی ئەهێنا، بەڵام لە چەند ڕۆژی یەکەم دا هیچ سەرکەوتنێکی بە دەس نەهێنا. بەڵام ڕۆژێکیان لە پڕ فەرماندەی جەبهەکە، بە بێتەل، ئاگاداری کردین کە ئەگەر تا چەند سەعاتێکی تر هێزی یارمەتی پێ نەگات، هێزەکانی هەرەس ئەهێنن و ناوچەکەی ئەکەوێتە دەس دوژمن. ئەو لەو قسانەدا بو ناوچەکەی گیرا و هێزەکانی پەرەوازە بون، هەر تاقمەی بە لایەک دا. بەشێ لە پێشمەرگەکان و دانیشتوانی ناوچەکە بە هەورازی کورکوڕ دا بەرەو گەلاڵە کەوت بونە ڕێ. لە بەر سەرما و زۆریی بەفر نزیکەی ٤٠ کەسیان لەوانە: گەنج و، منداڵ و ژن مرد بون. هەروەها ٤٤ ئەفسەری عەرەب کە دیل بون و، هەندی برینداریان بە جێ هیشت بو.

گیرانی جادەی مەرگە - کانی تو دەلاقەیەکی زلی کردە جەبهەکەمان و دوای گیرانی پیرەمەگرون و شەدەڵە، جەزرەبەیەکی کوشندە بو لە هێزەکانی ئێمە، چونکە پشتی جەبهەکەمان بو. لەوێوە هێزەکانی دوژمن بەرەو شارستێن و سێدەر و ژیلوان کشان و ئەیانەویست بەرەو گۆمەزەڵ و یاخیان هەڵگەڕێن بۆ ئەوەی ڕێگای کشانەوە و دەرچونی هێزەکانی ئێمە دابخەن. دوژمن لە لای قەڵەم پاشەوە پێش کەوت و هەندێ لەو بەرزاییانەی گرت کە ئەیڕوانی بە سەر بەرگەڵودا.

*

کارەساتی هەڵەبجە

بەر لە هێرشەکانی ئەنفال بیرمان لە ئازاد کردنی چەند ناوچەیەک کرد بوە لەوانە: هەڵەبجە، دوکان، قەڵادزە و ڕانیە. بۆ ئازادکردنی پشدەر و بیستوێن تا شاخی هەیبەت سوڵتان لە مێژ بو لە گەڵ ١٢ موستەشاری ناوچەکە ڕێک کەوت بوین پێکەوە بە کارێکی هاوبەش (قوات المعتصم) واتە هێزەکانی فق ٢٤ بگرین و ناوچەکە ئازاد بکەین. لە بەر تەواو نەبونی ڕێگای - سەردەشت قەڵادزە دوامان خست بو.

لە گەڵ زۆر بونی گوشاری دوژمن بۆ سەر ناوچەکەی ئێمە، مەترسی ئەوە زیادی کرد کە جەیشی عیراق ناوچەکەمان لێ داگیر بکا و، گیرانی بارەگاکانی سەرکردایەتی یەکێتی یش ئەبو بە هۆی هەرەس هێنانی بەرگری لە ناوچەکانی کەدا و، لە ئەنجام دا هەرەس هێنانی بزوتنەوەی چەکدار لە کوردستانی عیراق دا. ئەبو بە هەر جۆرێ بێ کارێ بکەین جولانەوەکەمان لە ڕوخان ڕزگار بکەین. بۆ ئەو مەبەستە داوامان لە ئێران کرد پارێزگاری هەندێ لە شاخەکانی پشتی ناوچەکەی ئێمە لە پەلاماری جەیشی عیراق بگرنە ئەستۆی خۆیان، بۆ ئەوەی هێزەکانی ئێمە ئازاد بن

و بتوانین بیانگوێزینەوە بۆ پاراستنی خەتی چەرماوەند و ژیلوان و ناسوس. بەسترانی ڕێگەی زەمینیی، کە بەفر گرت بوی، کرد بە بیانوی ئەنجام نەدانی ئەم داوایە. داوامان لێ کردن لە جێگایەکی ترەوە (جەبهە) یەکی نوێ بکەنەوە بۆ ئەوەی دوژمن ناچار بێ بەشێ لە هێزەکانی لە شەڕگاکەی ئێمە بکێشێتەوە. ئێران بیانوی هێنایەوە و لە وەلام دا نائومێدیان کردین. ئەم هەلوێستەیان پێچەوانەی ئەو ڕێککەوتنە بو کە لە کاتی خۆی دا لە گەلیان ئیمزا کرا بو، سەبارەت بەوەی کە ئەگەر لایەک کەوتە بەر هێرشی عیراق، لایەکەی تر ئەبێ بۆ یارمەتی دانی بجولێ و، ئەگەر پێویستی کرد جەبهەیەکی تازە بکاتەوە بۆ ئەوەی گوشاری لە سەر کەم بێتەوە.

ئەخشەی ئازاد کردنی هەلەبجە لە مێژ بو ئامادە کرا بو. فەرەیدون و د. فوئاد لەو کاتەدا لە ئێران بون. داوامان لێ کردن پەلە لە جێبەجێ کردنی بکەن. بۆ ئەوەی ئەگەر عیراق بارەگاکانی سەرکردایەتی داگیر کرد، شوێنێکی تری هەبێ بۆی بچێ و بارەگای لێ دابنێ.

شەوکەتی حاجی مشیر لەو کاتەدا ئەویش لە ئێران بو. شەوکەت خۆی زۆر لە مێژ بو بیری لە ئازاد کردنی هەلەبجە ئەکردەوە. فەرەیدون و د. فوئاد بەلایانەوە باش بو شەوکەت ببێتە سەرکردەی ئەم کارە. بۆ ئەم مەبەستە حامیدی حاجی غالی و قادر کۆکۆیی و قادر خەبات و هەندێ هێز و کادری تریان تەرخان کرد. لە گەل لایەنەکانی تریش قسەیان کرد بو. ناوچەکەیان بەمجۆرە دابەش کرد بو: هێزەکانی ی ن ک بەرپرسی گرتنی تۆپخانەکانی دەلەمەڕ و ناوشاری هەلەبجە بێ و، هێزەکانی (فەیلەقی بەدر) بەرپرسی گرتنی شاخی شنروێ و بالانبسۆ، هێزەکانی ح س ک بەرپرسی گرتنی پردی زەلم و، هێزەکانی پ د ک بەرپرسی ئازادکردنی خورمال بێ و، هێزەکانی بزوتنەوەی ئیسلامی بەرپرسی کاروباری لۆجستی بن.

شەوکەت، کە خۆی فەرماندەی کارەکە بو، لە کتێبەکەی دا: «کارەساتی کیمیابارانی هەلەبجە: بەهاری ١٩٨٨» لە باری سەرنجی خۆیەوە بە درێژی هەندێ لایەنی ئەم (عملیات) ەی گێڕاوەتەوە، لە بەر ئەوە من بە پێویستی نازانم بە درێژی باسی بکەم.

ئێوارەی ڕۆژی ١٤ ی مارت، هەمو هێزەکانی ئامادە کرا بون بۆ ڕزگارکردنی هەلەبجە، دەستیان کرد بە جولان. هەمان شەو هەلەبجە گیرا. هەمو هێزەکانی عیراق یا خۆیان بە دەستەوە دا یان هەلاتن. ڕاستییەکەی ئێمە چاوەڕێ نەبوین وا بە ئاسانی هێزەکانی عیراق هەرەس بهێنێ و هەلەبجە بگیرێ، بەلکو بە تەما بوین

ناوچەکە ببێتە شەرگایەکی فراوان و گەورەی نێوان هێزەکانی کورد و عیراق و، نێوان هێزەکانی ئێران و عیراق، بەوەیش عیراق ناچار نەبێ هێزەکانی هێرشی ئەنفالی ١ سوک بکات. بەڵام سەرکردایەتی عیراق بە فەرمانی صەددام هەڵەبجەیان فەرامۆش کرد و هیچ هێزێکیان بۆ گرتنەوەی نەنارد. لە باتی ناردنی هێز، وەکو لوا رکن وفیق السامرائی لە (ل١٠٤) ی کتێبەکەی دا: «حطام البوابه الشرقیه» دا نوسیویەتی رۆژی ١٦ ی مارت ٥٠ فرۆکەی هێرشی زەمینی کە هەر یەکەیان ٤ بۆمبای ٥٠٠ کیلۆگرامی کیمیاییان هەڵگرت بو، هەڵەبجەیان بۆمباران کرد. بەو پێیە ٢٠٠ تۆن گازی ژەهراوییان بە سەر هەڵەبجەدا باراند.

لە سەرەتادا هێزی ئیرانییەکان، جگە لە چەند ئەفسەرێکی پێوەندی، بەشداری گرتنی شاری هەڵەبجە نەبون. تەنانەت جادەی تەوێڵە - نەوسودیشیان داخست بو، نەیان ئەهێشت هاتوچۆی پێ دا بکرێ. دوای بۆمبارانی کیمیایی ئێمە خۆمان داوامان لە ئێران کرد کە رێگاکەی نەوسود بکەنەوە و، بگەنە فریای خەڵکی هەڵەبجە. ئەوسا ئێران هێزێکی گەورەی ناردە هەڵەبجە و، کەوتە گوێزانەوەی دانیشتوانی ناوچەکە. بە فەرمانی صەددام هەڵەبجە فەرامۆش کرا و، عەمەلیاتی ئەنفالی یەک بۆ گرتنی بارەگاکانی سەرکردایەتی توندوتیژتر درێژەی پێ درا تا بە ئامانج گەیشت و، لە هەمان کات دا هێزەکانی عیراقیان ساز دا بۆ ئەوەی لە جێگایەکی ترەوە جەزرەبەیەکی کوشندە لە ئێران بدا، ئەویش (فاو) بو، کە بو بە نوقتەی وەرچەرخان لە هەمو شەڕەکە دا و، بو بە سەرەتای کۆتایی جەنگی هەشت ساڵەی عیراق و ئێران.

*

لێرەدا ئەمەوێ چەند راستیەک دەربارەی کارەساتی هەڵەبجە بۆ مێژو تۆمار بکەم:

١. هێزە کوردیەکان: یەکێتی، پارتی، حسک، بزوتنەوەی ئیسلامی، هێزی سەرەکی رزگارکردنی هەڵەبجە بون، هێزی ئێران لە سەرەتای کارەکەدا شتێکی رەمزی و مەعنەوی بو تا دوای بۆمبارانی کیمیایی، بەڵام هەندێ لە ناوەندەکانی دەسەڵات لە ئێران دا کە لە ناو خۆیان دا لە ململانێ دا بون لە سەر درێژە پێدانی شەڕ و راگرتنی، پێویستیان بە پرۆپاگاندە هەبو، ئەوانە رزگارکردنی هەڵەبجەیان کرد بە هی خۆیان و، لە دەزگاکانی راگەیاندنی ئێران دا هەرا و هوریایەکی ئەوەندە گەورەیان خوڵقاند بەهانەی دا بە عیراق بێ پونگانەوە بۆمبارانی کیمیایی بکات.

هەروەکو چەندین جار روی داوە کە لە سەرکەوتن دا هەمو لایەک خۆی کردوە

بەرابەش و لە تێشکان دا خۆی دزیوەتەوە، ڕزگارکردنی هەڵەبجەیش چونکە بە کارەسات بڕایەوە، لایەنەکانی تر هەر یەکەیان بە جۆرێ خۆی ئەپەڕانەوە و، هەوڵی ئەدا ئۆباڵەکەی لە ئەستۆی یەکێتی توند بکا، بە تایبەتی کە بە هۆی ئەوەی هێزەکەی یەکێتی لە هی لایەنەکانی تر زۆرتر و، گرنگترین جێگەیش کە ناو شارەکە بو لە لایەن ئەوەوە گیرا بو.

٢. ئەگەر ئێران بە زویی فریای دانیشتوانی قەزای هەڵەبجە بە گشتی و دانیشتوانی شارەکە نەکەوتایە، ئەگەر دانیشتوانی ناوچەکە هەمویشیان ئەمردنایە لەوانە بو ژمارەی کوژراو و بریندار چەند قات لەوە زیاتر بوایە کە هەبو. ئێران سەدان ئۆتۆمۆبیل و هالیکۆپتەری بۆ گوێزانەوەی بریندار و ساخ تەرخان کرد و، بە زویەکی زو هەمو دانیشتوانی ناوچەکەی گوێزایەوە دیوی ئێران. بێگومان ئەمە کارێکی ئینسانی بو کە نابێ کورد لە بیری بچێتەوە.

٣. ئەگەر ئێران پەیامنێری دەزگاکانی ڕاگەیاندنی جیهانیٚ بانگ نەکردایە بۆ بینینی کارەساتی هەڵەبجە، ئەم کارەساتەیش وەکو کیمیابارانەکانی دۆڵی جافەتی، بەری مەرگە، خۆشناوەتی، قەرەداخ، بادینان و، وەکو کارەساتەکانی ئەنفال کە زۆر گەورەتر بون لە کارەساتی هەڵەبجە، بە بێدەنگی تیٚ ئەپەڕی و، لە دنیادا کەس پێ ی نەئەزانی و باسی نەئەکرا.

ئێران ئەوە یەکەم جار و دوا جار بو کاری وا بکا، ئەگەر ئەمەی بۆ ڕیسوا کردنی ڕژێمی عیراق، یان بۆ هەر مەبەستێکی تر کرد بێ، ئەنجامەکەی بە قازانجی کێشەی نەتەوەیی کورد شکایەوە و مەسەلەی کوردی لە ناو دەزگاکانی ڕاگەیاندنی جیهان و کۆڕە دەوڵەتییەکان دا بۆ پێشەوە برد و، دوراییەکی ناودەولەتی دایە.

٤. دوای ئەوەی هێزی ئێران ڕژایە ناوچەکەوە، کە بە تەواوی چۆڵ بوبو، دەستی بە سەر هەمو کەلوپەلی ناو ماڵ و دائیرە و کارگەکانی هەڵەبجەدا گرت و گوێزایەوە، تەنانەت دانەوێڵەی ناوچەکەیشی دروەوە، بە مەیش هەمو ئەو پارەیەی لە زەمانی شاوە تا ئەو کاتە لە یارمەتیدانی کوردی عیراق دا خەرجی کرد بو، دەرهێنایەوە.

*

هۆشی نەتەوەیی و بێهۆشی نەتەوەیی

ئازاد کردنی هەڵەبجە بو بە کارەساتێکی نەتەوەیی و، نەک هیچ گوشارێکی لە سەر شەرگای ئەنفالی ١ سوک نەکرد، بەڵکو خەم و پەژارەی زیاتر کردن و کاری سەلبی کردە سەر ورەیان و، لەوەیش خراپتر بو بە بیانو بە دەس تاقمێ لە کەسانی

داخ لە دڵەوە بۆ ئەوەی سەروەریەکانی شۆڕشی کوردی پێ بێ نرخ و، تاوانەکانی دوژمنەکانی پێ بشۆنەوە. هەندێ لەو بەناو "ڕۆشنبیرا" و "کوردپەروەرانە!" ئەڵێن:

- ئەگەر یەکێتی ئێرانی نەبردایەتە هەڵەبجە، صەددام بۆمبارانی کیمیایی نەئەکرد!

- ئەگەر یەکێتی هاوکاری لە گەڵ ئێران نەکردایە، صەددام گەرمیانی ئەنفال نەئەکرد!

- خۆ ئەگەر سەرانی یەکێتی دوای ئاشبەتاڵ دەستیان بە شۆڕش نەکردایەتەوە، ئەوا نە کەس نەکوژرا و، نە هیچ ئاواییەک تێک نەدرا و، نە هیچ کوردێ زەرەری پێ نەگەیشت!

- هەر بەم لۆجیکە، ئەگەر مستەفا بارزانی و سەرانی پارتی شۆڕشی ئەیلولیان دەس پێ نەکردایە، ئەوا کوردستان توشی ئەو هەمو کوژران و وێرانیە نەئەبو!

بێگومان ئەمە: لە باشترین حاڵەت دا نیشانەی بێهۆشیی نەتەوەیی و، بەڵگەی ناڕۆشنبیریی ئەوانەیە و، لە خراپترین حاڵەت دا نیشانەی نادڵسۆزییانە، چونکە مێژو وەها نانوسرێتەوە و ڕوداوەکانی وەها هەڵناسەنگێنرێ و ناگێڕدرێتەوە.

- ساڵی ١٩٤٨ ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان بڕیاری دابەشکردنی فەلەستین و پێکهێنانی دو دەوڵەت: ئیسرائیل و فەلەستینی دا، عەرەب ئەمەیان ڕەفز کرد. بە دوای ئەوەدا سێ شەڕی دۆڕاویان لە گەڵ ئیسرائیل کرد، سەرەنجام بە (حكم ذاتي محدود) ڕازی بون و، کاربەدەستانی ئیسرائیلی هەمو ڕۆژێ سوکایەتی بە فەلەستین و عەرەب ئەکەن. هیچ ڕۆژێ نیە دەیان وتار و لێدوان لە سەر مەسەلەی فەلەستین نەنوسرێ و بلاونەکرێتەوە، کەسێ جنێو بە سەرانی عەرەب یان بە یاسر عەرەفات نادا و تاوانباریان ناکەن بە خیانەت لە سەر ئەوەی ئەگەر ساڵی ٤٨ بڕیارەکەی نەتەوە یەکگرتوەکانیان قوبوڵ بکردایە، ئێستا فەلەستین و عەرەب خاوەنی دو دەوڵەت ئەبون و لە باروودۆخێکی تردا بون.

- جەبهەی تەحریری جەزائیر شۆڕشێکی خوێناویی لە دژی فەرەنسا دەس پێکرد، ملیۆنێک جەزائیری تێدا کوژرا و، دەوڵەتێکی بە (فەساد) داڕزاویان دامەزراند، سەرەنجام ئەوا لە ناو خوێناوی شەڕی ناوخۆ و، ناکۆکی دینی و ئەدینی دا ئەگەوزێ، تا ئێستا کەسێ نەهاتۆتە مەیدانەوە جنێو بە سەرانی جەبهەی تەحریر بدا و، تاوانباریان بکا بە خیانەت، بڵێ ئەگەر ئەوان شۆڕشیان نەکردایە و، جەزائیر هەر لە ژێر دەستی ئیمپریالیزمی فەرەنسی دا بمایەتەوە، ژیانمان بە شێنەیی

کەشەی نەکرد و نە ملیۆنێک شەهیدمان نەدا و، نە توشی شەڕی ناوخۆ نەبوین.
- ڤیەتنامیەکان لە شەڕی ئیمپریالیزمی فەرەنسی و دواتر ئیمپریالیزمی ئەمەریکی دا چەند ملیۆن کەسیان لێ کوژرا و، گەلەکەیان و وڵاتەکەیان کرایە مەیدانی تاقیکردنەوەی چەکی کۆمەڵ کوژ و، کاتێ لە شەڕ هاتنە دەرێ وڵاتێکی وێران و گەلێکی برسی و هەژار و دواکەوتویان هەبو، کە پێویستیی بە یارمەتی مرۆڤانەی دوژمنەکانی دوێنێ یان بو.
ڤیەتنامیەکان نەک جنێو بە سەرکردەکانی شۆڕشەکەیان نادەن و کەسێکیان تا ئێستا لێ پەیدا نەبوە بڵێ: ئەگەر ئەو شۆڕشە نەبوایە ئەو چەند ملیۆنەمان لێ نەئەکوژرا و، وڵاتەکەمان وێران نەئەبو، ئەگەر لە بن دەستی ئەمەریکادا بوینایە ژیانمان خۆشتر ئەبو.
ئەمەریکایی و فەرەنسیەکانیش، سەرەڕای ئەو هەمو تاوانەی لەشکرە داگیرکەرەکانیان کردویانە، (گرێ ی گوناهباری) یان تێ دا دروست نەبوە و، جنێو بە وڵاتەکانیان و سەرکردەکانیان نادەن لە بەر ئەوەی بردویانن بۆ شەڕێکی دۆڕاوی داگیرکەرانە.
- ژاپۆن بۆ مەبەستێکی داگیرکەرانە چوە ناو دوەمین جەنگی جیهانیەوە. لە ئەنجامی ئەوەدا دو شاریان بە بۆمبی ئەتۆمی کرا بە خۆڵەمێش و چەند ملیۆنیان لێ کوژرا و، وڵاتەکەیشیان بایی چەندین ملیار زەرەری لێ کەوت و، چەندین ملیاریش زەرەری جەنگیان بژارد. هیچ کەس لە ژاپۆنیەکان جنێوی بە هیرۆهیتۆی ئیمپراتۆری ژاپۆن نەدا، بڵێن بە خۆڕایی توشی شەڕێکی دۆڕاوی کردین و ئەم هەمو زیانەی لە گەل و نیشتمانەکەمان دا! بەڵکو لۆمەی ئەمەریکا ئەکەن بە چەکی ئەتۆمی هێرۆشیما و ناگازاکی سوتاند.
- بریتانیا لە دو جەنگی جیهانی دا بەشداری کرد و، ڕۆڵەکانی خۆی لە سەرانسەری دنیادا بە کوشت دا، هەمو کەسێکیش ئەزانێ ئامانجی بریتانیای گەورە لە بەشداری ئەم دو شەڕەدا (ڕزگاری گەلان) نەبوە، بەڵکو (داگیرکردنی وڵاتان) بوە، کەچی ئێستایش لە باتی ئەوەی جنێو بە شا و پێشەواکانیان بدەن، هەمو ساڵێ بە شانازیەوە یادی کوژراوەکانی خۆیان و مەیدانەکانی شەڕەکانیان ئەکەنەوە.
ڕۆڵەکانی ئەم گەلانە شانازی بە ڕابوردی خۆیان و بە مێژوەکەیان و بە سەرکردە و قارەمانەکانیانەوە ئەکەن، چونکە هۆشی نەتەوەییان هەیە و، ئەزانن شانازی و سەروەری نەتەوەیی چیە.
بێگومان هەبونی دەوڵەت لە دروستکردنی هۆشی نەتەوەیی و

زیندوکردنەوەی شانازیەکانی ڕابوردوی و پیشاندانی سەروەریەکانی دا دەورێکی سەرەکی هەیە، بەلام گەلێکی بێ دەولەتیش کە خەبات ئەکا بۆ دامەزراندنی دەولەتی تایبەتی خۆی، هیچ نەبێ نەبێ لای ڕۆشنبیرەکانی، کە خۆیان بە هەلبژاردەی گەلەکەیان و پێشەنگی فیکریی دائەنێن، ڕون و دیار بێ، ئەوەی جێگەی تێڕامانە هەندێ لەم کوردانەی، کە خۆیان بە کوردپەروەری ڕۆشنبیر دائەنێن، بەوەی ئەینوسن و بەوەی ئەیلێن، ڕابوردوی نەتەوەکەیان بە ناڕەوا ئەشێوێنن و، پاکانە بۆ تاوانی دوژمنەکانی ئەکەن.

*

کۆتایی ئەنفالی ١

زۆری ئەندامانی سەرکردایەتی و فەرماندەی قۆلەکان زو زو لە بارەگاکەی من لە بەرگەلو کۆ ئەبونەوە بۆ هەلسەنگاندنی هەلومەرجی ڕۆژانەی شەڕ و، دانانی ڕێوشوێنی بەرەنگاری. دوژمن گوێ ی نەئەدایە زەرەر و زیانی خۆی، هەر فەوج و لیوایەکی هەلئەوەشێنرا هی تازەی ئەهێنایە جێگای. ڕۆژ بە ڕۆژ لە هەمو قۆلەکانی هێرشەکەیەوە شوێنی تازەی ئەگرت و ئەهاتە پێشەوە. ئەو هێزانەی کە بەرگرییان لە ناوچەکە ئەکرد زیاتر لە ٦٠٠ پێشمەرگەی لێ کوژراو و بریندار بو بو، جگە لە سەدان کوژراو و برینداری خەلکی ناوچەکە. لەمێژ بو لە گەل تۆپبارانی ڕۆژانە ڕاهات بوین، هەروەها لە گەل بۆردومانی ڕۆژانەی فڕۆکەش ڕاهات بوین، خەریک بو لە گەل بۆمبارانی کیمیاییش ڕائەهاتین، بەلام لەم هێرشەدا سەرەڕای هەمو ئەوانە، خەریک بو پیادەی جەیشی عیراقی ئەگەیشتە ناو مال و بارەگاکانمان.

ئازادکردنی هەلەبجەش بە بۆمبارانی کیمیایی و، کوژرانی ٥ هەزار کەس و، بریندار بونی ٥ هەزار کەس و، چۆلکردنی هەمو ناوچەکەو، داگیرکردنی لە لایەن هێزەکانی ئێرانەوە تەواو بو. بڕیارمان دا بکشێینەوە. بەلام بڕیارمان دا جارێ باسی نەکەین و نەهێلین پێشمەرگە شوێنەکانی خۆیان چۆل بکەن هەتا هەمو دانیشتوانی ناوچەکە و، بریندارەکانی پێشمەرگە ئەگەنە ناو خاکی ئێران.

نوێنەرانی (ئەنجومەنی ئاوایی) هەمو گوندەکانی دۆلی جافەتی هاتنە لام، د. مەحمود عوسمان لەو ماوەیەدا دەرمانخوارد کرابو ئەویش لەوێ بو، لێیان پرسیم: «ئێمە چی ئەکەین و، ئەوان چی بکەن؟» پێم وتن: «دوژمنێکمان هەیە لە دنیادا نمونەی نیە بۆ دڕندایەتی و، دۆستێکمان هەیە لە دنیادا نمونەی نیە بۆ بێوەفایی، خۆتان ئازادن ئەچن تەسلیمی عیراق ئەبن، یان ئەڕۆن ئەبن بە پەنابەر لە ئێران، لە

هەردوو حاڵەت دا نازانم: عیراق وازتان لێ ئەهێنێ یا ئەتانکوژێ، ئێران حورمەتتان ئەگرێ یا سوکایەتییتان پێ ئەکا! خۆتان بڕیاری خۆتان بدەن، ئێمە جارێ هەر لێرەین.»

خۆم بە ڕاشکاوی دانی پێ دا ئەنێم کە بەشێکی زۆری ساڵانی ژیانی من ناناسایی بوە. ڕوداوی جۆراوجۆری زۆرم بینیوە. چەندین ڕۆژی خۆش و ناخۆشم گوزەراندوە، بەڵام درۆی تێ دا نیە ئەگەر بڵێم هیچ ڕۆژێکی ژیانم لەو ڕۆژە ناخۆشتر نەبو کە بڕیاری کشانەوەمان دا و، ماڵەکەم و بارەگاکەمم لە بەرگەڵو بە ناچاری بۆ دوژمن بە جێ هێشت.

صەددام بۆ سەرپەرشتی دوایین قۆناغی هێرشی ئەنفالی ١ هات بو بۆ کوردستان. تەلەفزیۆنی عیراق کۆبونەوەی صەددام و سەرکردەکانی جەیشی پیشان ئەدا. ٣ کەس لە لێهاتوترین جەنەراڵەکانی جەیشی عیراق سەرکردایەتی لەشکرکێشیی ئەنفالی یەکیان ئەکرد: سوڵتان هاشم، نزار خەزرەجی، کامیل ساچیت. بۆمان دەرکەوت بەرگری بێ هودەیە و شەڕەکەمان دۆڕاندوە لە بەر ئەوە بڕیاری کشانەوەمان دا. ڕۆژی ١٨ ی مارتی ٩٨٨ بە ڕێکوپێکی هەمومان: بریندارەکانمان، دانیشتوانی ناوچەکە، خێزانەکانی خۆمان، پێشمەرگەکان کشاینەوە، ناوچەکەمان چۆڵ کرد. پێشتر نیستگای ڕادیۆمان لە (دۆڵە کۆکێ) دامەزراند بو. لە پێش ڕاوەستانی ڕادیۆکەی (بەرگەڵو) دا ئەوی دۆڵەکۆکێمان خست بوە کار.

ڕاگەیاندنێکم دەربارەی چۆڵکردنی ناوچەکە نوسی و، ناردم بۆ ڕادیۆی (دەنگی گەلی کوردستان) و هەمو بێتەلەکانی ی ن ک. دوای بڵاوکردنەوی ئەو ڕاگەیاندنە دوژمن بە هالیکۆپتەر چەند جارێ لە بارەگاکانی ئۆڕین، کە دی چۆڵ کراون، ئینجا زاتی کرد بچێتە ناو بارەگاکانمانەوە. بە دوای ئەم ڕاگەیاندنەی ی ن ک دا، سەرکردایەتی گشتی هێزە چەکدارەکانی عیراق (القیاده العامه للقوات المسلحه) لە ڕۆژی ١٩ ی ئازاری ١٩٨٨ دا بە (بەیانی ژمارە ٣٠٨٧) لە هەمو دەزگاکانی ڕاگەیاندنی خۆیەوە، گیرانی بارەگاکانی سەرکردایەتی یەکێتی وەکو مژدەیەکی خۆش بە خەڵکی عیراق دا و، بەم بۆنەیەوە کردیان بە شایی و گۆرانی. لەگەل بڵاوکردنەوەی بەیانەکەدا، بروسکەی پیرۆزبایی سوڵتان هاشم سەرکردەی هێرشەکانی ئەنفالی ١ بۆ صەددام، لە دەزگاکانی ڕاگەیاندنی عیراقەوە خوێندرایەوە.

ئەنفالی ٢

هێرشەکانی عیراق ڕانەوەستا بەڵکو بۆ (قۆستنەوەی سەرکەوتن) کە بە سەر

هێزەکانی سەرکردایەتی ی ن ک دا بە دەسیان هێنا بو، یەک لە دوای یەک پەلاماری شوێنەکانی تریان دا، لە گەرمیان زۆر بە داخ بون. دوای ئاشبەتاڵ، خەڵکی گەرمیان دەورێکی گەورەیان هەبو لە دەسپێکردنەوەی شۆڕش دا، کەم جێگەی کوردستانی عیراق هەبو خوێنی پێشمەرگەی گەرمیانی تێ دا نەرژابێ. گەرمیان قەڵای ی ن ک بو. دوابەدوای داگیر کردنی دۆڵی جافەتی و، تێشکانی هێزەکانی سەرکردایەتی، کە بەشێکی لە گەرمیانەوە هێنرا بون، جەیشی عیراق بە هاوکاری مەفرەزەکانی ئەمن و (افواج الدفاع الوطني) کە لە جاشەکانی کورد دروست کرا بون لە رۆژانی ۲۲ ی مارت تا ۱ ی نیسانی ۹۸۸ پەلاماری قەرەداخی دا. (القيادە العامە للقوات المسلحە) لە رۆژی ۲ ی نیسانی ۱۹۸۸ دا بە (بەیانی ژمارە ۳۱۰۹) داگیرکردنی ناوچەی قەرەداخ، کە ناوەندی گەرمیان و بارەگای مەڵبەندی ۲ ی ی ن ک بو، راگەیاند.

ئەنفالی ۳ و ٤ و...

جەیشی عیراق و (افواج الدفاع الوطني) لە رۆژانی ۷ تا ۲۰ ی نیسانی ۹۸۸ هێرشیان بۆ سەر دەشتی گەرمیان و، لە ۳ تا ۸ ی مایس بۆ سەر دەشتی کەرکوک کرد و، هەمو ئەو ناوچانەیان بە شەڕ داگیر کرد و، هەر کەسێکیان بەر دەس کەوت لە گەورە و پچوک، ژن و پیاو، چەکدار و بێ چەک، گرت. درندایەتی و بەدڕەوشتیی جەیشی عیراق لەم هێرشانەدا گەیشتە ئەوپەڕی. زیاتر لە ۱۵۰ هەزار کەس بە زیندویەتی لە دانیشتوانی گەرمیان گیران و بێ سەر و شوێن ون کران، تاوانی (جینۆساید) لە سنورێکی فراوان دا بەرامبەر کورد کرا. هێرشەکانی ئەنفال بەردەوام بو بۆ سەر ناوچەکانی هەولێر، تا بە (عمليات خاتمە الانفال) لە رۆژی ۲٦ ی ئابی ۹۸۸ لە بادینان تەواو بو. لە ئەنجامی ئەو هێرشانەدا زیاتر لە ۱۰۰ هەزار کەس رویان کردە ئێران و دەیان هەزاریش پەنایان بۆ تورکیا برد.

ئەگەرچی رێکخراوی (میدڵ ئیست وۆچ) ی ئەمەریکایی لێکۆڵینەوەیەکی لە سەر ئەنفال کردوە، بەلام لێکۆڵینەوەکەی کورت و، کەموکورە. تاوانەکانی رژێمی بەعسی بەرامبەر بە کورد زۆر پچوک کردۆتەوە. هێرشەکانی ئەنفال ئەهێنێ چەندین لێکۆڵینەوەی زۆر لەوە قووڵتری جەنگیی، سیاسی، کۆمەلایەتی... لە سەر بکرێ و، چۆن جو (هۆڵەکۆست) یان لە بیر ناچێتەوە، کوردیش هەرگیز ئەم کارەساتە لە بیر نەکا.

هێرشە گەورەکانی جەیشی عیراق بە رابەری صەددام حسێن کاری لە هەمو دانیشتوانی کوردستانی عیراق و، هەمو حیزب و رێکخراوەکانی کرد، بەلام لە

هەمویان زیاتر ی ن ک ی نیشاند. تەنیا ڕێکخراوی سیاسی کوردی کە هەمو هێزەکانی و بارەگاکانی و ماڵی سەرکردەو کادر و پێشمەرگەکانی لە سەر ئەرزی کوردستانی عیراق بو ی ن ک بو. هێرشەکانی ئەنفال و بە دوای ئەوەدا گرتنی هەمو بارەگا گرنگەکانی ی ن ک و، ئینجا داگیرکردنی هەمو کوردستانی عیراق و، گیران و بزرکردنی دەیان هەزار کەس لە دانیشتوانی ناوچە ئازادەکان و وێران کردنی هەمو دیهاتی کوردستان، کارەساتێکی نەتەوەیی بە سەر کوردا هێنا. کوردستان بو بە زیندانێکی تەنگ و کورد بە گەلێکی دیل.

بارەگاکانی سەرکردایەتی ی ن ک لە ۱۹۷٦ - ۱۹۸۸ دا زۆر جار جێگۆڕکێ ی کرد بو، لە برادۆست، قەندیل، خڕی ناوزەنگ، دۆڵی پلنگان، سورداش، بناری ئاسۆس، دۆڵی جافەتی، بەڵام هەرگیز بە دەردی ئەمجارەیان نەچوبو. لە هەمو کوردستانی عیزاق دا نەک گوندێک، بەڵکو شاخێک، دۆڵێک، شیوێک یا ئەشکەوتێکی بە دەستەوە نەمابو بنکەیەکی تێ دا دا بنێ. بە سەدان کەس لە هێزەکانی کوژرا بون، بە سەدانی لێ بریندار و کەمئەندام بو بون و، بە سەدانی لێ گیرا بون، یا لە ژێر گوشاری دوژمن دا تەسلیم بو بونەوە.

ئەمە کۆتایی قۆناغێ بو: قۆناغی خەباتی چەکدار - سیاسی لە شاخەکانی کوردستانی عیراق، بەڵام کۆتاییەکی زۆر تراجیدی.

*

*

هەمـویان زیاتر ی ن ک ی نیـشـاند. تەنـیـا ڕێکخـراوی سـیـاسی کـوردی کـە هەمـو هێزەکـانی و بارەگاکانی و مـالّی سەرکردەو کادر و پێشـمەرگەکانی لە سەر ئەرزی کوردستانی عیراق بو ی ن ک بو. هێرشەکانی ئەنفال و بە دوای ئەوەدا گرتنی هەمو بارەگا گرنگەکانی ی ن ک و، ئینجا داگیرکردنی هەمو کوردستانی عیراق و، گیران و بزرکردنی دەیان هەزار کەس لە دانیشـتوانی ناوچە ئازادەکـان و وێران کردنی هەمـو دیهـاتی کـوردسـتـان، کـارەسـاتێکی نەتەوەیی بە سـەر کـوردا هێنا. کـوردسـتـان بو بە زیندانێکی تەنگ و کورد بە گەلێکی دیل.

بارەگاکانی سەرکردایەتی ی ن ک لە ۱۹۷٦ - ۱۹۸۸ دا زۆر جار جێگۆڕکێ ی کرد بو، لە برادۆست، قەندیل، خری ناوزەنگ، دۆلی پلنگان، سورداش، بناری ئاسـوس، دۆلی جـافـەتی، بەلاّم هەرگـیـز بە دەردی ئەمـجـارەیان نەچوبو. لە هەمـو کـوردسـتـانی عـیـراق دا نەک گـوندێک، بەڵکو شـاخـێک، دۆڵێک، شـیـوێک یا ئەشکەوتێکی بە دەسـتـەوە نەمـابو بنکەیەکی تێ دا بنێ. بە سەدان کـەس لە هێزەکانی کوژرا بون، بە سەدانی لێ بریندار و کەمئەندام بو بون و، بە سەدانی لێ گیرا بون، یا لە ژێر گوشاری دوژمن دا تەسلیم بو بونەوە.

ئەمە کۆتایی قۆناغێ بو: قۆناغی خەباتی چەکدار - سیاسی لە شاخەکانی کوردستانی عیراق، بەڵام کۆتاییەکی زۆر تراجیدی.

*

*

## OFFICIALS EMPLOYED IN ARBIL, KIRKUK & SULAIMANI LIWAS AND IN THE KURDISH AREAS OF THE MOSUL LIWA.

(1) Showing Kurds and others by Departments.

| GOVERNMENT DEPARTMENTS. | GAZETTED OFFICIALS. | | NON GAZETTED OFFICIALS. | | TOTAL NO. OF OFFICIALS. | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | Kurds. | Others. | Kurds. | Others. | Kurds. | x Others. |
| 1. Administration (General). | 43 | 25 | 61 | 49 | 104 | 74 (24) |
| 2. Agriculture. | - | 3 | 4 | 18 | 4 | 21 (17) |
| 3. Awcaf. | 4 | 2 | 3 | 2 | 7 | 4 (1) |
| 4. Census. | - | 1 | 2 | 3 | 2 | 4 (2) |
| 5. Customs. | 2 | 7 | 5 | 20 | 7 | 27 (11) |
| 6. Education. | 1 | 2 | 79 | 101 | 80 | 103 (31) |
| 7. Finance. | 1 | 2 | 52 | 39 | 53 | 41 (9) |
| 8. Health. | - | 8 | 6 | 15 | 6 | 23 (9) |
| 9. Jails. | - | 1 | - | 1 | - | 2 (1) |
| 10. Law Courts. | 9 | 7 | 16 | 9 | 25 | 16 (6) |
| 11. Police. | 3 | 9 | 11 | 36 | 14 | 45 (27) |
| 12. Posts and Tels: | 1 | - | 7 | 11 | 8 | 11 (6) |
| 13. Public Works. | - | 1 | 4 | 17 | 4 | 18 (9) |
| 14. Surveys. | - | - | - | - | - | - - |
| 15. Tapu. | - | 5 | 7 | 7 | 7 | 12 (8) |
| 16. Veterinary. | - | 1 | 3 | 5 | 3 | 6 (4) |
| Totals. | 64 | 74 | 260 | 333 | 324 | 407 (165) |
| | 138 | | 593 | | 731 | (165) |

REMARKS.

x Arabs are shown in brackets after the total figure.

From these final lists it will be seen that out of a total number of 731 officials employed in the northern liwas (in the case of Mosul, statistics have only been given for the Kurdish areas), there are 324 Kurds and 407 officials who are not Kurds. Even allowing for the Kirkuk promise there are still 165 Arabs employed in the North. If again the statistics for the Kirkuk Liwa are excluded, it will be found that out of a total number of 502 officials employed in the other Kurdish areas, there are 279 Kurds, 107 Arabs, 62 Turcomans and 54 Christians, Jews, etc.

From the Departmental statistics it will also be seen that the following Departments have paid least regard to the literal fulfilment of the pledge.

Agriculture.





[illegible] FOR KURDISH AREAS ACCORDING TO LATEST FIGURES (FEBRUARY 193[illegible])

| LIWA. | KURDS. | ARABS. | TURCOMANS. | JEWS. | CHRISTIANS. | PERSIANS. | ASSYRIANS. | TOTAL. |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ARBIL LIWA. | 83,430 | 4,492 | 9,921 | 3,225 | 2,689 | 287 | 2,090 | 106,134 |
| KIRKUK LIWA. | 67,763 | 26,561 | 28,741 | 8,472 | 1,228 | - | - | 136,705 |

MOSUL LIWA.
(Kurdish Qadhas).

| Name of Qadha. | Arabs. | Kurds. | Yezidi. | Assyrians. | Xtians of all creeds. | Jews. | Total. | Remarks. |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ZAKHO | 198 | 18,731 | 500 | 340 | 5,614 | 1,471 | 26,854 | - |
| AMADIYA | - | 20,914 | - | 3,416 | 5,882 | 732 | 27,944 | - |
| ZIBAR | - | 9,900 | - | 800 | 150 | 100 | 10,950 | - |
| AQRA | - | 12,675 | - | 400 | 737 | 1,000 | 14,812 | - |
| DOHUK | 5,645 | 16,645 | 1,692 | 4,536 | 2,388 | 843 | 31,753 | - |
| | 5,847 | 78,865 | 2,192 | 9,492 | 11,771 | 4,146 | 112,313 | |

| | KURDS. | ARABS. | TURCOMANS. | JEWS. | CHRISTIANS. | PERSIANS. | ASSYRIANS. | TOTAL. |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| SULAIMANI LIWA. | 91,426 | 37 | - | 1,327 | 148 | - | - | 92,938 |

Percentage of Kurds.

Arbil Liwa ............ 78.6

Kirkuk Liwa ............ 49.5

Mosul Liwa.
(Kurdish Qadhas) ...... 70.





TABLE 5-3 (Continued)

| Name of Family | Class, stratum, or occupation other than landownership | Tribe[b] | Sect and ethnic origin | Area owned in dūnums | Province |
|---|---|---|---|---|---|
| Shamdīn Agha | Semitribal leaders; deputies; one state minister | Sulaivānī | Sunnī Kurd | 53,040 | Mosul |
| Sabunjī | Merchants; deputies | – | Sunnī Arab | 52,945 | Mosul |
| Ahmad Pasha | Tribal leaders; deputies | Diza'ī | Sunnī Kurd | 52,350 | Arbīl |
| ash-Shahad | Tribal shaikhs; one deputy | Budair | Shī'ī Arab | 49,560 | Dīwāniyyah |
| Nāsir Mirza | Shaikhs of Yazīdīs | – | Yazīdī Kurd | 47,358 | Mosul |
| ash-Sha'lān as-Salmān | Tribal shaikhs; deputies | Khazā'il | Shī'ī Arab | 46,959 | Dīwāniyyah |
| Ghulām Rida Khān | Sādah; family of ex-governor of Persian Pusht-i-Kuh | belong to Rabī'ah | Shī'ī Arab | 43,741 | 'Amārah |
| Daniel (Sassoon) | Originally tax farmers; deputies | – | Jewish | 43,490 | Hillah and Dīwāniyyah |
| az-Zraijī | Tribal shaikhs | Rabī'ah | Shī'ī Arab | 42,806 | Kūt and Mu… |
| Ahmad-i Khānaqah | Sādah and shaikhs of Naqshbandī mystic order; one deputy | – | Sunnī Kurd | 42,351 | Kirkūk |
| Kashmūlah | Sheep traders; officials; effective rulers of Mosul's Manqūshah quarter; one deputy | – | Sunnī Arab | 42,178 | Mosul |
| Mīran ibn Qāder | Tribal leaders; deputies | Mīr Mahmalī, a section of Khoshnao | Sunnī Kurd | 41,584 | Arbīl |
| Āl 'Abd-ul-'Abbās | Tribal shaikhs; one deputy | Banū Zuraij | Shī'ī Arab | 40,555 | Dīwāniyyah |
| Āl Lhaims | Tribal shaikhs; one deputy | Albū Sultān | Shī'ī Arab | 40,439 | Hillah |
| Hadīd | Merchants; one state minister; deputies | – | Sunnī Arab | 39,966 | Mosul |
| Aghawāt | Sheep and wheat traders; effective rulers of Mosul's Bāb al-Baid quarter; one deputy | - | Sunnī Arab | 39,500 | Mosul |
| Āl-Hasan | Tribal shaikhs; one deputy | Banū Zuraij | Shī'ī Arab | 38,245 | Dīwāniyyah |
| [illegible] | Tribal shaikhs | – | Shī'ī Arab | 37,[illegible] | Dīwāniyyah |
| [illegible] | [illegible] deputies | Āl Albū Sultān | Shī'ī Arab | 35,[illegible] | Hillah |
| [illegible] | Tribal shaikhs | | Shī'ī Arab | 33,352 | Hillah |
| Total | | | | 5,457,354[f] | |

[a]Excludes the big landed families of the Muntafiq province—mainly Āl-Khairallahs and as-Sa'dūns—who owned between t… more than 300,000 dūnums. One dūnum = 0.618 acre.

[b]For the geographic location of the tribes, see Map 3.

[c]Claimants of descent from the Prophet.

[d]Much of their land was of the rain-fed variety, which is not as rich as the artificially irrigated land of, say, al-Amīrs in … south.

[e]The head of the family was the father-in-law of Crown Prince Abd-ul-Ilāh.

[f]Mayyāh is a section of the Rabī'ah tribe, as is as-Sarrāī.

[g]Al-Farhāns are cousins of al-Yāwars.

[h]As-Sa'dūns had been in the 19th and earlier centuries the leaders of the Muntafiq Confederation.

[i]Does not include their very large possessions in the Muntafiq province.

[j]The head of the family was the father-in-law of ex-Premier Sālih Jabr.

[k]Men learned in religion.

[f]Equals 16.8% of total privately held agricultural land.

*Source:* Figures obtained from the records of the Ministry of Agrarian Reform, February 1964.

TABLE 5-3

*Iraq's Principal Landed Families in 1958, or Families Owning More Than 30,000 Dūnums*[a]

| *Name of Family* | *Class, stratum, or occupation other than landownership* | *Tribe*[b] | *Sect and ethnic origin* | *Area owned in dūnums* | *Province* |
|---|---|---|---|---|---|
| Jāf Begzādeh | Tribal chiefs and *sādah*;[c] deputies | Jāf | Sunnī Kurd | 539,333[d] | Sulaimāniyyah, Diyālah, and Kirkūk |
| al-Amīr[e] | Tribal shaikhs; one state minister and one senator; related by marriage to Crown Prince 'Abd-ul-Ilah | Rabī'ah | Shī'ī Arab | 442,066 | Kūt |
| al-Yāwer | Tribal shaikhs; one deputy | Shammar | Sunnī Arab | 346,747 | Mosul |
| al-Yāsīn | Tribal shaikhs; one deputy | Mayyāḥ[f] | Shī'ī Arab | 344,168 | Kūt |
| al-Farhān[g] | Tribal shaikhs; one deputy | Shammar | Sunnī Arab | 310,314 | Mosul, Baghdād, and Dulaim |
| al-Qaṣṣāb | Tribal shaikhs | as-Sarrāī[f] | Shī'ī Arab | 261,924 | Kūt |
| as-Sa'dūn | Ex-tribal shaikhs[h] and *sādah*, one prime minister; deputies and senators; related by marriage to ex-Premier Tawfīq as-Suwaidī | – | Sunnī Arab | 219,765[i] | Kūt, Baṣrah, Hillah; and Mosul |
| as-Sayyid Rustum<br>as-Sayyid Muḥammad Kakai | *Sādah* of the Kakai religious sect | – | Kakai Kurd | 191,039 | Kirkūk |
| al-Jaryānī | Tribal shaikhs; deputies; related by marriage to ex-Premier Ṣāliḥ Jabr | Albū Sulṭān, a section of Zubaid | Shī'ī Arab | 183,722 | Hillah and Kūt |
| Royal family | *Sādah* | – | Sunnī Arab | 177,000 | Baghdād and Kūt |
| aṭ-Ṭālabānī | Shaikhs of Qādirī mystic order; deputies | Related to Zanganah | Sunnī Kurd | 137,163 | Kirkūk and Diyālah |
| Suhail an-Najm | Tribal shaikhs; one deputy | Banū Tamīm | Shī'ī Arab | 125,50? | Baghdād and Diyālah |
| Abū Ṭabīkh | Tribal shaikhs; one deputy and one senator | – | Shī'ī Arab | [illegible] | Dīwāniyyah |
| Āl-Mgūṭar | Tribal *sādah*; deputies | – | Shī'ī Arab | 117,839 | Dīwāniyyah |
| ach-Chalabī | Merchants; state ministers; deputies | – | Shī'ī Arab | 108,810 | Baghdād and Diyālah |
| al-Khuḍairī | Merchants; owners of river steamers; deputies; high state officials | – | Sunnī Arab | 100,159 | Kūt, Baghdād, and Diyālah |
| Āl-Jamīl | *Sādah* and *'ulamā'*;[k] one state minister; one senator; deputies | – | Sunnī Arab | 92,166 | Diyālah and Baghdād |
| Khuḍair | Tribal shaikhs | Juhaish | Sunnī Arab | 84,592 | Mosul and Baghdād |
| Bābān | Ex-rulers of Sulaimaniyyah; one premier; state ministers; deputies | – | Sunnī Arabized Kurd | 81,353 | Kirkūk, Diyālah, and Hillah |
| al-Ḥafīd al-Barzinjī | *Sādah* and shaikhs of Qādirī mystic order; one state minister | – | Sunnī Kurk | 71,716 | Sulaimāniyyah |
| as-Sagab | Tribal shaikhs; one deputy | as-Sa'īd, offshoot of Albū Sulṭān | Shī'ī Arab | 70,296 | Dīwāniyyah |
| ash-Shallāl | Tribal shaikhs; one deputy | Shammar | Sunnī Arab | 62,363 | Mosul and Baghdād |
| ad-Dāmirchī | Merchants; one deputy | – | Shī'ī Arab | 61,068 | Diyālah |
| aj-Jāder | Merchants; one deputy | – | Sunnī Arabized Kurd | 59,340 | Mosul and Baghdād |
| al-Mirjān | Slave-issuing contractors, wheat mill proprietors, and real estate owners; one premier and one senator | – | Shī'ī Arab | 58,764 | Hillah and Dīwāniyyah |
| Atiyyah, al-Ghadbān | Tribal shaikhs; deputies | al-Ḥmaidāt | Shī'ī Arab | 56,447 | Dīwāniyyah |
| al-Khaizarān | Tribal shaikhs; one deputy | 'Azzah | Sunnī Arab | 55,727 | Diyālah |
| ad-Dahwī | Merchants; one deputy | – | Shī'ī Arab | 54,839 | Diyālah, Baghdād and Kūt |
| Pāchachī | Originally merchants; state ministers; two premiers; deputies | – | Sunnī Arab | 54,588 | Baghdād |

بسم الله الرحمن الرحيم



الجمهورية العراقية
رئاسة الجمهورية
السكرتير



(( سري للغاية وشخصي وعلى الفور ))

العدد / ٢/١/٢/ ١٤٧٧ ك
التاريخ / ١٩٨٣/١٢/٢٠

الرفيق سعدي مهدي
أمين سر مكتب تنظيم الشمال المحترم

م: الاتحاد الوطني الكردستاني

أمر السيد الرئيس القائد مايلي :

تركيز التواصل مع الاكراد والموالين والمتعاونين وزيادة الدعم والمساعدات المادية والمعنوية لهم في هذه المرحلة لغرض حمايتهم ، وأزالة التصور والشعور لديهم من أن عملية الحوار مع جلال ستؤثر على وضعهم سلبا " وحتى لاتتكرر عقدة الماضي وما حلّ بهم بعد بيان ١١ آذار ١٩٧٠ .

يرجى التفضل بالاطلاع والايعاز شفويا " الى محافظي دهوك ، أربيل ، السليمانية .. وكذلك الجهات الاخرى ذات العلاقة ..

مع التقدير .

سكرتير رئيس الجمهورية

نسخة منه الى /
رئاسة المخابرات
مديرية الامن العامة
مديرية الاستخبارات العسكرية العامة

لاتخاذ مايلزم
مع التقدير .

اطلعت / تم اجراء اللازم
٩٨٣/١٢/٢١

وزارة الخارجية
مكتب الوزير



MINISTRY FOR FOREIGN AFFAIRS

MINISTER'S OFFICE

عزيزي الأستاذ جلال الطالباني المحترم

بعد التحية ..

اطلعت على رسالتكم التي نقلها الي الأخ فريدون وانني أحيي فيكم الروح الأيجابيـــة التي تضمنتها والرغبة المخلصة في حل المشاكل من طريق الحـــــــوار وبالأســلوب الأيجابي .

وبهذه المناسبة أود أن أوكد لكم ولرفاقكم بأن كثيرا مما نقل من رفاقنــا المسوولين كان بعيدا عن الصحة والدقـــة .. فرفاقنا المسوولون في الحزب والدولة لا يمكن أن يتصرفوا بعكس توجيهات السيد الرئيس والنهج الذي أكدته القيـــادة .. واننا نتابع هذه المسألة من أجل تغليـب الجانب الأيجابي والموضوعي في كل المسائل على الجانب السلبي وغير الموضوعـي وأن المزيد من التعاون الأيجابي لابد وان يوصل الى هذه النتيجة .

وأرجو أن تتأكدوا وأن يتأكـد كل رفاقكم بأننا ماضون قدما في النهج الذي تميزت به محادثاتنا في بغداد .

MINISTRY FOR FOREIGN AFFAIRS

MINISTER'S OFFICE



وزارة الخارجية
مكتب الوزير



كما أننا نأمل من جانبكم أيضا المزيـــد من التوجيهات والأجراءات للحد من بعض الأخطاء والتجاوزات التي حدثت من جانـــب بعض عناصركم خلال الفترة الماضيـــة .. وأننا مرتاحون لأجواء العمل المثمرة التي تسيطر على نشاط لجنة التنسيق المركزيـة واللجان الفرعية .

لقد تطلب الأمر بعض الوقـت لدراسة طلباتكم ولقد أمكن البت في البعض منهـــا وفقا للأمكانيات المتيسرة وخاصة ماجاء منها منسجما مع النقاط التي أتفقنا عليهـا في بغداد .. أما الطلبات الأخرى فأنها ماتزال قيد الدراسة .. والبعض منها وخاصة الأمور التسليحية ومستقبل النشاط في المنطقة لابد من دراسته بصورة مشتركة وعلـــى مستوى قيادي .

وانني آمل أن نتمكن من اللقاء بكم في بغداد مرة أخرى لمواصلة المحادثـــات وأنجاز مالم يتم أنجازه حتى الآن .. ولقد أخبرت الأخ فريدون بالتوقيتات المناسبة .

تحياتي لكم ولجميع رفاقكم مع أطيب التمنيات .

طارق عزيز
١٩٨٤/١/٢٧

الحكم الذاتي لكردستان العراق

* مبادئ عامة *

أولا : مضمون الحكم الذاتي :

١ ـ اقرار حق الشعب الكردي في العراق في حكم منطقة كردستان العراق ضمن اطار الجمهورية العراقية من خلال مجلس تشريعي ينبثق عنه مجلس تنفيذي .

٢ ـ تختص الحكومة المركزية بشؤون رئاسة الدولة والدفاع ، والخارجية والمالية العامة ، والتخطيط المركزي ، والكمارك والمكوس ، والنفط والصناعات الثقيلة ، والتجارة الخارجية ، والبنوك ، والعدل ، والبريد والبرق والهاتف ، وأما ما عداها فتدخل ضمن اختصاصات الحكم الذاتي لكردستان العراق .

٣ ـ تطبيق مضمون بيان ١١ آذار ١٩٧٠ كأساس لتحقيق ما ورد فيه من حقوق الشعب الكردي القومية .

٤ ـ المجلس التشريعي :

آ ـ ينتخب أعضاؤه عن طريق انتخاب ديمقراطي حرّ تماما دون وصاية أو تدخل من أية جهة كانت .

ب ـ له حق اصدار التشريعات في حدود اختصاصات الحكم الذاتي الواردة في المادة الثانية على ان لا تتعارض هذه التشريعات مع الدستور وعند التعارض بينها وبين القوانين المركزية ومطالبة الجهة المعنية بدعوى بطلانها يحتكم الى مجلس الدولة أو محكمة التمييز .

٥ ـ المجلس التنفيذي :

آ ـ يتكون المجلس التنفيذي من رئيس للمجلس ويتم اختياره من بين أعضاء المجلس التشريعي بتكليف من السيد رئيس الجمهورية ومن نائبه وعدد من الاعضاء لادارة الامانات الوارد ذكرها في الفقرة التالية وفق القواعد الدستورية والديمقراطية .

ب ـ الامانات التي تشكل مجموعها المجلس التنفيذي هي :

١ ـ الزراعة والاصلاح الزراعي .
٢ ـ الصحة .
٣ ـ التربية والتعليم العالي .
٤ ـ الثقافة والاعلام .
٥ ـ الداخلية .
٦ ـ الاوقاف .
٧ ـ الشباب .

٨ ـ البلديه و القرويه ٠
٩ ـ التجاره الداخليه ٠
١٠ ـ العمل و الشؤون الاجتماعيه ٠
١١ ـ النقل و المواصلات ٠
١٢ ـ الاشغال ٠
١٣ ـ الصناعات المحليه و الخفيفه ٠
١٤ ـ التموين ٠
١٥ ـ التنميه و الاعمار ٠
١٦ ـ السياحه و المصايف ٠
١٧ ـ الاسكان و التعمير ٠
١٨ ـ الماليه ٠
١٩ ـ الري ٠

ج ـ للمجلس التنفيذي صلاحيات مجلس الوزراء في الحكومه المركزيه بالنسبه لمنطقه الحكم الذاتي ٠

د ـ يكون رئيس المجلس التنفيذي لمنطقه الحكم الذاتي نائبا لرئيس مجلس الوزراء في الحكومه المركزيه كما ان الاعضاء يكونون كوزراء و لهم الحق في حضور الاجتماعات مجلس الوزراء ٠

هـ ـ يتولى السيد رئيس الجمهوريه الاشراف على التنسيق بين الحكم الذاتي و الحكومه المركزيه ٠

ثانيا : منطقه الحكم الذاتي :

تشمل منطقه الحكم الذاتي المحافظات التاليه :

آ ـ أربيل ٠
ب ـ السليمانيه ٠
ج ـ دهوك ٠

وتتبعها الاقضيه التاليه : عقره ، و شيخان ، و سنجار

د ـ استحداث محافظه جديده أو أكثر تتبعها الاقضيه التاليه بجميع نواحيها و توابعها :

١ ـ كفري ٠
٢ ـ طوز ٠
٣ ـ داقوق ٠
٤ ـ كلار ٠
٥ ـ مندلي ٠
٦ ـ خانقين ٠

٧ ـ آلتون كوبرى .

٨ ـ قادر كرم .

٩ ـ قرهنجير .

١٠ ـ ليلان .

ثالثا : اللغة :

آ ـ تدرس اللغة العربية كلغة أساسية واجهة التعليم في جميع مدارس منطقة كردستان و تكون لغة التخاطب و المراسلة بين مؤسسات الحكم الذاتي و مؤسسات الدولة المركزية .

ب ـ تكون اللغة الكردية اللغة الرسمية في منطقة كردستان و تستعمل في الدوائر الرسمية و شبه الرسمية و المدارس و المعاهد و الجامعات مع حماية حقوق الاقليات في الدراسة بلغتها الأم بجانب اللغتين العربية و الكردية .

رابعا : الميزانية :

لمنطقة الحكم الذاتي ميزانية خاصة لسد احتياجات المنطقة في الشؤون المناطة بمؤسسات الحكم الذاتي و يتم وضعها من قبل المجلس التنفيذي و اقرارها من المجلس التشريعي و التصديق عليها من قبل السيد رئيس الجمهورية كما ورد في المادة الثامنة من أصل القانون .

خامسا : حقوق الاقليات :

يتمتع أبناء القومية العربية و الاقليات القومية في منطقة الحكم الذاتي بجميع حقوقها الثقافية و الادارية و لها حق التمثيل في المجلس التشريعي و المشاركة في باقي مؤسسات الحكم الذاتي .

قانون الحكم الذاتي لمنطقة كردستان المعدل

الباب الاول : اسس الحكم الذاتي و مضمونه

الفصل الاول : الاسس العامة

المادة الاولى :

آ ـ مضمون الحكم الذاتي :

هو اقرار حق الشعب الكردي في العراق في حكم منطقة ضمن اطار الجمهوريه العراقيه من خلال السلطه التشريعيه و التنفيذيه .

ب ـ تتمتع منطقة كردستان العراق بالحكم الذاتي و تسمى بالمنطقة حيثما وردت في هذا القانون .

ج ـ تشمل المنطقة المحافظات و الاقضيه و النواحي التاليه :

١ ـ المحافظات : اربيل . السليمانيه . دهوك

٢ ـ الاقضيه و النواحي : عقره . سنجار . ميخان . زمار . كفري . شوزر . ناوزن . خانقين . مندلي . آلتون كوبري . قادركرم . ترمنبير . ليلان .

د ـ تعتبر المنطقه وحده اداريه واحده لها شخصيه معنويه تتمتع بالحكم الذاتي في اطار الوحده القانونيه و السياسيه و الاقتصاديه للجمهوريه العراقيه و تجري التقسيمات الاداريه فيها وفقا لقانون المحافظات مع مراعات احكام قانون الحكم الذاتي لمنطقة كردستان المعدل .

هـ ـ المنطقه جزء لا يتجزء من أرض العراق ، و شعبها جزء لا يتجزء من شعب العراق و تكون مدينه اربيل مركزا للحكم الذاتي .

و ـ هيئات الحكم الذاتي جزء من هيئات الجمهوريه العراقيه .

المادة الثانيه : اللغه

آ ـ تكون اللغه الكرديه لغه رسميه في المنطقه ، و تستعمل في الدوائر الرسميه و شبه الرسميه ، و المؤسسات و المدارس و المعاهد و في جميع مراحل التعليم و مراقفه مع حمايه حقوق الاقليات في الدراسه بلغتها الام بجانب اللغتين العربيه و الكرديه .

ب ـ تدرس اللغه العربيه كلغه أساسيه الزاميه في جميع مراحل التعليم في المنطقه ، و تكون لغه التخاطب و المراسله بين مؤسسات الحكم الذاتي و مؤسسات الدوله المركزيه .

ج ـ لابناء المنطقه كافه حق اختيار المدارس التي يرغبون التعلم فيها بصرف النظر عن لغتهم الام

د ـ يخضع التعليم في جميع مراحله في المنطقه للسياسه العامه للدوله مع مراعات الخصوصيه القوميه للمنطقه .

المادة الثالثة :

آ ـ حقوق و حريات أبناء القومية العربية و الاقليات المتآخية في المنطقة مصونة وفق أحكام الدستور ، و تلتزم ادارة الحكم الذاتي بضمان ممارستها .

ب ـ يمثل أبناء القومية العربية و الاقليات المتآخية في المنطقة في جميع هيئات الحكم الذاتي بنسبة عددهم الى سكان المنطقة ، و يشاركون في تولي الوظائف العامة على هذا الاساس مع مراعاة المؤهلات المطلوبة قانونا .

المادة الرابعة : القضاء

القضاء مستقل لا سلطان عليه لغير القانون ، و تشكيلاته في المنطقة جزء لا يتجزء من التنظيم القضائي في الجمهورية العراقية .

الفصل الثاني : الاسس المالية

المادة الخامسة :

المنطقة وحدة مالية مستقلة ضمن وحدة مالية الدولة .

المادة السادسة :

للمنطقة ميزانية خاصة لسد حاجاتها في الشؤون المناطة بمؤسسات الحكم الذاتي ، و يتم وضعها من قبل المجلس التنفيذي ، و اقرارها من المجلس التشريعي و التصديق عليها من قبل السيد رئيس الجمهورية العراقية .

المادة السابعة :

تتكون ميزانية المنطقة من الاجزاء التالية :

١ ـ الميزانية الاعتيادية .

٢ ـ الميزانية الاستثمارية السنوية .

٣ ـ ميزانيات المؤسسات و المعامل و المصالح الانتاجية ذات الطابع المحلي المتواجدة في المنطقة .

٤ ـ ميزانيات الادارة المحلية و البلديات و المصايف في المنطقة .

المادة الثامنة :

تتألف موارد ميزانية المنطقة من العناصر التالية :

آ ـ الموارد الذاتية و تتكون من :

١ ـ أيرادات الضرائب و الرسوم التي تستوفى من المنطقة بما فيها ايرادات الرسوم المقررة للبلديات .

٢ ـ أثمان المبيعات و أجور الخدمات .

٣ ـ الحصة المقررة من ارباح المصالح و المؤسسات الممولة بميزانية المنطقة .

٤ ـ ضريبه العقار .
٥ ـ ضريبه الارض الزراعيه بما فيها حصه الاصلاح الزراعي من الحاصل .
٦ ـ ضريبه المرصات الاساسيه و الاضافيه ضمن المنطقه .
٧ ـ ضريبه التركات .
٨ ـ رسوم دوائر التسجيل العقاري .
٩ ـ رسوم تسجيل السيارات و نقل ملكيتها .
١٠ ـ القروض و المنح التي تمنحها السلطه المركزيه للمنطقه .
١١ ـ الطوابع الماليه .

ب ـ تخصيص نسبه لا تقل عن ٢٥٪ من الميزانيه الاستثماريه للدوله و الملحقه ج الاستثمار السنوي من خطه التنميه القوميه لتغطية نفقات ميزانيه المنطقه بما يضمن نموها و تطورها المتوازن ضمن اطار الجمهوريه العراقيه .

المادة التاسعه :

تخضع حسابات المنطقه لحسابات رقابه ديوان الرقابه الماليه .

الباب الثاني : هيئات الحكم الذاتي و اختصاصاتها .

تختص مؤسسات الحكم الذاتي بجميع الصلاحيات ضمن المنطقه عدا شؤون الرئاسه و الدفاع و الخارجيه و الماليه العامه و التخطيط المركزي و الكمارك و المكوس و النفط و الصناعات الثقيله و التجاره الخارجيه و البنوك و العدل و الهاتف و البريد و البرق التي تدخل ضمن اختصاصات الحكومه المركزيه .

الفصل الاول : المجلس التشريعي

المادة العاشره :

المجلس التشريعي هو الهيئه التشريعيه المنتخبه من قبل المواطنين في المنطقه انتخابا ديمقراطيا حرا و مباشرا دون تدخل من أيه جهه كانت . و يحدد تكوينه و تنظيمه و سير العمل فيه ، و شروط الناخبين لعضويته بقانون .

المادة الحاديه عشر :

آ ـ ينتخب المجلس التشريعي ، رئيسا و نائبا للرئيس و أمينا للسر من بين أعضائه .

ب ـ تنعقد جلسات المجلس بحضور أغلبيه عدد أعضائه و تتخذ قرارا ته بأغلبيه عدد الحاضرين ، الا اذا نص على خلاف ذلك في قانون المجلس التشريعي .

